

**ناوەندی ڕۆشنبیری**

**مەم و زین**

---

- ناوی کتێب: کرێمستی
- نووسەر: کەریم کاکە
- نەخشەسازی ناوەوە: ناوەندی مەم و زین
- نەخشەسازی بەرگ: پەپوولە یوسفی
- بابەت: ڕۆمان
- نۆبەتی چاپ: دووەم - ٢٠٢٣
- تیراژ: ٥٠٠ دانە
- نرخ: ٦٠٠٠ دینار

---

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (١٩١)ی ساڵی (٢٠١٣)ی پێدراوە.


memuzin٢٠@gmail.com

دیاری

---

کریمستی دیارییە بۆ بابم، ئەو پیاوەی بە رستێک رستەی لە تەمەن رستراو، لە گێڕانەوەی کریمستی بەشدارە.

---

کافکاف

چاپی یەکەم: ٢٠١٣

# ١

کرێمستی لە نێوان پەنجەکان، پەنجەی وردیلەی خڕپن دەتوێتەوە. مژێک لەو مژێک لەم، کرێمستی دەتوێتەوە و لالێویان دەنەخشێنێ. بە یەکتر دەڵێن:

ئەها وێنەیەکی جوان بە لێوتەوە!

لە بن داربییەکە، داری کرێمستی لە کەلێنی پەنجەکانەوە چۆڕاوگەیەکی سووری بە سەر گەردندا بەستووە. بە یەکتر دەڵێن:

نابینی، گەردنیشت بووەتە وێنە!

چۆڕاوگەیەک دنیا هەزار سەرمەقولاتی دا، ئەو هەر بە لالێو و سەر گەردنەوەیە. گەڕەک گۆڕانی دنیای بە سەردا هات، بەلام چۆلەکەکانی داربی هەر ئەو چۆلەکانەن کە بە سەر دوو مندالی کرێمستی لە دەست دەیانجریواند. کێ هەیە دەنگی چۆلەکەی مندالی نەناسێتەوە!

کوڕ مژێک لە کرێمستی دەدا و دەپرسێ:

ئەو چۆلەکانە چیان لێمان دەوێ؟

کچ کرێمستی لە سەر لێوە:

حەزیان لە کریمستییە.

خانوویکی قوڕ ڕوو لە ڕۆژهەڵات، ڕوو لە زوورگ و چیا. داربییەکی بەژن زراڤ لە وەرزی کەسکایی، دانی سبەینان سێبەرێکی چڕ و فێنک بە کۆڵان و سەر حەوشەی ماڵی کوڕدا بڵاودەکاتەوە. لەو دەمەی ڕۆژ هێشتا بە قەد بەژنی داربی لە زوورگەکان بەرز نەبۆتەوە، سێبەرەکەی دەگاتە سەر دەرگای ماڵی کچ، بەڵام کچ بەو سێبەرەی ماڵی خۆیان ڕانەدەگەیشت، تا لە خەو هەڵدەستا، سێبەر نەدەما. دانی ئێوارانیش ماڵەکەی ئەوبەر، ماڵی شەلەی شامینۆکفرۆش خەنی دەبێ لە سێبەری داربی. کوڕ دەڵێتە کچ:

حەزمدەکرد ماڵی ئێوە بەرانبەرمان با.

کچ دەڵێ:

منیش حەزمنەدەکرد، ماڵمان لە پشتەوە با.

خانوو کەوتۆتە سەر کەندێک، زستانان، بەهاران، بە بارینی زۆر، کەند هەڵدەستێ. جاری وایە ئاو دەرگای ماڵی کوڕ دەگرێ و دەگاتە بن داربییەکە و سەکۆ خەریکە بن ئاو دەکەوێ. جار هەیە ئاو بەو دیودا دەسووڕێتەوە. چ خانوو بە سەر خانووی ماڵی کوڕەوە نیە. لەو دەمانەدا لە دوورەوە خانوو لە شێوەی دوورگەیەک خۆی پیشانی چاوی گەڕەک دەدات.

دایکی کوڕ لەگەڵ هەستانی کەند، مشەمایەکی شینی لە خۆی هەڵکێشاوە، نایلۆنێکی سپی کردۆتە کڵاو، پێڵاوێکی لاستیقی ڕەشی لە پێیە. هەتا سەر چۆک خۆی هەڵکردووە، خاکەناسی بە دەستەوە و بە دەوری خانووەوە، پتر قوڕ و خۆڵ دەخاتە بن دیوارەوە و ئاو دوورتر دەخاتەوە. دوو سێ ژن و پیاویش دێن بە هانایەوە.

گـولێ کە ماڵیـــان لەو ســـەری گەڕەکە، بە خـــۆ و خاکەناســە قـوتەوە گەیشـت، تـاکە کەس و تـاکە منداڵە بە خاکەناســـــەوە بە هانـــــاوە بێـــت. خــــانزاد کـــچە تازەپێگەیشـــتووەکەش گەیشـــت. کـــوڕ بە دیتنـــی خـــانزاد دڵخـۆش دەبـێ، دەزانـێ بە هـاتنی خـانزاد پیـاوی گەڕەک هەموو پەیدادەبن و دەگەنە هانای دایکی.

پیـری گەڕیـدەش لەو لاوە، لە بـن سـاقۆیەکی ڕەشـی درێـژ، لە بەر بـاران، خـۆی بەسـەر گۆچـانەکەی داداوە و پەکوو پەکوویەتی، قایشی رادیۆکە بە ملیەوە دیارە. پیری گەڕیدە لە ساتی لافاو پێڵاو لەبیربکات، رادیۆ و دەنگگرە گچکەکە کە لە بەرکی جێگەی دەبێتەوە لەبیرناکات. چەند کاســـێتێکیش لە نـــایلۆن دەپێچـــێ و دەیخـــاتە گیرفـــانی سـاقۆکەیەوە. پیری گەڕیدە جار جارە پێنیە شـەلەکەی لە عەرد دەکاتەوە، قوڕی زۆر گرتووە، بـاش بۆی بڵند نـابێ. لە بـــن قـــۆڵی ساقۆکەشـــیەوە لە دوو پەنـــجە لە جـــوولە کەوتووەکەیەوە ئاو چۆڕاوگەی بەستووە. پیری گەڕیدە لە بن چاویلکەوە بە تاکە چاوێ لە خانووی ناو لافاو ڕامـاوە.

ژنەکەی شەلە چەند هەوڵی لەگەڵ دەدا بیباتە ماڵی خۆیان، خۆماندووکردنێکی بەلاشە، ناچێ، بووکەکەی لە ناو ئاوێ بەجێناهێڵێ.

دایک ناوە ناوە سەر هەڵدەبڕێ و چاو لە ئاسمان دەبڕێ، کوڕەش لەگەڵ وی سەربەرزدەکاتەوە، تێدەگات دایکی لە ئاسمان دەخوازێ، خۆشی بکاتەوە، هەورەکە دووربخاتەوە و بنی روون بکاتەوە. کوڕ کە دایکی لەو بارە دەبینێ، رکی لەو هەورە دەبێتەوە کە بارانی زۆر پێیە. ئەو هەورانەی خۆشدەوێ کە بایی ئەوە بارانیان پێیە، ئاو نەگاتە بن داربییەکە، شەوان هەرکاتێ گوێی لە گرمەی هەور دەبێ، دەپاڕێتەوە:

خودایە، کەم ببارێنە، با کەند هەڵنەستێ، دایکم ماندوومەکە.

یان دەڵێ:

خودایە کەندەکە هەندێک لە ماڵی ئێمە دووربخەوە.

کەرەتی واش هەیە دەڵێ:

خودایە، ماڵی ئێمەش وەک ماڵان وەک ماڵی شەلە بڵند بکە، تا ئاو نەیگاتێ.

هەرچەندە لافاوی گەورە بە بەرەکەتە، چەم بەرد و وردە چەوی رەنگاورەنگ دێنێ، دوای نیشتنەوە کچە و

کوڕە بە چەم وەردەبەن و چ بەردی جوانە خڕدەکەنەوە، ماڵییان پڕکردووە لە بەرد، دایکی زۆر جار پێیاندەڵێ:

ئێوە ماڵ بە بەرد دەکەن.

بەوەی باشە دیوی پشتەوە تەنکاوە، ئەها کچ بە دیوی تەنکاودا، پێی خۆی هەڵکردووە، غاردەدا. پێڵاوەکەی لە قوڕ بەجێدەمێنێ، دەخوازێ بەجێیبهێڵێ، پەژیواندەبێتەوە، دەگەڕێتەوە، تا خاوێنی دەکاتەوە و لە پێی دەکات و دەگات، کەند لە سەر نیشتنەوەیە.

دەنیشێتەوە، یەکە یەکە وا پێی خۆیان دادەدەنەوە. لەو دەمە کوڕ چاوی دەکەوێتە سەر پێیە هەڵکراوەکان، دەبینێ هی دایکی زۆر سپییە لە هەمووان سپیتر، مەگەر هی کچ هێند سپی بێ. کوڕە لە پێیە هەڵکراوەکانەوە، وێنە رووتەکانی ناو گەرماوی هاتنەوە بەر چاو. ئەو دەمەی دایکی سەری دەشووشت، لە بن کەفەوە چاوی دەگێڕا، ژوورێک لەشولاری رووتی دەدیت، لەشی ژن و منداڵ، لە چاوی وی لەشی کچە لە هی هەموویان سپیتر بوو، لە هی خانزادیش.

پەرتەیان لێکرد، کچ نەڕۆیشت. چاوەزێدەکەن بن بییەکە کزربێتەوە، تا گەمەی خۆیان دەستپێبکەنەوە، تا لافاو بنیشێتەوە و بەردی رەنگاوڕەنگ خڕبکەنەوە.

لە نــاو کەنـدێ ڕیـزە بەردێکـی گەورە، بە دوورایـی شـــەقاوی منـــداڵ دانـــراون و بەو بەردانە دەگـــوترێ بەردەبازی کۆڵانی داربییەکە. خەمیان نیە، ئاویش هەستێ، ڕێـی قوتابخـانە نـاگیرێ، بە سـەر ئەو بەردانە دەپەڕنەوە. لەو دەورو بەرە، بۆ ناسینەوەی کۆڵانێک، ماڵێک، کەسێک، شـتێک، داربیـیەکە نیشـانەیە، بە داربـی دەیبینـنەوە، دەیناسنەوە. منداڵ بزربووە لەو دوورەوە، دەروێش برایم لە مزگەفتەوە بانگەوازی کردووە:

بیهێننەوە مزگەفت، یان بیبەنەوە کن داربییەکە.

داربییەکەی پێش ماڵی کوڕ یان پێش ماڵی پیری گەڕیدە لە چ داربیـان نـاچێ، کەسـک کەسـک، کەسـکییەک کەس لە چاوی کەس نەیدیتیە، مەگەر پیری گەڕیدە لە چاوی ستی دیتبێتی قەد بڵند و ڕێک، چ ژن بەژن و بـاڵای وای نەبووە، مەگەر دایکی کوڕ. پەلک پان ودرێژ زۆر درێژ، دەتگوت پەرچەمی کچەیە بە سەر چاویەوە. داربی هەمیشە باڵندەی بە سەرەوەیە، لە چ وەرزێک بێ جریوە و گمەگم نەبووە. داربی بە شێوەیەک دەخوێنێ، پیری گەڕیدە گۆتەنی:

چ درەختێک وای نەخوێندووە.

زۆر کەس داربییان بەو داربیـیەی هەمیشـە دەخـوێنێ ناودەبرد، خوێندنی سەر لە سبەینان، لە هـی نیوەڕۆیـان و ئێواران نەدەچوو، خوێندنی شـەوان هەر زۆر تـایبەت بـوو، دایک دەیگوت:

ئەوانەی ماڵیان لێرە دوورە و گۆرانیی داربی نابیستن، چۆن خەویان لێدەکەوێت؟

وێنەی بن داربی کە دوو منداڵی کرێمستی لە دەستە، دواتریش وێنەکە لە زۆر جێ بڵاوکرایەوە، لە پێش دەرگای سینەما، لە کتێبی قوتابخانە، لە گۆڤاری منداڵان، لە فیلمە کارتۆنییەکان. لە هەر جێیەکیش بە ناونیشانێکی جیا، بەڵام ناونیشانی بنجی و راستینەی وێنەکە (کرێمستی لە کەلێنی پەنجەکانەوە)یە.

ئەو وێنەیە کۆنترین وێنەی منداڵییە، نەبوونی و هەژاری ئەو وێنەیەی کێشا، ئەگەر پارەکە دوو کرێمستی پێهاتبا، پەنجە وردیلەکان تێکەڵ نەدەبوون، لێوەکان تامی جێی یەکتریان نەدەکرد، کچ دەڵێ:

جێی لێوی تۆ زۆر شیرینە.

کوڕ دەڵێ:

هی تۆش.

ئەودەمانێ هیچیان تامی لێویان نەکردبوو، شتێکیان لە لێو و تامی لێو نەدەزانی، بەڵام لەو کرێمستیەوە زانیان جێی لێو، ئەو شتەی لێوی پێدەکەوێت، چ تامێک دەدا. دوو منداڵی وردیلە، هێشتا نەچوونەتە قوتابخانە، لە وەرزی کرێمستی لە سەر سەکۆی سێبەری داربی بۆ یەکەم جار کرێمستییەکیان بە یەکەوە خوارد، دواتریش چەند جار

ئەوە دووبـارەبۆوە، بەڵام تەنهـا یەکەمیـان بـووە ویـنە و بڵاوبۆوە.

ئەو دوو منـداڵە کریێمَسـتی لە دەسـتە، لە دڵڕاگرتنـی یەکتـر یەک لە یەک گەورەتـرن. کچ دڵـی خـۆی دەشـکێنێ، بەڵام هی کوڕ نـا. کـوڕیش لە دڵراگرتن لە کچ کچترە. ئەو دوو منـداڵە هێنـد هـۆگری یەکتـرن، سـاوا هێنـدە هـۆگری مەمکـی دایـک نـیە. ماڵیـان هێنـدە لێکتـر دوور نـیە. لە وەرزەکانی سێبەری داربی هەمیشە لە سەر سەکۆیەکەن و گەمەی ساپسـاپانێ و پێنجووکـانێ دەکەن، مێرووانـێ دەکەن، ئەو کچە نەبا پێنەدەچوو کورە فێرە گەمەی کچانە بـا. لە بـن داربـی کەلایـانێ و زۆرانـێ دەکەن، کـچە تەنهـا لەگەڵ ئەو کـورە گەمەی کـوڕانە دەکـات. لە بـن داربـی لە کـۆڵانێ هەردوو کـۆڵان، هەرچـی گەمەی منـداڵان هەیە لە منـداڵانی داربییـەوە تەماشـایان بـکە. هـاوڕێیەتی ئەو دوو منـداڵە لەگەڕەکـێ دەنگیـدابۆوە، کـاتێ دوو منـداڵ بە شـەڕ دێن، داکیان دەڵێ:

دافەتێن، دە وەک گوڵنار و هاوار بن، چاو لەوان بکەن.

کەس نەیدیتووە، نەیبستووە ئەو دوو منداڵە داربییە لە یەکتر تۆرابن، ئا لە کۆڵانێ بەو کوڕ و کچەیان دەگوت:

منداڵەکانی داربی.

هەبوو دەیگوت:

ئەو دوو منداڵە دەڵێی لە داربی لە دایکبوون.

کەرەتێ تەنها کەرەتێ کچی داربی لە کوڕی داربی دڵی رەنجا، لێ هێ لە خۆیان کەس بەو دڵرەنجانەی نەزانی، رەنگبێ دایکی کوڕەش شتێکی لێ زانیبێ. کچی داربی لە رستەیەکی کوڕی داربی زویر بوو، گەمەی بەجێهێشت، کوڕی داربی سەد جار پتر چووە بەر دەرگایان، کچی داربی یەک هەفتە نەهاتەوە بن داربی، کاتێ هاتەوەش پێیگوت:

جارێکیدی ئەو قسەیە نەکەیتەوە.

کوڕی داربی دەڵێتە دایکی:

+ دایە، بۆچی گوڵنار بە قسەیەک توورە دەبێ کە (کەر)ی تێدا بێ؟

- تۆ چیت گوت؟

+ تۆپانێمان دەکرد، گوڵنار تۆپێکی هاویشت بە سەری پیاوێک کەوت، پیاوە تۆپەکەی گرت و بە قەڵەمبڕ تەقاندی، منیش گوتم:

ئەگەر لە کەر کەرتر نەبێ، تۆپ دەدڕێنێ!

- ئۆی ئەو رۆژەی گوڵنار هاتە دنیا کە تۆ تەمەنت ساڵێک پتر، کەمتر دەبوو، بابی لە سەر قسەیەکی ئەوها کوژرا، دیارە دایکی بۆی گێڕاوەتەوە؟

+ ئۆی! چانەبوو من نەکوژرام.

- راوەستە، تۆ ناکوژریێ، ئەو رۆژەی گوڵنار هاتە دنیا، ساڵ ساڵی کەرگیرآن بوو، پۆلیس کەریان دەگرت و لە زیندانێیان دەکرد. بابی گوڵنار دەچێت بە دوای ماماں، رێی بە جادەی زیندانی کەران دەکەوێ و لە بەر خۆیەوە دەڵێ:

ئەوەی لە کەر کەرتر نەبێ، چۆن کەر زیندانی...

قسەکەی تەواو ناکات، گوللەیەک بە سینگییەوە دەنێن، ئیدی گوڵنار بێ باب لە دایک دەبێ.

+ کەریان لۆ دەگرت؟

- فیشەک و شەکریان بۆ بابت دەگواستەوە.

+ لۆ کێندەرێ؟

- لۆ ئەو چیایانە.

+ بابم ئێستاش لەوێیە؟

دایکی پەنجەی خۆی دەگەزێ، قسە دەباتە لایەکیدی.

کوڕی داربی دادەمێنێ، چاو دادەخات و دەیکاتەوە. کوڕی داربی دەبینێ، لەو کەندەوە کە لە رۆژهەڵاتەوە زستانان رووبارێکی دەڕژاندە شارەوە، کەندی تەنیشت ماڵی خۆیان نا، کەندە دوورەکە، دەبینێ شەش حەفت کەر لە تاریکایی ئێوارەدا کەند و کەند هەڵدەکشێن، سەرەو

زوورگەکان، سەرەو چیا هەڵدەکشێن، هەستدەکات باری هەندێکیان قورسە، دەبێ فیشەک بێ، باری هەندێکیان سووکتر، دیارە شەکر و چاو ئارد و ئەو شتانەیە، لە خودا دەپارێتەوە، کەرەکان ماندوو نەبن، کەرەکان پەژیواننەبنەوە، کەرەکان نەگیرێن و بگەنە لای بابی. لەهیکەوە هاواردەکات، دەبینێ رەوە کەرێک لە ناو تەلبەندن، دایکی دەگاتە سەری:

چ بوو! کوڕم بۆ هاوارت کرد؟ هانێ ئاو بخۆوە.

جامە ئاوەکە لە دایکی وەردەگرێ:

دایە، کەرەکان زیندانی کران.

لەو رۆژەوە کوڕی داربی کەری خۆشویست و رقیشی لێبۆوە، سوێندیشیخوارد لە کن کچی داربی وشەی (کەر)ی بە زاردا نەیێ.

منداڵانی داربی ناوە ناوە بە داربییەکە بەژنی خۆیان دەپێوا، کچی داربی لە تەنیشت بییەکە، رێک لە بییەکە رێکتر رادەوەستا، کوڕی داربیش بە پارچە گەچێ بەرزییەکەی نیشاندەکرد. ئەوجا نۆرەی کوڕەیە راوەستێ، فێڵیشیان لە یەکتر نەدەکرد، نە پێڵاویان لە پێ بوو، نە پاژنەیان بڵند دەکرد. قەدی بیەکەشیان لە ئاستی تەوقی سەر نیشاندەکرد، بە موو بڵند و نەوی تێدا نەبوو. ئەو هاوینەی وێنەی (کرێمستی لە کەلێنی پەنجەکانەوە) گیرا،

بە پێوانەی داربی، کوڕی داربی سێ پەنجە لە کچی داربی درێژتـــر بـــوو، بەڵام ئەو هـــاوینەی خۆیـــان بـــۆ چـــوونە قوتابخانە ئامادەدەکرد، داربییەکە جیاوازیی نیوانیانی تەنها پەنـــجەیەک پیشـــاندا، کـــوڕ کەمێـــک نـــیگەران بـــوو بەو هەڵـنەدانەی خـۆی، بەڵام لە دڵـی نەگـرت و لە دڵـی خـۆی گوتی:

قەینـاکە، خـۆ هەڵـنەدانم بەرانـبەر خەڵـکی نـیە، بەرانـبەر کچی داربییە.

منـــداڵانی داربـــی پـــێکەوە دەچـــنە قوتابخـــانە، کـــوڕ بە چوونە قوتابخانە دڵی زۆر خۆشە، دەبوو دوو ساڵ پێشـتر چووبـا. ئاوزەکـانی ئەو ئێسـتا خوێندەوارن، گەیشـتوونەتە پۆلی سێیەم، کوڕ لە بیریەتی، دایکی دەیگوت:

کوڕم، تەسکەرەت نیە، وەرتناگرن.

ئەو سـاڵیش نەدەچـووە قوتابخـانە، ئەگەر پیـری گەڕیـدە بە کـوڕی خـۆی ناونووسـی نەکردبـا. کـوڕ لە بیریەتـی کـچ ساڵێک و شتێک درەنگتر چووە قوتابخانە، بەڵام دواکەوتنی وی پەیوەندی بە تەسکەرەوە نەبوو، لە بیـری نیـە هـۆیەکە چی بوو، هەر لە خۆوە دەڵێ:

لەگینە لە سـەر من راوەستابێت!

جانتـا لە شـان، شـان بە شـانی یەک دەچـن و دێـنەوە، قوتابخانەیان دیوار بە دیوارەوە نا، بەڵام لە ریزێکە و لێک

نزیــک. هەنــدێ کەڕەت گوێیــان لە زەنگــی یەکتــر دەبــێ، قوتابخانەکان لەو سەر جادەیەن کە دەچێتەوە مزگەفتەکەی دەرویــش، دەروێــش، کچــی داربــی زۆر خۆشــدەوێ، هەر جــارێ تووشــی دەبــێ، تونــد لە باوەشــی دەگــرێ، مــاچی دەکات و چوکلێتی دەداتێ، کچە چوکلێتەکە کەرت دەکات و بۆ کوڕەی رادەگرێ:

ئەو کەرتە بۆ تۆ.

کوڕە دەستی بۆ نابات و دەڵێ:

ناخۆم.

کچە لە دڵەوە دەڵێ:

نەیخۆیت، منیش نایخۆم.

دەروێش برادەری بابی کچە بوو، بە دەستی خۆشــی تەرمەکەی شووشــتووە، جارێــک، کچــی داربــی دەڵێــتە دەروێش:

مام دەروێش، هاواریش ماچ بکە، برادەرمە.

لەو رۆژەوە دەروێش هەردووکیــان دەگرێتەوە بــاوەش و دوو پەنــجە تووکنەکــانیش دوو چوکلێــت لە گیرفــانی دەردەهێــنن، کەڕەتــێ ســەربازێکیش دوو چــوکلێتی بــۆ راگرتن، بەڵام وەریاننەگرت، دایکی کوڕ گوتبووی:

لە سەربازەکان و لە گوڵێنگدارەکان نزیکنەبنەوە و شتیان لێ وەرنەگرن.

منداڵانی داربی لە قسەی دایک دەرنەدەچوون، تا بۆیان کرابا، دوور لە سەربازەکان دەڕۆیشتن و دەهاتنەوە ساکە گۆڕەکەی ئەو بەری کەندێ کە تا نزیک قوتابخانە و نزیک ماڵی گوڵێنگداران درێژدەبۆوە، هەمووی سەرباز بوو، چادریان هەڵدابوو. لە منداڵانی گەڕەک تەنها گوڵێ لە سەربازەکان نەدەگەڕایەوە و بە قسەی کەسی نەدەکرد، چۆنی ویستبا، وای دەکرد، چی ویستبا، دەیبرد، کوێی ویستبا، دەچوو. ڕۆژانە دەچووە ناو سەربازەکان و کەرتکە سەموون و خواردنی دەهێناوە بۆ بزن و قازەکانیان، گوڵێ زۆر جار بە منداڵانی داربیی دەگوت:

وەرن بچینە ناو سەربازان، مەترسن، چمان لێناکەن، ئەگەر قسەش بکەن، من چەقۆم پێیە.

بە کوڕی داربی دەگوت:

تۆ دارلاستیقت هەیە، لە چی دەترسیت؟

گوڵێ هەمیشە چەقۆیەکی لە بەرکی کراسە درێژەکەی بوو، تاقە کچی گەڕەکیش بوو کە کراسەکەی گیرفانی هەبوو. ئەگەر دایکی کراسێکی بێ بەرکی بۆ کڕیبا، لە بەری نەدەکرد، تا گیرفانێکی بۆ تێنەگرتبا.

سـەربازەکان سـبەینان بە (حـای و حـوو) گەڕەک و شاریان بەئاگادەهێنا، منداڵانی داربی شین و واوەیلا و لە خۆدانی ئەو سەربازانەیان دیوە، دەترسان، زۆر دەترسان، کوڕ جارێک گوێی لە پیری گەڕیدە بوو دەیگوت:

بۆ حوسێن دەگرین و حوسێنەکانی ئێمەش ڕاودەنێن و دەکوژن.

کوڕی داربی لە (حوسێنەکانی ئێمە) تێنەگەیشت، دەبێ یەک لە حوسێنەکان بابی وی نەبێ! شەرمیکرد لێی بپرسێ.

سەربازەکان بە زنجیر لە خۆیان دەدا و هاتوهاواریان دەگەیشتە ناو سەرشۆرکی ماڵی کوڕی داربی و گڕەی پەلەمێزی دەبڕی، کوڕ دەیگۆتە کچ:

گریانی سەربازەکان لە دەنگی پەلەمێز گەورەترە، لە ناو سەرشۆرک گوێم لە شین و ڕۆڕۆیان بوو.

کچی داربی دەڵێ:

ئەوانە کێیان مردووە، وا بەو شێوە شین دەگێڕن؟

کوڕی داربی دەڵێ:

حوسێن مردووە.

کچی داربی دەڵێ:

حوسێن! ئەها ئەو حوسێنە نەبێ، ئەوەی:

حەسەن و حوسێن کوژرانە

لە کەندەکی فڕێدرانە...

کوڕی داربی:

وا بزانم.

منداڵانی داربی هەر لە سەرباز نا لە منداڵی گوڵینگدارانیش دەترسان، ئەوانەی پیاو و کوڕەکانیان کڵاوی گوڵینگداریان لەسەر بوو، گوڵینگ بە سەر گوێیاندا شۆڕبووبۆوە، منداڵانی گوڵینگدار ناوە ناوە بە بەردەقانی پەلاماری گەڕەکی داربییان دەدا. کەڕەتێک بەردێک کە دوای چەند جار بە عەرد کەوتن و هەڵبەز و دابەز بە سەری کوڕی داربی کەوت و خوێن هات، هەر ئەو بەردە بە گۆزینگی یوسفیش کەوت و زیڕەی گەیاندە ئاسمان. یوسف ماڵیان لە خواریَ لەکۆڵانی مۆسکۆ بوو، لەگەڵ کوڕی داربی هاوپۆل بوون، کچی داربی بە دەستە نەرمەکانی خۆی دەستەسڕەکەی خۆی لە سەر برینەکەی کوڕی داربی دانا و دەیگوت:

خەمت نەبێ، تۆڵەی تۆ لەو سەگبابە دەکەمەوە، دەیناسمەوە، بەردەقانی ڕەشەکە بوو، زرتە زەلامە چڵمنە پیسەکە، ناوی حەسۆیە.

گوڵێ بە سەرداهات، گوتی:

بڵێ کێ سەری شکاندوویت؟ ئەگەر میری گوڵینگدارانیش بێت، چەقۆیەکی لێدەم.

گوڵێ ئازا بوو، هەرچی ویستبای لە دەستی دەهات، تاقە چەقۆکێشی گەڕەک بوو، لە هەندێ جێ گەڕەک بە گوڵێ دەناسرایەوە، دەیانگوت گەڕەکی کچە چەقۆکێشەکە، تاقە گەڕەک بوو لە شار کە چەقۆکێشی کوڕی تێدا نەبێت، گوڵێ و بەس.

بە گوڵێیان نەگوت و سەر شکانەکەیان شاردەوە و نەیانهێشت ماڵێ بزانێ.

منداڵانی داربی تا فێرە خوێندەواریش بوون، ڕۆژی جارێک زۆرانێیان دەکرد، سەرەتا بە زۆری بای کوڕی داربی بوو، دواتر بای کچی داربی، کەم منداڵ هەبوو لە زۆرانێ لێکدی توورە نەبن، منداڵی بنکەوتوو، ڕقێکی لە دڵ هەر هەڵدەگرت، بەڵام منداڵانی داربی لەوەدا منداڵ نەبوون. بەر لەوەی واز لە زۆرانێ بێنن، شلوکوت دەبوون، بەڵام کەس پشتی بە عەرد نەدەکەوت، بۆوەی گەمە کۆتایی بێ، هەرجارەی یەکیان دەیگوت:

دەی بردتەوە، من وا کەوتمە بنەوە.

بە قسەی شەلە وازیان لە زۆرانێ هێنا، بەڵام حەزی زۆرانێ هەر ما، زۆر کەڕەت بە نیازی زۆرانێ باوەشیان

دەکــــــردەوە، ســــــارددەبوونەوە، قســــــەی شــــــەلەی شامینۆکفرۆشیان بیردەکەوتەوە:

نەکەن، نابێ کچ و کوڕ زۆرانێ بکەن.

چ تێنەگەیشتن بۆچی نابێ کوڕ و کچ زۆرانێ بکەن، لەگەڵ ئەوەش وازیانهێنا.

سبەینانێک لە ڕێی قوتابخانە، شامینۆکفرۆش بە تەوسەوە دەڵێتە منداڵانی داربی:

ئێوە چەند لە یەک دێن! یەکتان دەڵێی شامینۆک و یەکتان لۆبیا.

سەرەتا لە شامینۆک و لۆبیا تێنەگەیشتن، کچی داربی نازانم، بەڵام کوڕی داربی ئەورۆژە چ ئاگای لە وانە نەبوو، هەر بیری لەو قسەیە دەکردەوە. لە پڕ کوڕ هەستیکرد پرسیاری لێکراوە، بەڵام تێنەگەیشت چ پرسیارێکە و لە لایەن کێوە. بێدەنگ بوو، پرسیارەکە دووبارە بۆوە، هێشتا بە شوێنی خۆی نەکەوتەوە، نەیزانی لە کوێیە و پرسیار چیە. دەبوو شتێک بڵێ، کەوتە بارێکەوە ئەگەر شتێک نەڵێ، تووشی کێشەیەک دەبێ. بۆ دەرچوون لەو کێشەیە تەنها وەڵامە. کوڕ چەندی سەری هێناو برد جگە لە دوو وشە، وشەیەکیدی نەدیتەوە. کوڕ وشەی پینەما، لە دنیا وشە نەما، هەیە و نیە تەنها ئەو دوو وشەیەیە کە لە سەر زاریەتی و لە سەر فڕینن. هەستیکرد قوتابییەکەی تەنیشتی

دەیەوێ یارمەتی بدات، بەڵام پێرانەگەیشت، ئیدی چار نیە وشەکانی فڕاند:

شامینۆک و لۆبیا.

پۆلێک پێکەنین و زللەیەک کوڕی داربی هێنایەوە ناو پۆل. زللەکە توند بوو، بن گوێی قاوەیی هەڵگەڕاند، بەڵام سەیربوو، هاوار هاواری لێهەڵنەستا، نەشگریا، سەری خۆی داخست. بە خەیاڵ سەری خستە ناو مەنجەڵی شامینۆک و لۆبیاوە تا زەنگ لێدرا کەسی نەدیت. کوڕی داربی لەگەڵ زەنگ، لە ناو مەنجەڵی خەیاڵیی شامینۆک و لۆبیاوە لە مەبەستی شەلە تێگەیشت کە کچی داربی شامینۆکی سپییە و خۆیشی لۆبیای ڕەشهەڵگەڕاو.

کوڕ پەست پەست، کڕ کڕ، تا گەیشتنەوە ماڵ کچ مینا خولخولۆکە لە دەوری دەسووڕایەوە، لە پێشی رادەوەستا، ڕێی لێدەگرت، جانتاکەی ڕادەکێشا. کوڕ زللەی مامۆستای بۆ کچ نەگێڕایەوە.

هاوار، هاواری دنیا لە هەناوی پەنگیخواردۆتەوە، کچی داربی ڕەنگە هەر لە دەرگاوە جانتاکەی تێهەڵدابێ، پێناچێ تیکە نانێکی خواردبێ، هاتە ماڵی کوڕی داربی. کوڕ لە کن دایکی بەسەر خۆی ناهێنێ.

باران نم نم دەباری، داربی کەسکدەچێتەوە، بەڵام زۆر پڕ نیە. منداڵانی داربی لە بن داربی دڵۆپە باران دەگرنەوە،

کچ زۆر لەکوڕ دەکات، کوڕ پشت لە کچ دەکات و بە شەرمەوە سەرهاتی زللەی بۆ دەگێڕێتەوە. کچ بە بازێ دێتە پێش کوڕ و تەماشای روومەتی دەکات:

سەگباب مامۆستا.

هەزار جوێن بۆ مامۆستای زللە دەنێرێ، لە گەمەی بن داربی کوڕ هەندێ هێوربۆوە، بە رۆیشتنی کچ هێورییش رۆیی.

شەو درەنگە، هاوار لەبەر هاواری هەناوی خەوی لێناکەوێ، دایکی دەزانێ شتێک بووە، بەڵام هاوار چ ناڵێ. کوڕ بیر لە بابی دەکاتەوە، ئەگەر لێرەبا، زللەکەی بۆ دەگێڕایەوە، تا تۆڵەی بکاتەوە. پیری گەڕیدەش پیرە و توانای تۆڵەکردنەوەی نیە.

شەو درەنگە، لە دەرگا دەدرێ، پیری گەڕیدە هاوار دەکات:

کچم، دەرگایە...

پیاوێک سەرەتا ئامێز بە پیری گەڕیدەدا دەکات، دێتە ژوورێ، کوڕی داربی تەنها لە وێنە دیتوویەتی، پیاوێکی کەڵەگەتی رەشتاڵەی چاو و برۆ رەش، بەر لەوەی دایکی پێیبناسێنێ، دەیناسێتەوە:

+ تۆ بابەی؟

- من بابەم.

+ سبەی تا لە قوتابخانە دێمەوە، ناڕۆی؟

- ئیدی بەجێتاننناهێڵم و هەموو شەوێ لەماڵێم.

کوڕ چەند رستەیەکی لە گفتوگۆی ئەو شەوەی پیری گەڕیدە و بابی تا ئێستاش لە گوێیە، رستەیەک هەینی شتێکی ئەوتۆی تێنەگەیشت، پیری گەڕیدە:

بیستمەوە ترک بە دامرکانەوەی ئەو ئاگرە نیگەرانە، من بە نیگەرانی ئەوان دڵخۆشم.

باب:

دوژمنانت هەمیشە نیگەران بن.

کوڕ لە باوەشی بابی زلـلەی لەبیردەچێتەوە، دەچێتە خەوێکی قووڵەوە. سبەینێ زووتر لە رۆژان دەچێتە دووی کچی داربی، تا هەواڵی هاتنەوەی بابی پێڕابگەیەنێ، بەڵام لە سەر دەرگا، هێشتا دەنگی لێوەنەهێناوە، شتێکی بیردەکەوێتەوە، پەژیواندەبێتەوە لە گوتنی هەواڵی بابی.

دڵخۆش دڵخۆش دەچنە قوتابخانە، هەر کوڕی داربی نا، چەند منداڵێکیدیش دوێنێ بابیان هاتبۆوە، دوێنێ رۆژی هاتنەوەی بابەکان بوو، مامۆستای زلله گوتی:

مافمـان وەرگـرت، بـاب و براکـان دێنەوە مـاڵی خۆیـان، جەنگ نەما.

منـداڵێک کە لە پشـت کـوڕی داربـی دادەنیشـت، دەسـتی هەڵبڕی:

مامۆستا، تۆش بە دار و زللە لێمان نادەی؟

مامۆسـتای زلـلە، تـا زلـلەیە لە بـن گـوێی دا، منـداڵ لە هاڕژنی دا، روومەتی سوور سوور وێنەی گوڵاڵە سـوورە هەڵگەڕا. منداڵێک لەو سەرەوە لە تەنیشت یووسفەوە کە لە هەموویـان باخۆشـتر بـوو، بە چرپە، بەڵام مامۆسـتا گـوێی سـووکە:

جەنگ ماوە.

مامۆسـتای زلـلە، منـداڵەی بـانگکردە پێش تەختەڕەش، یازدە راستەی لە سەر تی لە دەستی دا و گوتی:

یـازدەی ئـازار بـۆ مـیللەت، یـازدە راسـتەش بـۆ تـۆ، کەرباب.

منـداڵانی داربـی سـەیوانیان هەڵـداوە و بە بـن بارانـدا بەرەو مـاڵ دێنەوە، کچ هەستدەکات، دوو سـەیوان لێکیـان دووردەخاتەوە:

+ سەیوانەکەی خۆت هەڵگرە، وەرە بن هی من.

- نا، تۆ وەرە بن سەیوانی من.

بە قسەی دەکات، لە بن سەیوانێک ورد ورد سوێسکە ئاسا بەرێوەن و بارانیش لە پشتێن بۆ خوارەوە تەڕیان دەکات، کچ دەڵێ:

+ ئەورۆ ئێمە ئەی ڕەقیبمان گوت.

- ئێمەش گوتمان.

تا ئەو ڕۆژە منداڵانی داربی لە قوتابخانە گوێیان لە ئەی ڕەقیب نەبووبوو، کچ دەڵێ:

+ لە پۆلی ئێمە چوار کچ دوێنێ بابیان هاتبۆوە.

- لە پۆلی ئێمەش.

+ ئەگەر ئێمەش بابمان بمایە، دوێنێ دەهاتنەوە.

کوڕی هاتە سەر زاری بڵێ بابی من نەمردووە وهەوکە لە ماڵێیە، گێڕایەوە. لەپڕ لە پرمەی گریانی دا، کچ سەیوانەکەی لە دەست وەردەگرێ و دەڵێ:

+ نەمزانی، مەگری، ئێ خۆ منیش بابم نیە و ناشگریم.

- بۆ خۆم نا، بۆ تۆ دەگریم.

+ بۆ من مەگری، من گریانم ناوێ.

کـوڕ بە کـوڵتر گریـا، لە کـچ دوورکەوتەوە. بـاران و فرمێسـک لە سـەر رووی کـوڕ تێکەڵبـوون. کـچ خـۆی پێڕانەگیرا، فرمێسکی خوڕ خوڕ تێکەڵی باران بوو. منداڵانی داربـی لەگەڵ بـارانێ دەگـرین، لە پـێش دەرگـا فرمێسـک وشکدەبێتەوە.

کـوڕ لە سـەر دەرگـاوە ژنێـک دەبینـێ، بە شـێوەیەک رازاوەتەوە، بـووکی بەو رازاوەییە نەدیتـووە. تـا ورد لێـی وردنەبۆوە نەیناسیەوە. دایکی دەڵێی لە بەرگی فریشتەیە، زۆر جـاحێلتر بـۆتەوە، دەڵێـی لە تەمەنـی خـانزادە. کـوڕ هەسـتدەکات، دایکـی لە هەمـوو دایکـان کەم تەمەنتـرە، لە جـوانیش چ کـچ و ژنێـک شـان لە شـانی نـادەن. پـێش پەیدابوونەوەی باب، دایک جلکی جوانی لەبەرنەدەکرد، کوڕ لەبەر خۆیەوە دەیگوت:

خۆزی بابم زووتر دەهاتەوە.

کچ دوا پارووی هێشتا لە زارە، بە جلکی قوتابخـانەوە، دێتەوە بن داربی. چۆلە، سەر بە حەوشـەدا دادەگرێ. کوڕ رانە مریشـکێکی بە دەسـتەوە، دەیـداتە کچـی داربـی، هەتـا وەریگـرت مانـدووبوو. کـچ لە پەنـجەرەوە پیاوێـک دەبینـێ، دەپرسێ:

+ ئەو پیاوە کێیە لە ماڵتان؟

– دایکم دەڵێ دەیکەمە بابت.

دیارە ئەو رستەیە وا بە ئاسانی بە مێشکی کوڕی داربیدا نەهات، تا رێکیخست و بڕیاری گوتنی دا. زۆری ویست. باشبوو کچی داربی پێش بیستنی، گۆشتەکەی خواردبوو، دەنا دوور نەبوو لە دەستی بەربێتەوە. داما، زۆر داما. کوڕ هێندەی نەمابوو باوەشی پێدا بکات. کچ هەلات، کوڕ کەوتە دوای، پێینەگیرا، گەڕایەوە، شەرمیدەکرد بچێتە مالّیان،، رەنگبێ سێ جار نەچووبێتە مالّی کچی داربی، هەر لە سەر دەرگاوە بانگیدەکرد، رۆژی دوایی لە سەر سەکۆی بن داربییەکە:

منیش گۆتمە دایکم:

بابم دەوێ.

گوتی:

بابی چی!

گوتم:

هاوار بابی پەیداکرد.

گوتی:

ئەوها نیە، کچم.

کچی داربی دەلّێتە کوڕی داربی:

ئەوها نیە کچم، چیە؟ تێنەگەیشتم.

کوڕ بە دڵتەنگییەوە:

نازانم، لە دایکت بپرسە.

چەند ڕۆژێک دوای هاتنەوەی باب، کەند هەستا. کوڕ دەستی بە پاڕانەوەکانی کرد، هەرچەند وەک پێشان نەترسا. دیتی بابی پێمەڕەی هەڵگرت و پەڕییەوە، لەو بەرەوە ڕۆخاو ڕۆخی کەند کەوتە هەڵکەندنی عەردەکە، دوو سێ پیاویش چوونە یارمەتی. کوڕ چەندی سەر دێنێ و دەبات لە کاری بابی تێناگات، لە بابی پرسی، بەڵام لەبەر دەنگی رووبار و باران دەنگی لە رووبارەکە نەپەڕییەوە و نەگەیشت، لە دایکی پرسی، دایک گوتی:

بابت کەندەکە دووردەخاتەوە.

کوڕ ئاسوودە بوو، یەکێک لە پاڕانەوەکانی گەیشتووە، باب و دوو سێ پیاو، دوو سێ رۆژ درێژەیان بە پێمەڕەکاری دا، ئیدی لافاو دوورکەوتەوە، چیدی ئاو نەگەیشتە سەر سەکۆی بن داربی.

دەمەو ئێوارەیە، ئەگەر لە سەر بانەوە بەری خۆ بدەیتێ، وێدەچێ تازە رۆژ گەیشتبێتە سەر منارە، هێشتا بە قەدیدا دانەبەزیوە. لەو بەری کەندەکە، لە گۆڕاییەکە، جێی تۆپانێ، ئاگرێک کراوەتەوە، گەڕەک ئاگری وای بە خۆوە نەدیوە. ساڵانی پێشتریش ئاگر دەکرایەوە، بەڵام ئاگری ئەو ئێوارەیە جیایە. لە چاوی منداڵانی داربییەوە

بڵێسەی لە دارتێلەکە بڵندترە، دووکەڵیش گەیشتۆتە ئاقاری ئەستێرە، بە دیار ئاگر و دووکەڵەوە، چاو لە ئاسمان:

+ ئەوشەو ئەستێرە هەڵنایە.

- لەبەر چی؟

+ لە ترسی دووکەڵ.

-ئەستێرە بە دووکەڵ کوێر دەبێ!

وردو درشتی گەڕەک بە دەوری ئاگرەوە، لە هەموو لایەکیشەوە (ئەمرۆژی ساڵی تازەیە) دەبیستریێ و دەگوترێتەوە. منداڵان بە دەوری ئاگردا دەخولێنەوە. لە خولانەوەی دەوری ئاگریش منداڵانی داربی بە تەنیشت یەکەوەن و لە هەر خولانەوەیەکیش دەستێک لە پشتێنی بابی کوڕی داربی دەدەن، بەبیری دێننەوە:

+ سبەی زوو دەمانبەیتە نەورۆز!

- زوو زوو دەچین.

باوکانە دەست بە سەر هەردووکیاندا دادێنی، ئەو پیاوە لە ناو پیاوان دەڵێی دارتێلە راوەستاوە. لە تەنیشت پیری گەڕیدەی بابیەوە کە خۆی بە سەر گۆچاندا داوە و چاوی زیتی لە ئاگر بڕیوە، جگەرە بە لا لێویەوە، دەمانچە بە نێکیەوە، تیلاک خوار، پۆشتە، ئەو پیاوە لە گەڕەک لەمێژبوو، هێشتا هەر لە چیا بوو بە تۆڵەستێن ناوی

ڕۆیشتبوو. کوڕی داربیش بیستبووی، بەڵام تا نەهاتەوە نەیزانی تۆڵەستێن باوکیەتی. کوڕ دەیبیستەوە، لە منداڵانی گەڕەک سەرهاتی تۆڵستێنی دەبیستەوە، بەڵام تا کچی داربی لە ڕێی قوتابخانە تۆڵەستێنی نەهێنایە ناو قسانەوە، کوڕی داربی لێی نەبووە مەراق. ئەو ڕۆژی ئاگرکردنەوەکە یەخەی دایکی گرت، بابی بۆی نەدەگێڕایەوە، بۆ کەسی نەدەگێڕایەوە، داوایلێکرد کە بە وردی بۆی بگێڕێتەوە و لێی پرسی:

+ دایە، ئەوەی خەڵک دەیڵێ ڕاستە؟

- ڕاستە، زۆری ڕاستە، تۆ گچکە بووی، جاشێکی گەورە هەبوو، چ جاش، جەرگی چەندان ژنی سوتاندبوو، چەندان ژنی بێوەژن ئێخستیوو، چەندان منداڵی بێ باب کردبوو.

+ ئێ، دەزانم جاش چیە.

- چیە؟

+ جلک و چەکیان وەکوو هی بابمە، بەڵام دوژمنی بابم بوون، پێشان لە سەر جادە دەمدیتن، ئێستا بزرن.

- ئا، ڕۆژێک دەستەیەک لە قەراخ شار ڕێی لێدەگرن چەند جاشێکی لێدەکوژن، بەڵام خۆی بەر ناکەوێ و دەردەچێ.

+ بابم لەگەڵ ئەو دەستەیە دەبێ؟

- نا، قسەم پێمەبڕە.

کوڕی داربی دەستی لە سەر زاری خۆی نا، دایکی پێکەنی و دەستیپێکردەوە:

جاشەکە شێت و هار دەبێت، سبەینێ لە ماڵ دێتە دەرێ، سوێند دەخوا هەر کەسێک رانکوچۆخەی لە بەر بێ، جگە لە جاش، بیکوژێ. لەبن ئەو پردەوە دەستپێدەکات کە گامێشەکە بۆت هات و زیڕاندت، تا دەگاتە سەر ئەو پردە گچکەکەی شووشە لە پێت راچوو و خوێن نەدەوەستا، حەڤدە گەنج لە خوێن دەگەوزێنێت. شەش رۆژ گەڕەکی نێوان دوو پرد شینیان گێڕا، شار رەشی پۆشی، رۆژی حەفتەم بابت تۆڵەی گەڕەک و شاری ستاند، جاشەکەی لە خوێن گەوزاند.

ئیدی کوڕی داربی لە خۆشیدا، لە سەر زەوی جێینەدەبۆوە، دەیویست بفرێ و لە ئاسمانەوە هاواربکات:

من کوڕی تۆڵەستێنم.

دەیویست بە مامۆستای زاللەش بڵێ:

بابم تۆڵەستێنە!

بەڵام بابی زوو ئامۆژگاری کرد کە لە هیچ جێیەک، لە کن کەس نەڵێی تۆڵەستێن بابی منە و خۆت بە من

هەڵمەکێشــە، ئەگەر منـداڵانیش باسـیان کـرد، تـۆ گوێیـان لێڕامەگرە. کوڕ نەیزانی مەبەستی بابی لەمە چیە، بەڵام بە قسەی کرد.

ڕۆژ لە سـەر ئـاوابوونە، ئـاوابوو. لەو لا و لەو لا بـووە تەقە، هێشـتا تاریـک دانەهـاتووە، ئـاگر جـوانتر بڵێسـە دەدا، تەقە پتر بوو، ئاسمان پڕبوو لە گڕدار، تۆڵەستێن دەڵێ:

با بچینەوە ماڵێ.

دەستی لە دەستی باب، کچەش دەستی لە دەسـتی بـابی وی، پەنجەکـانی کـوڕ نەرم دەگوشـێ، ڕەنـگە پەنجەکـانی کچی داربییش بگوشێ. چ ئارامبەخشییە دەست لە دەسـتی بـاب، لەو سـاتە ئارامبەخشـییە، کـوڕ هەسـتدەکات، دەسـتی بابی شل دەبێت، ئـای! بـابی دەکەوێت، بە هێواشـی پشـتاو پشت دەکەوێت، خوێن بە سینگییەوە، گوێی لە بابیەتی:

ئای لە تەقەی خۆشی!

کوڕ خوێن دەبینێ، هێندە و تەواو.

ڕۆژ بــۆتەوە، کــوڕ چاوهەڵــدەگلۆفێ، خــوێن لە ســەر سینگی بابی دەبینێ، هاواردەکات:

+ بابە، بابم، لە کوێیە؟

– مەترسە، لە خەستەخانەیە، دێتەوە.

دایکی بە خۆیەوە دەگوشێ و سوێندی بۆ دەخوات کە باوکی نامرێ و چاکدەبێتەوە، بەڵام کوڕ باوەڕ بە دایکی ناکات. لە بارەی بابییەوە درۆی زۆر لە دایکی دیوە، پێش هاتنەوە، بۆ پرسیاری:

دایە بابم لەکوێیە؟

هەر جارەی جێیەکی دەگوت.

کەی دێتەوە؟

ئەو جێژنە نا، جێژنەیەکیدی.

زۆر جێژنە هاتن و چوون، باب نەهاتەوە، کوڕی داربی دوا درۆی دایکی لە بیرە:

+ بابت چۆتە حەجێ.

- لەگەڵ حاجیەکان دێتەوە؟

- نا، درەنگتر دێتەوە، بابت حەزی لێیە زۆر لە حەجێ بمێنێتەوە.

کوڕ لە بیریەتی، دایکی درۆی بۆ دەکرد و درۆی پێدەکەرد، دەیگوت:

کوڕم، لە کن کەس نەڵێی بابم لە حەجێیە، بڵێ دەمێکە مردووە.

کـورِ کەڕەتـــێ پرســـیاری بـــابی لە پیـــری گەڕیـــدەی باپیریشی کرد، ئەویش هەر بە پیری گەڕیدە گازیدەکرد، لە گەڕەکێ، لە شار ورد و درشت، یار و نەیار، خزم و بێگانە بە بـاپیری کـوڕی داڕبییـان دەگـوت پیـری گەڕیـدە، کەم کەسیش دەیزانی ئەو (گەڕیدە)یە کەی و چۆن بەو پیاوە بەتەمەنەوە نووساوە:

پیری گەڕیدە، بابم دێتەوە؟

پیری گەڕیدە:

بابت ڕۆژێک دێ پەیدابێتەوە، بەڵام نازانم کەی.

پیـــری گەڕیـــدە درۆی لەگەڵ نەکردبـــوو، چـــووە لای، لێپرسیەوە، گوتی:

دڵنیابە، بابت چاکدەبێتەوە.

بەڵام کـــورِ دڵنیـــا نەبـــوو، دوو ڕۆژ دواتـــر چـــووە خەستەخانە، بـابی لە سـەر پشـت ڕاکشـابوو. کەوتنـی کـن ئـاگرەکەی بیـرکەوتەوە، قســەی لەگەڵ بــابی کــرد، بەڵام هێشــتا لە قســەی دایکــی دڵنیــا نەبــوو. پێیوابــوو لەوەش درۆدەکات و بابی چاکنابێتەوە، بە بابی گۆت:

+ بابە، دایکم درۆناکات؟

– درۆی چی؟

+ دەڵێ تۆ چاکدەبیتەوە.

- نا، دایکت لە بارەی منەوە زۆر درۆی بۆت کردووە، بەلام لەوەیان راستدەکات، من نامرم.

ئەو نەورۆزە گەڕەک هەمووی لە رێی خەستەخانە بوو، کەس نەچووە نەورۆز، ماڵێک لەو سەر نەبێ، کە پیاوەکە ناوی بەهرام هەمەدانی بوو. گەڕەکی تۆڵەستێن هەمووی حەفتا ماڵێکە، لەگەڵ دوو حەساری گەورەی بەرانبەر یەکتر، ماڵەکانیش پەرتن، کەمیان بانیان بە سەر یەکەوەیە، بەلام هەموویان سەردانی یەکتر دەکەن، کچی داربی دەڵێتە کوڕی داربی:

+ بابت چاکدەبێتەوە، خەم مەخۆ.

- ئا، چاکدەبێتەوە.

+ کاتێ هاتەوە منیش دەبمە کچی وی، بابی دیم ناوێ.

- چەند خۆشە.

تا تۆڵەستێن لە خەستەخانە نەهاتەوە، کوڕی داربی باوەڕی نەبوو چاکبێتەوە. وا چووبووە مێشکیەوە کە خەستەخانە جێی مردنە، زۆری بیستبوو کە فلان کەس لە خەستەخانە گیانی سپارد. ئەو رۆژەی تۆڵەستێن گەیشتەوە ماڵ، ئیدی کوڕی داربی نەک هەر لە درۆکانی دایکی خۆش بوو، بگرە گەیشتە ئەو باوەڕەی دایکی

هەرگیز درۆی نەکردووە. بابیشی بە راستگۆیی ناسی، بەڵام لە هەمووی پتر بە راستگۆییەکەی کچی داربی سەرسام بوو، پێیگوت:

+ چۆنت زانی بابم چاکدەبێتەوە؟

- خەونم دیت، لە خەونێ ئەتو گۆتت بابم نامرێ.

منداڵانی داربی لە دوای پەیدابوونەوەی تۆڵەستێن، هەستیان بە زۆر گۆڕانکاری کرد. بە سەر قوتابخانە و گەڕەک و دەوروبەر و سروود و گۆرانیدا هات. پێشتر سروودەکان قاچاخ بوون، تەنها لە رادیۆکەی پیری گەڕیدەوە بە خشەخش و هانی هانییەوە دەبیستران، بە دەنگی نزم و نەدەبوو بگەنە دەرێ. داک دەیگۆتە کوڕ:

لە کن کەس نەڵێی گوێ لەو گۆرانیانە دەگرین.

ئێستا ئەوە (پێشمەرگە) دەستی( شەهیدان)ی گرتووە و بە (ئەی رەقیب)ەوە بە گۆڕەپانی قوتابخانە و ناو پۆل و کۆڵان و جادە وەربوونە و ورد و درشت دەیانڵێنەوە.

پاش پەیدابوونەوەی تۆڵەستێن، سروودی نوێ پەیدا بوو، گۆرانیی تازە، چەند خانوویێکی دی لە گەڕەک قیتبوونەوە و ماڵی تازە هاتن، منداڵ زیادی کرد، گوڵێنگدارەکان کەس نەیزانی ئاسمان هەڵیکێشان، زەوی قووتیدان، کتوپڕ ونبوون. لە رێیێ کە لە ماڵێوە دەچیە قوتابخانە، بە لای چەپدا یەک پارچە کەسکاییە، گەنم و

جۆیە و بەژنیان کردووە، کچی داربی کە دەڵێی بڕکە جۆیە ڕاوەستایە، دەڵێ:

گوڵینگدارەکان لەپڕ بزربوون، تۆڵەم لە چلمنەکە نەکردەوە.

کوری داربی بە بڕکە گەنم دەچێ، دەڵێ:

لێیگەڕێ، لۆ خۆمی لێگەڕێ، هەر دەیبینمەوە.

کچ دەڵێ:

حەزمدەکرد من تۆڵە بکەمەوە.

کوڕ دەڵێ:

بابم بە دەمانچە تۆڵەی کردەوە، من بە دارلاستیق دەیکەمەوە.

کوڕی داربی بە دارلاستیق خۆی بادەدات، وا دەبینێ چەکێکی باشە بۆ خۆپاراستن و تۆڵە، ئەو ڕۆژەی پیری گەڕیدە ڕێیدا دارلاستێقی هەبێ، خەنی بوو، گوتی:

مەرجەکەت لە سەر چاوم.

پیری گەڕیدە بەو مەرجە مۆڵەتی هەڵگرتنی دایە کوڕی داربی کە بە گاڵتەش ڕووی دارلاستیق نەکاتە داربی و یەک بەرد چیە نەیگرێتە باڵداران، پیری گەڕیدە دەڵێتە کوڕی داربی:

ئەو داربییە پیرۆزە، بابت بە دەستی خۆی چاندی، دایکت ئاویدا، من دەیپارێزم لە بەردی منداڵە ورتکە، تۆش لە سێبەرەکەی گەمەدەکەیت.

پیری گەڕیدە ئێشکگری داربییە، بۆیە فرندە بێ ترس لە سەری دەنیشنەوە و بە ئاسوودەیی دەخوێنن. باڵندەکانی ناو داربی لە تەقەی سەربازەکانیش ناترسن، تا داربی مابێ لە خوێندن ناکەون.

بابیش کە بیستی کوڕ بە مۆڵەتی پیری گەڕیدە دارلاستیقی هەڵگرتووە و مەرجەکەشی نەشکاندووە، ڕێی لێنەگرت. تەماشای دەست و دارلاستیقیشی دەکرد کە زۆر جار دارتێلەکەی ئەو بەری کەندێی دەکردە نیشانە و کەم جار هەبووە زرینگەی لێوە نەهێنێ. بابی تا دارلاستیقی لێوەرنەگرت و سێرەی لە دارتێل نەگرت، نەیزانی کوڕەکەی یەکێکە لەو نیشانشکێنانەی نە منداڵ و نە گەورە بای نابەن. باب دە بەردی دەهاویشتە دارتێل ئەگەر بەردێکی پێکەوتبا، بەڵام کوڕ لە دە بەرد نۆیانی مسۆگەر بوو. کوڕ دەڵێتە باب:

ئەوجا دارتێل چیە! ڕاوەستە لە تێلەکەی بدەم.

دارتێلەکە دوا دارتێل لە سەری ڕۆژهەڵاتەوە، تێلێکی باریک لە سەری دارتێلەوە بە لاری هاتبووە ناو عەرد، کوڕی داربی دارلاستیقی هاویشتێ، دەنگی نەهات بەڵام

بەرد هەڵقۆزیەوە، باب کوڕی گرتە باوەش و ماچبارانی کرد، کوڕ دەڵێتە باب:

ئەگەر بەردێک لەو تەلەی سەر سەرەوە بدەم، لە کاتی گەڕانەوە نابێتە کارەبا؟

باب دەڵێ:

نا، لێیدە...

چوونە بن تێلەکان، هاویشتی، بەرد رۆیشت، رێک بە تەلی سەرەوە کەوت و لە تەنیشت خۆیان کەوتەوە.

پیری گەڕیدە دەڵێ:

برنۆی بدەیتێ، دەرزی هەڵدەگرێ.

رۆژێک لەو بەری کەندێ پیاو نیشانەیان دانایەوە، منداڵی گەڕەک لە پشتیان راوەستابوون، کچی داربیش لەوێ بوو، بە زۆر تۆڵەستێنیان برد، ئەو پیاوە دەیگوت:

من باوەڕم نە بە تەقەی خۆشییە، نە بە نیشانەدانانەوە.

ئەو رۆژە نیشانە جگەرە بوو، هەموو هاویشتیانێ، جگەرە بەلای نەگەیشتێ. تۆڵەستێن نیشانەی لێگرت، هەلاهەلای کرد، بووە چەپڵە و فیکەکێشان، دەنگی کوڕی داربی لە ناویان دیارە ( بژی بابە، بژی بابە)، کوڕی داربی دەڵێ:

منیش تێیدەگرم.

پیاوێک دەڵێ:

دانیشە بەرخم، تۆ چوزانی تەقە بکەیت.

باب دەڵێ:

چەکی وی دارلاستیقە.

پیاوەکە دەڵێ:

ئافەرین، ئەگەر لێتدا، نیو دینارت دەدەمێ.

باب جگەرەیەکی بۆی دانایەوە، کوڕ بەردێکی رەشی خڕی لە گیرفانی دەرهێنا، سێرەی لێگرت، تۆزی لێهەستان، تەماشادەکەن جگەرە هەڵا هەڵا بووە، منداڵان کردیانە چەپڵە لێدان و درووشم هەڵدان:

بژی هاواری کوڕی تۆڵەستێن.

منداڵان هەموو کڕبووبوونەوە هێشتا (بژی)ی کچی داربی دەهات، پیاوەکان دەڵێنە تۆڵەستێن:

وەڵا ئەگەر کوڕەکەت بتگاتێ.

کوڕ زۆر دڵخۆش بوو، پیاوەکە دەستی لە بەرکی راکرد، نیو دیناری دەرهێنا، چەندی کردی کوڕی داربی

وەرینەگرت، بابیشی و کچی داربیش پێیان خۆش بوو کە وەرینەگرت.

سەربازەکان چادریان دەپێچایەوە و لە زیلیان باردەکرد. کوڕ بە بارکردنی سەربازەکان خەنی بوو، ئاخر رێی تاقە دارخورماکەیان گرتبوو، کێ دەیوێرا لێی نزیک بێتەوە، رووی گوللەکان لەو بوون، هەر کاتێ لە ناو سەربازەکانەوە دەنگی تەقەیەک هاتبا، پیری گەڕیدە دەیگوت:

ئەو ترسنۆکانە دیسان دارخورمایان کردە نیشانە.

دارخورمایەک لە سەر بانیماڵی کوڕەوە جوان دیار بوو، چەند حەزی دەکرد لە نزیکەوە دیتبای، کوڕ دیتی: دوو سەرباز فەردە ئاردێکیان هەڵگرتووە، هاتن، هاتن لە پێش دەرگا لە نزیک داربییەکەیان دانا و رۆیشتن، پیری گەڕیدە چاوی لێبوو، تەق تەق بە گۆچانەوە هات، گۆچانی گەیاندە فەردە، پرسی:

+ ئەوە چیە، ئەو سەربازانە چیان هێنا؟

- ئارد.

+ نەکەن، ئەو ئاردە نەکەنە نان، سەربازی عارەب وەک هی ترک و عەجەمانە، جێی متمانە نین، هیچیان لێوەرمەگرن.

لە دوای پەیــدابوونەوەی تۆڵەســتێن، قوتابخــانەکەی کــوڕی داربــیش بە قوتابخــانەیی نەمــا.بــووە مــاڵی بەرپرسێکی گەورە، وەک دەیانگوت زۆر لە جاشی گەورە گەورەتر، لە تۆڵەستێنیش گەورەتر. قوتابخانە بووە ماڵ و چەنـد تفەنگچییـەک لە پـێش دەرگـا و ســەر دیوارەکـان پاسەوانیان لێی دەکرد. کوڕ لەوە توورە بوو، چۆن دەبێ لە سەردەمی باوک، سەردەمی تۆڵەستێن، قوتابخـانەکەی ببێتە ماڵی کەسێک، بە بابی گوت:

+ بابە، لۆ قوتابخانە بووە ماڵی ئەو پیاوە؟

- چ بڵێم، منیش نازانم.

+ من دەمەوێ لە قوتابخانەکەی خۆم بم.

- قەینا، قوتابخانەی ئێستاشتان نزیکە، لە هی گوڵنار هێندە دوور نیە، تۆ لەوە گەڕێ، با بزانم.

کوڕ هەستدەکات باب دەیەوێ بابەت بگۆڕێ، خۆی قسەی بە لایەکی دی برد:

بابە، لەبەر تۆ کەس لە گەڕەک نەچوونە سەیرانی، تەنها ماڵی هەمەدانی چوون.

بابی گوتی:

منیش لە جێی وان بام، دەچووم.

کورڕ دەڵێتە بابی:

لۆ؟

باب چ وەڵامناداتەوە، بەڵام دایک، هەرچەندە باب بە چاو پێیدەڵێ کە چ نەڵێ، خۆی پێناگیرێ:

کورم، کاتی خۆی ئەو پیاوە لە ترسی بابت هەڵدێ و هەتا هەمەدان گیرنابێ، هەر لەوەشەوە بۆتە هەمەدانی، دەنا خەڵکی گەڕەکی خۆمانە.

کورڕ دەڵێ:

لەبەرچی راوی دەنێ؟

دایک دەڵێ:

هەمەدانی کاتی خۆی زۆر برادەری بابت بووە، بەڵام لە پڕ دەبێتە دوژمنی.

کورڕ دەڵێ:

لە پڕ....

باب دەڵێ:

چیدی نامەوێ گوێم لەو سەربردەیە بێت.

دایک قڕوقەپی لێدەکات، کورڕ هەرچی دەڵێ و دەپرسێ، دایک وەڵامناداتەوە.

باب دەڵێتە کوڕ:

لە باتی نەورۆزەکە بتبەمە کوێ؟

کوڕ کەمێک بیردەکاتەوە، دەڵێ:

بمبە کن شەمەندەفەر.

باب دەڵێ:

تا ئێستا نەتدیتیە؟

کوڕ:

لە دوورەوە دەنگـــیم بیســـتووە، لە نــزیکەوە بە راوەستاوی دیتوومە، بەڵام حەزدەکەم لە رۆیشتنێ بیبینم.

چێشتانێکی درەنگە، گەیشتنە لای یاریگاکە، لە دوورەوە دەنگی شەمەندەفەر دێ، کوڕ دەڵێتە کچ:

خێرا برۆ، ئێستا دەگات.

دایک دەڵێ:

غارمەدەن، گەیشتین.

شەمەندەفەر بەدیارکەوت، منداڵانی داربی هەڵدەپەڕن و چەپڵە لێدەدەن، شەمەندەفەر هات و تێپەڕی، وا بە جێ پێی شەمەندەفەردا، بە سەر هێلی ئاسنین، هەنگاو دەنێن رووەو مـاڵی شــەمەندەفەر. کـوڕ ئـاوڕدەداتەوە، دەبینـێ دایـک و

باوک، هەر یەکەیان بە سەر هێڵێکەوە و جارجارەش دەستیان دەگاتە دەستی یەکتر، وەک بڵێی یەکتر دەگرنەوە، ئەو گەمەی دایک و باوک سەرنجی رادەکێشێ، چاویان لێدەکات. دەستی کچ دەگرێت و فێری گەمەکەی دەکات، بە گەمەی سەر هێڵی ئاسنینەوە لە ماڵی شەمەندەفەر نزیکدەبنەوە، گوێی لێیە، دایک لە دایکبونی خۆی بۆ باب دەگێڕێتەوە:

من هەر جارێ کە گوێم لە دەنگی شەمەندەفەر دەبێ، لە دایکبوونی خۆم بیردەکەوێتەوە، دایکم دەیگۆ:

ئەو رۆژەی تۆ هاتیە دنیا، شار بۆ یەکەم جاری گوێی لە دەنگی شەمەندەفەر بوو.

باب دەڵێ:

وایە، تۆ ساڵی شەمەندەفەر لە دایک بوویت، من ئەو ساڵەم لە بیرە، وا بزانم، ئا، هەر لەو سەروبەندە بوو، بابم بە دڵشکاوی و برینداری لە مەهاباد گەڕایەوە.

لە گەڕانەوە دەنگی (یازدەی ئازار) هات، دایک بانگیکرد، منداڵانی داربی کە سەریان بە سەر تەپەدۆرەکەدا گرت، هەردووکیان یازدەی ئازاری رەنگ سووریان هەڵگرت، کوڕی داربی حەزیدەکرد کرێمستی با، یەک کرێمستی و دارەکەی لە کەلێنی پەنجەکانەوە...

دایک و باوکیش سەرو یازدەی ئازاریان بە دەستەوە، کوڕ گوێی لێیە دایک دەڵێ:

یازدەی ئازار بۆتە ناوی ساردەمەنی منداڵانیش.

باب دەڵێ:

ئەگەر تاڵی تێنەکەوێت، یازدەی ئازار وەک ئەو یازدە ئازارەی دەستمان شیرینە.

کوڕ لە ئەگەر و تاڵی تێنەگەیشت.

لە گەڕانەوەش بە خەیاڵ هەر لای گەمەی سەر هێلی شەمەندەفەر بوو، دەستی لە دەستی کچی داربی بوو، ئەو دەستگرتنەشی لەبیرناچێتەوە.

بە هاتنەوەی تۆڵەستێن، بەلووعەی ئاویش هاتە ماڵی منداڵانی داربی، پێش تۆڵەستێن دایکەکان دەبوو بە سەتڵ و تەنەکە بچن لەو بەلووعەیە ئاو بێنن کە لە نزیک حەسارەکە، لە بن دارتووێکی گەورە زۆر کات یەک قامک ئاوی لێدەهات، جار جارەش دەتگوت پەلامیزەیە تا تەنەکەیەک پڕ دەبوو، دەچوویە لای حەسەناغا و دەهاتیەوە. ئاوی گەڕەک لە دەستی ئەو حەسەنە بوو، بیست تەنەکەش ریزیان بەستبوو، بیرەکە زۆر دوور بوو نزیک ماڵی یووسف، ژنێک دەیگوت:

تا گونی بۆ نەشێلن، ئاوەکە بەرناداتەوە.

به راکێشـانی بەلـووعە بـۆ حەوشــە، کـوڕی داربـی نەیـدەزانی نە دڵخـۆش بـێ، نە خەفەت بخـوات، دەبـوو دڵخـۆش بێـت. دایکـی لە کـۆڵی ئاوکێشـان بـۆوە، چـوار وەرزەی ســاڵ لە ڕێــی ئاوکێشـــان بــوو، جــگە لەوەش حەزیـدەکرد سـۆندەی ئـاوێ بە دەسـتەوە بگـرێ و پـێش دەرگا بڕشێنێ و ئاو بۆ داربییەکە هەڵدا. دەبوو خەفەتبار بێت، گەمەی ڕێـی ئاوکێشـانی لە دەسـتچوو. چەنـد خـۆش بوو کە لەگەڵ کچی داربی بە جـووتە سـتڵێکی گچکەیـان بە دەستەوە دەگرت و...

بە هـاتنەوەی تۆڵەسـتێن، نەنە خـانیش هـاتە گەڕەک، لە نزیک ئاوەکە خانووێکیان قیتکردەوە، نەنەخـانیش بە پیری گەڕیدە دەڵێ پیری گەڕیدە. تەمەنیان ڕەنگە لێک نزیک بێ، نەنە خان ژنێکی تا دەست هەڵبڕی کەڵەگەت، کەمێک کووڕ بـۆتەوە، کراسـێکی ڕەشــی ئــاودامەنی لەبەرە، ژنـێکە ڕەشـتاڵەیە، ڕەشـتاڵەیەکی ڕوون، دەیـانگوت پیری گەڕیـدە گوتوویەتی:

ڕەنگی لە ڕەنگی مێوژ دەچێ.

نەنە خان زوو لەگەڵ پیری گەڕیدە بوونە هاوڕێ، زوو زوو دەهـاتە بـن داربـی، منـداڵانی داربـی لە لایەک و پیـری گەڕیدە و نەنە خانیش لە لایەک، کوڕی داربی گوێی لێیە، باسـی کـۆن بـۆیەکتر دەکەن، باسـی شـار و جێیـان دەکەن،

شەڕی ترک و ئینگلیز، باسی مەهاباد و دەرسیم و گرانی و...گوێی لێیە نەنە خان دەڵێ:

من لێرە لەو بنە داربییە، بە بیستنی دەنگی ئەو باڵندانە زۆر ئاسوودەم.

پیری گەڕیدە دەڵێ:

ئەو داربییە زۆر تایبەتە.

نەنە خان بێ چوکلێت نایەتە بن داربی، چوکلێت بۆ منداڵانی داربی، بە هاتنەوەی تۆڵەستێن، چوکلێتەکان شیرنتر بوون.

بە هاتنەوەی تۆڵەستێن منداڵانی داربی گۆڕانی جوانیان بە سەرداهات، تۆڵەستێن تۆڵەی زۆر شتی بۆ کردنەوە، پووشکاخەزەکە لە بیرناچێتەوە. پێش پەیدابوونەوەی باب، کچ و کوڕ هەرچیان دەکرد، دایکەکان بۆیان دروستدەکردن، خۆیان دروستیاندەکرد، جۆرەها کاخەزیان بەکارهێنا، پووشکەی باریک و ئەستووریان تاقیکردەوە، دایانە دەست هەموو بایەک، هەر جارەی لە جێیەکەوە هەڵیاندەدا، پووشکاخەز سوێندی خوارد لە دارتێلەکەی ئەوبەری کەند بڵندتر نەبێتەوە، لە بن داربییەکە تۆڵەستێن بە تەنیشت پیری گەڕیدەوە بە دەم گێڕانەوەی سەرهاتان، لە گژ دروستکردنی پووشکاخەزە. منداڵانی داربی بە دەوریەوە، چاویان لە دەست و پەنجەی

تۆڵەستێن بڕیوە، کچی داربی نازانم، بەڵام کوڕی داربی لەو ساتە تەنها هەستی بینینی لە کارە، چاو لە سەر پەنجە و پووشکاخەز هەڵناگری، گوێی لە سەرهاتان نیە، ئی، بە رستەیەک هەستی بیستنیشی بۆ گەڕایەوە:

تەواو، با هەڵیدەین.

پەڕینەوە ئەو بەر، لە نزیک دارتێلەکە تۆڵەستێن سەرێک بۆ لای چەپ سەرێک راست، دواتر بۆ دواوە نەرمە غاری کرد، هێندەی بڵێی یەک و دوو، پووشکاخەز گەیشتە سەر تێلی دارتێل، باب دەڵێتە کوڕ:

بڕۆ چەند خریلە لە ماڵی هەیە هەموویان بێنە.

رۆیشت تا هاتەوە، پووشکاخەز لە ئاسمان بوو، داویان لە دووی دا، پووشکاخەز سەرەو ئاسمان و بە ئاراستەی قەلات هەڵکشاو رۆیشت، پووشکاخەز پێش هەڵدان کە هێشتا خەڵکی سەر زەوی بوو، لە جانتاکەی کچی داربی گەورەتر بوو، جگە لە کلکێکی درێژ کە لە چاوی کوڕی داربییەوە زۆر لە کەزی کچی داربی دەچوو، لە ساتی هۆنینەوە.

ئێستا کە پەیوەندی بە زەوییەوە نەماوە و خەڵکی ئاسمانە، لە چاوی کوڕی داربییەوە هەر هێندەی ناو لەپی کچی داربی دیارە. لەو ساتە چاوی لێبوو، کچ هەر دوو دەستی رووەو ئاسمان کردبۆوە، وەک بڵێی دەپاڕێتەوە

پووشـــكاخەزەكە بەلایەكـی بە ســـەردا نەیەت و بەسـاخی بگەڕێــتەوە. منـــداڵی گەڕەك ڕژاونەتە ئەو ســـاكەگۆڕە و چاویـان بە ئاسـمانەوە، كـوڕ هەر هەرگیـز هێنـدە دڵخـۆش نەبووە، هێندە لە خۆبایی نەبووە، دەیەوێ هاواربكات، بڵـێ ئەهـا بـابی مـن چتـۆ پووشـكاخەزی درووسـتكردووە، بـابی ئێوە ئەوە دەزانێ؟ نەیگوت.

پەلە هەورێك لە پووشكاخەز نزیكدەكەوێتەوە، دەیەوێ سـێبەری لێبكـات، لە ســەر ئەوەیە لە چـاو بـزر بـێ، بـاب دەڵێتە كوڕ:

خێرا دووربینەكە بێنە.

یەكچـێ ڕۆیشــت و هێنــای، تــا چـاو لە دووربــین بە پووشكاخەز دەكەوێتەوە، كاتی دەوێت، منداڵانی داربی بە نۆرە چاو بە دووربینەوە دەنێن، باب جار جارە دەڵێ:

دیارە؟ چەندی لێ ماوەتەوە؟

كچی داربی دەڵێ:

هێندەی چاوێك.

كوڕی داربی دەڵێ:

هێندەی لێوێك.

منداڵانی داربی دەڵێی خەمبار دیارن، كچی داربی دەڵێ:

نایەتەوە؟

تۆلەستێن دەڵێ:

نـــا، زەحـــمەتە بێــتەوە، بەڵام ئەگەر ئەوەش ڕۆیـــی، پووشکاخەزێکی دی...

باب دەبێ خەمباریی لە سیمای منداڵەکان خوێندبێتەوە، بۆیە گوتی:

بـڕۆ پێنـووس و کـاخەز بێنن، نـامە بۆ پووشـکاخەزەکە بنووسن.

سەریان لەو قسەیە سووڕما، نامە چۆن دەگاتە ئاسمان! باب بۆی ڕوونکردنەوە، هێنایان نووسییان:

**وەرەوە بیرت دەکەین.**

بە قسەی باب ئەوەشیان نووسی:

**بە هەورەکە بڵێ نەرمە بارانێک ببارێنە.**

کونێکی خشتیان لە ناوەراستی پەڕەکاخەزەکە کرد و بە داوەکەیـــانەوە کـــرد. کـــاخەز بەو ڕێـــیەدا ڕۆیشـــت کە پووشکاخەز پێدا ڕۆیشتبوو، منداڵانی داربی دەیانپرسی:

گەیشت؟ کەنگێ دەگات؟ وەڵامناداتەوە؟

پاش ماوەیەک داو لە دەست سووک بوو، داوێکی بێ پووشکاخەز و نامە بە دەستەوە ما. زۆری نەبرد تاوە بارانێک دایکرد، منداڵانی داربی لە بن باران هاواریان دەکرد:

نامەکە گەیشتە پووشکاخەز، هەوریش بە قسەی کرد.

لەو دەمە کوڕ لە سیمای بابی سەرسوورمانی خوێندەوە، تێینەگەیشت بۆ!

بە هاتنەوەی تۆڵەستێن، منداڵانی داربی بە سەر قەلاتیش کەوتن، بە کۆلانە تەسک و تریسکەکاندا گەڕان، لە سێ چوار لاوە تەماشای شار و چیا و دەشت و دنیایان کرد. لە هاتنە خوارێشدا گڕناگەیان گرت، بە قسەی تۆڵەستێنیان نەکرد، بە خشخشۆکە هاتنە خوارێ. کوڕ ئێستاش ڕێی خشخشۆکە دەناسێتەوە.

بە هاتنەوەی تۆڵەستێن چوونە سینەماش، چەندان شەو خەونیان بە فیلمەکەوە دەدیت و بۆ یەکتریان دەگێڕایەوە. ئەدی بن لەیلووکان!

کچ ڕۆژ دوای ڕۆژ پتر هۆگری بابی کوڕ دەبێ، جێی بابی بۆ گرتۆتەوە، هەر ماوە پێیبڵێ بابە، لە دوورەوە بیبینێ غاردەدا و خۆی داوێتە باوەشی. کوڕ کاتێ منداڵێک لە باوەشی بابی دەبینێ، زۆری پێناخۆشە، بەڵام بۆ کچی داربی هیچی لە دڵ نیە، پێکەوە دەچنە باوەشی بابی، هەر

یەکەیان لە سەر رانێکی دادەنیشن، باب زۆر جار کچ بە (دنکە هەنارەکەم) بانگ دەکات و کوڕی داربیش بە(هەنجیرەکەم)، کوڕ هەرگیز ئەوەی لەبیرناچێتەوە کە جارێک میوەیان لە پێش بوو، باب قلە هەنجیرێکی رەشی بۆ دایک رادەگرێ و دەڵێ:

تامی بکە، بزانە چەند لە ماچی هاوار دەچێ.

دایک گەزەیەکی لێدەدات:

ئۆی چەند شیرینە، کتومت رووومەتی هاوارە.

باب هەنجیرێک دەداتە دەستی، لەو دەمە کچی داربی بەسەردا دێ، باب دەڵێتە کوڕ:

ئەگەر دەتەوێ بزانی چەند شیرینی، ئەو هەنجیرە رەشە بخۆ.

دەیخوات، شیرینە، باب دەڵێتە کچ:

وەرە دنکە هەنارەکەم، هەنار و هەنجیر بخۆ.

هەنجیرەکە دەخوات و دەڵێ:

ئۆی، چەند شیرینە ئەو هەنجیرە رەشە.

لەو دەمە کوڕی داربی هەست بە شیرینیی خۆی دەکات.

تۆڵەستێن یەک منداڵی هەیە، بەڵام لەوەتەی هاتۆتەوە، جارێک نەبێ، هەر جارەی بە دیاریی منداڵانە گەڕابێتەوە ماڵ، دوو دیاری بەدەستەوە بووە. کوڕیش هەر ئەوەی ویستووە، بێ کچی داربی هیچی وەرنەگرتووە. ئەو جارەی بابی بە بۆنەی یەکەم بوونی، پایسکلی بۆ کڕی، سوێندی خوارد پێ ناخاتە سەری، تا بۆ کچی داربیش نەکڕێ، کوڕ دەڵێ:

گوڵناریش وەک من یەکەم بووە.

باب بە سەر خۆیدا شکاوە، بە کوڕی گوت:

تەواو، دڵنیابە لەمەودوا هەرشتێک بۆ تۆ بکڕم، بۆ گوڵناریش دەکڕم.

تا پایسکل بۆ کچ نەهات، کوڕی پایسکلی خۆی نەهێنایە دەرێ. زوو زوو دیاری بۆ منداڵانی داربی دەهات، خۆ لە جەژنان و لە کۆتایی ساڵان دیاریی گەورەیان بۆ دەهات، ئاخر منداڵانی داربی هەموو ساڵ بە یەکەم دەردەچوون.

کوڕی داربی چی بۆ خۆی ویستبا، بۆ کچی داربیشی دەویست، ئەو رۆژ و مانگانەی کە دەیدیت زگی دایکی بەرەبەرە گەورە دەبوو، تێگەیشت کە خوشکێک، برایەک بە رێوەیە، تێگەیشت ئەوەش لە سایەی هاتنەوەی تۆڵەستێنە،

لە دڵەوە دەیخواست کە دایکی کچی داربیش زگی گەورە با، جارێک کچ گوتی:

ئەگەر منیش بابم مابا، دایکم زگی دەبوو.

کوڕی دانەما، وەکات:

ئەوە نیە تۆ برایەکت هەیە.

کچی داربی:

وایە، بەڵام...

ئەو سەر لە ئێوارەیەی دایک بەرەژانی هاتێ و باب چوو بە دووی ماماندا، دایکی کچی داربی بە دەوریەوە بوو. کوڕ زراوی چوو، قسەی دایکی لە بارەی کوژرانی بابی کچی داربیی بیرکەوتەوە، ترسا بابیشی بە دەردی بابی کچە بچێ. پاڕایەوە، بە دزی لە پەنای دەرگای حەوشە لە خودا دەپاڕایەوە و نزای دەخوێند کە باوکی تووشی بەلایەک نەبێ و بە زوویی بە مامانەوە بێتەوە. پیری گەڕیدە دیارە هەستی بە نیگەرانیی کوڕ کردبوو، بانگی کردە لا خۆی، ماچی کرد و پێی گوت:

هیچ نیە، کەمێکی دی خوشکێک یان برایەکت بۆ پەیدا دەبێ.

کوڕ دەیویست بڵێ، من خەمی بابمە. لەو دەمە باب بە ژنێکی بە تەمەنەوە هاتە ژووری، کوڕ خەنی بوو، ئۆخەیش

باب بە ساخی هاتەوە. نها باب و کوڕ لە هۆدەکەی پیری گەڕیدە دانیشتوون و چاوەڕوانی رزگاربوونی دایک دەکەن. زۆری پێچوو، زیرەی منداڵ نەهات، پیری گەڕیدە. ئاهێکی قووڵی هەڵکێشا:

ئاخ! ستی نەما، وەرنا دەمێ رزگاری کردبوو.

باب کە زۆر شلەژابوو:

وایە، مامان نەبوو بگاتە دایکم.

کوڕ ئێستا لە خەمی دایکیدایە، بیستبووی کە ژن هەبوو بە سەر منداڵەوە چووە، ترسا، زۆر ترسا، چۆوە لای دەرگا و دەستی بە نزا و پاڕانەوە کرد، پاڕانەوە بۆ دایک. هاواری دایکی دەبیستێ، ئۆقرە ناگرێ، لەودەمە کچی داربی هات، بە هاتنی وی کەمێک ئارامبۆوە، باب بانگی دایکی کچی داربی دەکات، پێیدەڵێت:

نەیبەینە خەستەخانە؟

وەڵامەکە (نا) بوو، دەچنەوە هۆدەکەی پیری گەڕیدە، زۆر نابا، قیژەیەکی ناسک، خوشی بە ماڵدا دەپژێنێ، کوڕ گوێی لە دەنگی دایکی کچی داربییە:

کچێکی جوان زور جوان...

کوڕ لە خۆشیدا جێ بە خۆی ناگرێ، کچ لەو دڵخۆشترە و دەڵێ:

خۆشە، خوشکت هەیە.

دایک لە قیژە وهاوار ناکەوێت، ژان بەری نادات، کوڕ لە بیری نەماوە چەندی برد، گوێی لێیە ژنێک دەڵێ:

خوشک پێش برا کەوت.

کوڕ ئەگەر پیری گەڕیدە نەیگرتبا، لە خۆشیدا باڵی دەگرت، ئەو شەوە چ شەوێکی تایبەت و دەوڵەمەندە لە تەمەنی کوڕی داربی، شەوێکە دووبارە نابێتەوە، لەو شەوەدا خوشک و برایەکی لە ئاسمانەوە بۆ هات، ئا هەر تەماشای ئاسمان و ئەستێرەی دەکرد، وای هەستدەکرد دوو ئەستێرە رژاونەتە حەوشەکەیەوە، کوڕی داربی دەبینێ کچی داربیش چەپڵە لێدەدا و لە خۆ هەڵدەدا، لەپڕ کوڕ گوێی لە دەنگێکی سەیر بوو لە چ دەنگان نەدەچوو، نە دەنگی مرۆڤ نە هی ئاژەل و باڵندان، نەهی گیاندار نە هی بێگیان، دەنگەکە لە شێوەی پرسیار بە کوڕەی گوت:

هەردوو ئەستێرەکە بۆ خۆت؟

کوڕ ترسا، لە دەنگی ئاسمانیی لە هیچ دەنگ نەچوو، ترسا، لەرزی، بابی لە باوەشی گرت:

چیتە کوڕم! دەبێت دڵت خۆش بێ خوشک و برات بۆ بوو.

کوڕ بە دەم لەرزەوە:

ئەستێرەی دووەم با بۆ گوڵنار بێ

باب بەپەشکاوی:

چی دەڵێی تۆ؟! ها ئاو بخۆوە و بخەوە.

کوڕ دواتر چەند کەرەتێ بە کچی دەگوت کە من خوشکێکم بەسە، حەزدەکەم براکەم بۆ تۆ بێت، بەڵام کچ بەوە رازیکرد کە برای وی بێ، بەڵام با هەر لای ئێوە بێت. کچ برا ساوەکەی کوڕی داربیی زۆر خۆشدەویست، رۆژی چەند جارێ دەچووە سەر لانکەکەی تێر تێر ماچی دەکرد و بە برا جوانەکەم بانگیدەکرد، خۆ لە سەیرانەکانیش هەر لە باوەشی وی بوو.

باب نەورۆزان ترۆمبێلێکی گەورەی سەر کراوەت دەهێنا، هەتا دەیگرت دەر و دراوسێی تێدەکرد. پیری گەڕیدە لە پێشەوە دادەنیشت، نەورۆزێک نەنە خانیش هات، گوڵێش بە چەقۆوە هەر لەگەڵ بوو، هەموو پێیاندەگوت:

نێرە هەیتە.

منداڵانی داربی بە تەنیشت یەکەوە دادەنیشتن، براکەی کوڕی داربی لە کۆشی کچی داربی بوو، منداڵانی داربی لە ناو گژ و گیای نەورۆزدا بە دوای یەکدا رایاندەکرد، راکە راکی ئاقاری تا چاو بڕدەکا کەسک، لە چاوی کوڕی داربی هەر کەسکە و ناچێتەوە.

وەرزەكان گەمە بە داربی دەكەن، گۆپكە دەكات، پەلك دەكات، پڕ پڕ، كەسك كەسك. شنە بایەكی لێوە دێ فێنك فێنــك. زەرد هەڵــدەگەڕێ، بــایەك دێ گەڵای وەریــو بە كۆڵاناندا وەردەكات. نەرمە بارانێك داربی رووتدەكاتەوە، جاروبـاریش بەفـر دەگـرێ. منـداڵانی داربـی لە بـن پەلكـی وەریوی بی، سەریان بە سەر كتێبەوە، پەنجەی وردیلە بە سەر وێنەكانەوە:

+ ئەها ئەو كچە بە تۆ دەچێ.

- ئەو كوڕەش دەڵێی تۆی!

+ نا، ئەو كوڕە سپیە.

- تۆ لەو جوانتری

+ ئەدی شەلە نەیگوت...

- بەڵام لۆبیا خۆشـە، مـن زۆر سبەینان لۆبیـا دەخـۆم، لۆبیا و هەنجیر زۆر خۆشن.

كـوڕ قسـەی شامینۆكفرۆشـەكە زۆر كـاریتێكردبوو، لە دڵـی دەرنەدەچـوو، نە شـیرینیی هەنجیـر نە حەزی كـچ بـۆ لۆبیــا و هەنجیـر، لە دڵـی دەرنەدەكـرد، ئـازازی دەدا. بەو هـۆیەوە و بەوەشـەوە كە زۆرانێـی لـێ قەدەغە كردبـوون، زۆر رقـی لە شـەلە دەبۆوە، بەو بـا مەنجەڵـی شـامینۆك و لۆبیـای لە دەسـت بەردەبۆوە و هەر قلە نۆك و لۆبیـایەك

دەکەوتنە سووچێکی کۆڵان. کوڕ هەستیدەکرد، شەلە غەدرێکی گەورەی لێکردووە، دەبێ تۆڵە بکاتەوە، وەک چۆن بابی تۆڵەی لە جاشی گەورە کردەوە، کوڕیش ئاوا دەبێ تۆڵە لە شەلەی گەورە بکاتەوە. لە دیدی کوڕەوە، شەلە وەک جاشی گەورە گەورە بوو، وەک جاشی گەورە گوناهبار بوو. زۆر جار دەهاتە سەری بە بابی بڵێ و بچێ بە گوللەیەک لە خوێنی بگەوزێنێ، پەشیماندەبۆوە، قسەی بابی بیردەکەوتەوە:

خۆت بە من هەڵمەکێشە.

جگە لەوەش بیریدەکردەوە لەوەی ئەگەر شەلە بمرێ، ئەدی کێ شامینۆک و لۆبیا بفرۆشێ؟ ئەگەر لۆبیا نەما، کچ سبەینان چی بخوات! ئەدی خۆی چی بخوات! دەزانی چەند تامەزرۆی شامینۆکە. کوڕ یەک لۆبیافرۆش و شامینۆکفرۆشی لەگەڕەک دیتبوو ئەویش شەلەیە، ئەگەر شەلە بکوژرێ، نە لۆبیا دەمێنێ نە شامینۆک. بەڵام دەبوو تۆڵە لە شەلە بکاتەوە، بە رژانی شامینۆکیش بێ، دەبێ تۆڵە بکاتەوە. لۆبیا نا، نابێ لۆبیا برژێ، کچ حەزی لە لۆبیایە، دەبێ تۆڵە بکاتەوە، ئەگەر بە سەر شکاندنێکیش بێ، دەبێ تۆڵە لە شەلە بکاتەوە.

سبەینێیەکی بارانـاوی، کەمێک زووتر لە وادەی رۆیشتن، جانتای هەڵگرت و رێی قوتابخانەی گرتە بەر. نەدەبوو کچەی لەگەڵ بێ. دەیزانی لەو ساتانە لە کوێ

تووشــی شــامینۆکفرۆش دەبێ، دارلاسـتیقەکەی لە بەرکـی گچکەی جانتاکەی نابوو، ڕێک لەو سـەرە کۆڵانە، تووشـی بە تووشی شەلەوە بوو کە لە نەخشـەکەی خۆی بوو، ئەو سـەرە کـۆڵانەی بە سـەر سـاکەگۆرەکەدا دەیڕوانـی، سـاکەگۆڕی ئەو دیـوەی مزگەفـت. کـوڕ بە دیتنـی شـەلە، دەسـتی بەگیرفانیدا کـرد، مـابوون، سێ بەردەکە مـابوون، داینـاوە لەو سـێ بەردە، ئەگەر دەسـتیشـی شـکابێ، بەردێکیـان بە سـەری دەکەوێ و دەشـکێ. کـوڕ داینـاوە نیشـانە لە بن کـلاوەکەی بگرێ، شـەلە کلاوێکی لە سـەرە، هەر ئەوەتـا تەوقـی سـەری گرتـووە، سـێبەری لە لـووتی کردووە و ڕێی لە باران گرتووە چاوی تەڕ بکـات، دەیەوێ لە شەلە ڕەت بێ و لە دواوە لە پەنای دیوارەوە، نیشـانە لە پشـتی سـەری بگرێـت، شـەلە دەڵێـی بەوەی زانیـوە! ڕوودەکاتە کوڕی داربێ:

+ئـای! کـوڕی تۆڵەسـتێن، ئەوە بە تەنیـای، ئەدی کـچە جوانەکەت بەجێهێشتووە؟!

-نا، ئێستا دێ.

کـوڕە سـاردبۆوە، خـاوبۆوە، پەشـیمانبۆوە، بەردەکـانی بەرکـی فڕێدا، یەکپێ غـار، غـار، دەیویسـت بگـاتەوە کـچە، دەیویسـت دارلاسـتیقەکەی بباتەوە مـاڵێ. کـچەی دیـت، لە دەو چەمەکە، لەو شـوێنەی پێچـدەکاتەوە ڕاوەسـتایە، چەتـرەکەی هەڵـدایە، ڕەنـگە لچکـی چەتـرەکەش کـوڕی

لێشـــاردبێتەوە و زوو نەیـــدیت، لەو دەمەش دایکـــی وا لە سیلەی خانووە راوەستاوە، لە دوورەوە:

+ کــورم، ئەوە لە کـوێ بـووی؟ چمـا نەچــوویە دوای گوڵنار؟

-با، نا..

زمانی تێکئالا، بەڵام کچ فریای کەوت و گوتی:

بەو دیوەدا هات، من نەمدیتبوو.

لە رێیــێ، کـــچ وازی لێنـــاهێنێ و ســـەد جـار پتـر ئەو رۆیشتن و بانگنەکردن و هاتنەوەی لێپرسی، کوڕ:

نازانم، چووم، هاتم، لۆ؟

ی دەگوتەوە، وەها شـێوابوو، زاری تێکئالابوو، دەهـاتە ســەر زمــانی راســتییەکە بڵــێ، دەیگێــڕایەوە، نەیــدەگوت. پێیوابـــوو ئەوە نهێنییەکـــی ترســـناکە و نـــابێ کەس کەس بیزانێ، بە کچی داربیشـەوە. زۆر نەمـایە بگەنە قوتابخـانە، دارلاستیقی بیردەکەوێتەوە، نـاکرێ بیبـاتە قوتابخـانە، چمـا مامۆسـتای ببینــێ حەسـیرمەیدانی ناکـات، هەڵوەسـتەیەک دەکات، کچ دەپرسێ:

+ چ بوو، چیت لەبیرکردووە؟

– دارلاستیق.

+ دەتەوێ دارلاستیق بهێنیە قوتابخانە؟

- نا، لە ناو جانتاکەمە.

+ ئۆی! بیێنە لێرە لە بن خۆڵ بیشارینەوە.

ئەهـــا منـــدالآنی داربـــی، لە دەو رێ دانیشـــتوون و بە داررووچکە زەوی هەڵدەکۆڵن و چاوێکیشیان لە دەوروبەرە، نەک کەسێک چاوی لێبێ، شاردیانەوە.

ئەو رۆژە هەست و هۆشی لای کچە بوو، هەستیدەکرد درۆی لەگەڵ کردووە، شتێکی لێ شاردۆتەوە کە پێویست بە شـــاردنەوە ناکـات، بەڵام لە نـاو پـۆل دەبـوو ئاگـای لە خۆی بێ، دەترسا بە دەردی گۆرین بچێ.

لە هـــاتنەوە، بە جێـــی دارلاســـتیق نەکەوتـــنەوە، زۆر چاویـان گێـڕا، بڵنـداییەک ببینـنەوە، نەیانـدیتەوە، ئەو نـاوە یەکپارچە قوڕ و ئاوە، باران باریبوو، کچ دەڵێ:

+دەبوو جێیەکەی نیشان بکەین.

-وازی لێبێنە، نایبینینەوە.

لەو دەمە گـولێ پەیـدابوو، بە پێکەنینێکـی شـیرینەوە گوتی:

چەند جوان لێکدی دێن.

کوڕ بەوە شاگەشکە بوو، لەو ڕۆژەوە گوڵێی پتر بە دڵدا چوو.

دوو بەهار بە سەر شاردنەوەی دارلاستیق تێپەڕیوە، کچ لە بیریچووەتەوە، بەڵام کوڕ لەگەڵ ئەوەی دارلاستیقێکی باشتری هەیە، کەچی هەر کەڕەتێ لەو جێیە نزیکدەبنەوە، چاوی لێ دەگێڕێ، دەڵێتە کچ:

حەیف، دارلاستیقەکەم نەدیتەوە.

کچ دەڵێ:

ئەرێ دارلاستیق بچێنی ناڕوێ؟

کوڕ دەڵێ:

ئەگەر بڕوێ، بەردەدا؟

کچ دەڵێ:

ئەگەر بەر بدا، لەگینە بەرد بگرێ.

لە گەڕانەوە لە دەو کەندەکە، نزیک ماڵێ شتێکیان لە ئاسمانێ دیت، پێشتر نەیاندیتبوو، وێدەچێ دیتبێتیان، لێ وەک ئەو جارە نەبووبێ و چاویانی بە ئاسمانەوە گرێنەدابێ. منداڵانی داربێ چاویان بە ئاسمانەوە بەسترا و لێنەدەبۆوە، لە سەر کەندێ کە کەمێ ئاوی پێدا دەڕوات، بە

تەنیشت یەکەوە، جانتا لە شان، چەتر لە دەست، روو لە چیا، برژانگیان بە ئاسمانەوە داکوتراوە، کچ دەڵێ:

دەبینی، چەند جوانە!

کوڕ دەڵێ:

پێشتریش ئاسمان شتی وای هەبووە؟

کچ دەست دەبات بۆ سەری و قردێلەکەی لێدەکاتەوە، دەست بە قژی تەڕی دادێنێ:

نازانم، لەوانەیە.

کوڕ تەماشایەکی کچە دەکات و دەڵێ:

زۆر جوانە، زۆر.

لەو ساتە دایکی کوڕ دێتە دەرێ و لەو بەرەوە تەماشایەکی ئاسمان دەکات و دوایی لە منداڵانی داربی دەڕوانێ و دەڵێ:

ئەوە بۆ راوەستاون و ناپەڕنەوە، تەماشای پرچی ئایشە و فاتمە دەکەن!

کورە پێشتر (پرچی ئایشە و فاتمە) ی لە زاری دایکییەوە بیستبوو کە جوانترین پرچن و تاسەت هەر رەنگێ بکەی، لەو پرچە دەیانبینیەوە، بەڵام نەیدیتبوو، یان

بەو جۆرەی نەیدیتبوو، پتر لە ئایشە و فاتمە وردبۆوە، کچ هەڵیدایێ:

چما پرچی ئایشە و فاتمە لە ئاسمانییە؟

دایکی کوڕە دەڵێ:

پرچی ئایشە و فاتمە لە عەرد بوو، دوایی چووە ئاسمانێ.

کوڕ لەو دەمە تیچاوێکی دەکەوێتە سەر پرچی کچ، دەبینێ ئەو رەنگانەی لە ئاسمانێ هەن، هەمان ئەو رەنگانەن کە لە پرچی کچەش هەن. جوانتر ورددەبێتەوە، وایە پرچی ئایشە و فاتمە لە ئاسمانێ نا، لە سەر زەویشن، لە دەو کەندەکە، بە تەنیشت خۆیەوە، هەیە. وردتر دەبێتەوە، لێی تێکدەچێ، ئایا ئەوەی لە ئاسمانە پرچی ئایشە و فاتمەیە یان هی ئەوەی لە تەنیشتیەوە پرچی کچی داربی! دەبینێ کەزییەک لەوەی ئاسمان شۆڕدەبێتەوە، چاوی لێیە دێ دێ، سەری دەگاتە سەر کچ، لە کەزیی کچ دەئاڵێ، بە بەر چاوییەوە کچ بەرزدەبێتەوە.

دەپەشۆکێ، خۆی هەڵدەدات، دەستی بگاتە جێیەکی کچ و نەهێڵێت بفڕێت، دەست نەگەیشتێ. زاری داپچڕی هاوار بکات، دەنگ نەهاتە دەرێ، ئەوە کێیە قورگی گرتووە! دەست دەبات، قورگ هیچی پێوە نیە. لە چاوی کوڕەوە کچ هەوکە بووەتە ئامێزێ کەزی، بووتە بەشێک لە ئایشە و

فاتمەی ئاسمانێ. کوڕ واقوڕماوە، لە جێی خۆی چەقیوە، نە جوولەی هەیە نە دەنگ، هیچ نابیستێ، تەنها کچی بوو بە کەزی لە ئاسمانێ دەبینێ. هەستدەکات دەستێک لە سەر شانیەتی، بە ئاستەم دەبیستێ:

ها، چیت بەسەرهات!

دەنگی کچەی ناسیەوە، بە هەناسەبڕکێوە:

کەی هاتیەوە؟

کچ:

من؟

کوڕ بە شەرمدا کەوت، سەریهەڵبڕی دایکی بەرانبەریان وەستاوە، تفی قووتدا، دەڵێتە دایکی:

دایە، ئەوە پرچی ئایشە و فاتمە نیە؟

دایک دەڵێ:

با، پەلکەزێڕینەشی پێدەڵێن.

دایک لە مەبەستی کوڕ تێنەگەیشت، کوڕیش وەک بڵێی شەرمیکرد، نەیگوت پرچی گوڵنارە. کوڕ دەڵێی گوێی لە دەنگی دایکیەتی بانگیاندەکاتەوە، بەڵام تێکەڵی پەلکەزێڕینە بوونە و دابڕاون. کچ دوو چاوی بە ئاسمانەوەیە و لە ڕەنگ، لە پرچی ئایشە و فاتمە بزربووە، بەڵام کوڕ کە

سەرەتا دوو چاوی بە ئاسمانەوە بوو، دابوویە رەنگەکانی پرچی ئایشە و فاتمە، دواتر چاوێکی لە ئاسمان بەجێهێشت و چاوەکەی دی خستە سەر پرچی کچە، ئێستا دوو چاوی تێکەڵی پرچی کچە، ئاسمان نابینێ، کچ دەڵێ:

ئەما، ئاسمان پرچی ئایشە و فاتمەی پێوەنەما، با برۆین.

کوڕ رادەچڵەکێ، بەڵام چاوی لە سەر پرچی کچەیە، بە شلەژاوی دەڵێ:

نا، هێشتا ماوە، من دەبینم.

کچ حریت حریت پێدەکەنێ:

تۆ شێت بووی! کوا پرچی ئایشە و فاتمە؟

کوڕ چ ناڵێ، دووریش نیە لەو ساتە پەلکەزێڕینەییە، لەو ساتەی لەگەڵ پرچی کچە و ئایشە وفاتمە تێکەڵ بووبوو، تێکەڵ شێتایەتیش بووبێ، کوڕ دەبینێ دایک لەو بەرەوە چاوی لە سەریانە، ورد لێیان دەڕوانێ، دایک دەڵێ:

چەند جوانن، خۆزگە کامێراکەی بابت لێرە دەبوو، وێنەیەکم دەگرتن.

کچ پرچی رادەوەشێنێ و دەڵێ:

ئەگەر لە وێنەکە پرچی ئایشە و فاتمە دەربچووایە، زۆر جوان دەبوو.

دایک دەڵێ:

ئای گوڵناری گوڵ چەند جوانی لێ دەزانی!

کوڕ بێدەنگە، هێمان لە ناو رەنگەکانە، وێنەکە ئەوەی دایکی وکچی داربی حەزیانکرد بیگرن، بە قسەی هێنا، بەڵام تەنها خۆی گوێی لە قسەی خۆی بوو:

ئەگەر بابم لە دواوە وێنەی گرتباین، ئێمە و ئاسمان جوان دەردەچووین.

لەو رۆژەوە لە هزری خۆی وێنەیەکی وای کێشا، زوو زووش پیشانی خۆی دەداتەوە، جار لە دوای جاریش لە چاوی کوڕ وێنەکە جوانتر و پڕ رەنگترە. ئەوەتا دوومنداڵ بە تەنیشت یەکەوە، بە دیار خۆر و لە ناو نمەی باران بە شێوەیەک تێکەڵی رەنگەکانی پرچ بوونە، ناناسرێنەوە، هیچ شتێک ناناسرێتەوە، وەک بڵێی زەوی و ئاسمان تێکەڵاوبووبن. لە چاوی کوڕەوە ئەو وێنەیە بێ هاوتایە، وێنەیەک نیە لەو بچێ. دواتریش وێنەکەی لە زۆر جێ بە هەڵواسراوی دیوە، دەبینێ بە پسانییەو بە قەڵاتەوەیە، لە سەر باریکی بە منارەی چۆلییەوە هەڵواسراوە، بە منارەی مزگەفتەکەی دەروێشەوە بینیویەتی، جارێکیش بە بەرۆکی مامۆستای فیزیاوە دیتی. کوڕ لەو رۆژەوە، لە رۆژی

پەلکەزێڕینەوە، هۆگری پرچی کچی داربی بوو، لە یاری، لە ڕێی قوتابخانە، لە نزیک، لە دوورەوە تیچاوێکی لە سەر پرچی کچە، وێدەچێ کچەش هەستییپێکردبێ.

لە ڕۆژی پرچی ئایشە و فاتمەوە، کوڕ ڕۆژ ڕۆژ پتر هۆگری پرچی کچە بوو، بەو با هەمیشە لە پێش چاوی با و دەستی لێدابا. زۆر کەڕەت لە دەمی گەمە دەیویست دەست بگەیەنێتە پرچی، دەیکێشایەوە. سەر لە سپێدەیەک لە درزی دەرگای حەوشەوە دیتی، پرچی کچە لە ناو دەستی دایکی کچە و نەرم نەرم دایدەهێنێ، لەو سپێدەوە حەزی پرچ داهێنانی چووە دڵی، لە دڵی خۆیەوە دەیگوت:

یەک جار پرچی کچی گوڵنار دابهێنم بەسمە.

هەرێی بە خۆی دا شانەیەک بە پرچی کچەدا دابهێنێ، زۆر کەڕەت کە کچ دەهاتە ماڵیان دەچوو شانەیەکی دەهێنا، بە دیار کچەوە پرچی خۆی دادەهێنا، لە کچە نزیکدەکەوتەوە، ئێستا نا ئێستا شانەکە دەگەیەنێتە پرچی خاوی، دەچووە پێشێ، زاخی نەدەکرد، دەستی دەلەرزی، دەکشایەوە، ئەستەمە.

کوڕ داخی لە ڕۆژانی پێش شەرم دەخوارد، ئەو ڕۆژانەی بە ئاسانی دەیتوانی دەست بە قژی کچەدا دابهێنێ. بۆ وای نەدەکرد؟ ئەدی ئەو جارانەی لە گەرماوی خانزادێ، خۆ بە تەنیشت یەکەوە ئاویان بە خۆیاندا دادەکرد، بۆچی دەستی بە ناو پرچیدا نەدەگێڕا؟ حەیف!

ئەورۆ رۆژی چوونە گەرماوە، دنیا گەرمە، لە هاوینان ژنان حەفتەی رۆژێ دەچنە گەرماوی دەرێ، بەڵام بە کوڕ چی! ئەوەتا ژن و منداڵ بەرێکەوتن، کچ دەستی بە دەستی خانزادەوە. ماوەیەکە دایک کوڕ لەگەڵ خۆی ناباتە گەرماوێ، کوڕ لەوە تێنەگەیشت، دەیویست لە دایکی بپرسێ، شەرمیدەکرد، چووە بن داربی، دەیەوێ لە پیری گەڕیدە بپرسێ، گوێی بە رادیۆوە ناوە:

دایکم من ناباتە گەرماوی بازاڕێ، لۆ؟

پیری گەڕیدە دەنگی رادیۆکە پتردەکات:

چی چی!

کوڕ دەڵێ:

دەڵێم...

پیری گەڕیدە دەستی لە رادیۆکە شل دەبێ:

پەکوو، ئای، نابێ...

کوڕ دەبینێ پیری گەڕیدە زۆر تێکچووە، لە پرسیارەکەی پەژیواندەبێتەوە؟

قەیناکە، ناچم ناچم.

لەو ساتە لە رادیۆکەوە گۆرانی:

هەڵمبگرن بە سێ و چوار

بمبەن بۆ گەڕەکی لای خوار

شینم بۆ بکەن ناسک و نازدار

هەی بە ناز بە ناز بە ناز...

پیری گەڕیدە دەڵێتە کوڕ:

کوڕم بیستت! مرد...

کوڕ گەرما و پرسیاری لەبیرچۆوە، بووە هاوبەشی خەمی پیری گەڕیدە و تا کچ لە گەرماو هاتەوە بە تەنیشتیەوە دانیشت و گوێیان بە رادیۆوە نا. کوڕ لە بیریەتی پیری گەڕیدە نا، هەموو گەڕەک خەفەتبار بوون، زۆر کەس هەنسکیان دەدا، فرمێسکی بە چاوی خانزادەوە دیت. کوڕ لە بیریەتی بابی و چوار پێنج پیاو دەوریان لە پیری گەڕیدە دابوو، نەنە خانیش دانیشتبوو. لە بیریەتی پیری گەڕیدە قسەی هێنابووە سەر کۆمار، هەر یەکەو هەڵەیەک لە هەڵەکانی کۆماری دەژمارد، جوانی لەبیرە کە پیری گەڕیدە گوتی:

+ هەڵەیەکی گەورەتان لە بیرکرد.

- چیە ئەو هەڵەیە؟

+ کۆمار ئەو دەنگەی لەدەستچوو، نەناسی، بستێک لێی دووربوو نەیدیت و نەیناسی، دەبوو زیرەک لە کۆمارەوە ئەی رەقیبی چرپیا، ئەگەر ئەو چرپیای، کورد هێندە لە رەقیبەکەی نەدەترسا و پتر بەرگری لە کۆمار دەکرد، هەینی منیش لەوێ بووم، منیش بەشێ بووم لە کۆمار، بۆیە نەمناسی.

کوڕ لە بیریەتی پیاوێک گاڵتەی بەو قسەیەی پیری گەڕیدە هات و گوتی:

تەح! کۆمار بە دەنگی وی دەپارێزرا!

پیری گەڕیدە بزەیەکی ژەقن ئاسای بۆ کرد:

تۆ چ لە گۆرانی دەزانی! جاری وا هەیە گۆرانییەک کاری سەد سێتیر و برنۆ دەکات.

پیری گەڕیدە گوتی:

من حەفتەیەک پرسە بۆ ئەو دەنگە دادەنێم.

کوڕ چاوەڕێ بوو بچنە مزگەوتی نزیک گۆڕستانەکە، بەڵام وا نەکەوتەوە، ئەو حەفتەیە شەو و رۆژ لە دەنگگرەکەی پیری گەڕیدەوە دەنگی ئەو دەنگە هات.

پیری گەڕیدە گوتی:

دەنگی جادوویی پرسەی لەو شێوەی دەوێ.

لەو حەفتەیە کچ زوو زوو دەهاتە بن داربی، لەگەڵ کوڕ گوێیان دەدایە گۆرانی، نەنە خانیش لەوێ بوو، گوڵێش بە چەقۆوە دەهات، براکەی کچی داربی دیتبای لە دەرێیە بانگی دەکردەوە، دەبوو بچێتەوە ماڵێ، بە قسەی نەکردبا لێی دەدا.

وای لێهات کوڕ حەزیدەکرد قوتابخانە زوو بێتەوە، هەرنا لە ڕێیی لە هەردوو سەر پێکەوە دەبوون و تیر قسانیان دەکرد. جارێک بە بەر چاوی کوڕەوە تیتکی ڕاکێشا، کچ گریا، کوڕ بەوە تێکچوو، بڕیاریدا تۆڵەی بکاتەوە. لە چاوی کوڕەوە گریانەکەی کچ لە هی نەنەخان دەچوو، ڕۆژی پێشتر، دیتی وا لە بن داربی بە تەنیشت پیری گەڕیدەوە بە کوڵ دەگری، سەر مەچەکی نیشان دەدا و دەڵێ:

ئەها ئەوە سوڵتانە شێتی کچم لێیدام.

پیری گەڕیدە تەماشای دەستی دەکات:

پەکوو! لەسەرچی لێیدای؟

نەنەخان بە دەم هەنسکەوە:

دەڵێ، نابێت بچیتە لای...

کورِ لە بن داربی هەر هێندەی بیست، بەڵام دوایی لە دایکی بیست کە کچەکەی پێیوایە نەنەخانی دایکی حەز لە پیری گەڕیدە دەکات.

کورِ تۆڵەی کچی کردەوە، ئێوارەیەک هێشتا تاریک دانەهاتبوو، لە سیلەی خانووی خۆیانەوە بۆسەی بۆ برا دانایەوە. دیتی جلەوی چێڵێکی بە دەستەوەیە، سێرەی لە سەری گرت، دارلاستیقی تێگرت و رێک لە گوێی برای دا، بەڵام لە ترسی ئاشکرابوون نەیوێرا وەڵامی وجوێنەکەی بداتەوە:

ئەوە کێ بوو؟ هەی لە ......

کورِ بەو تۆڵەیە زۆر دڵی خۆش بوو، بەوەش کە نیشانەی راستە، ئەوە یەکەم بەردی کورِ بوو کە لە پێناوی کچدا هاویشتبێتی.

سبەینێکەی کچ بە هەڵەداوان هات و گوتیە کورِ:

ئێمە چێڵمان کریوە، ماستمان دەبێ، هەموو رۆژێک جامێکی گچکەش بۆ تۆ دێنم.

کورِ ویستی بڵێ: لە پێش تۆ دیتم.

گێڕایەوە، ویستی بڵێ: براکەت سەری نەشکا.

گێڕایەوە، ترسا لەوەی بەردەکە ئاشکرابێ، هەر هێندەی گوت:

منیش دەڵێمە بابم چێڵ بکڕێ.

کـورِ بڕیاریـدا تـۆڵەی نەنەخـانیش بکـاتەوە، دەبینـێ کچەکەی لە پێش دەرگای مـاڵی گوڵنـار لە سـەر ڕۆیشتنە، خـۆی دەگەیەنێـتە پشـت ماڵیـان، لە سـیلەی خـانووەوە نیشـانەی لێـدەگرێ، تفەنگـی تۆڵەسـتێن هەڵە بکـات دارلاستێکی کوڕ هەڵە ناکات، ڕێک لە سەر چۆکی چەپی دەدا، سـوڵتان دەسـت بە چـۆکیەوە دەگـرێ و بە ئـای و وایەوە:

ئەوە چ توخمە سەگێک بوو، بە دەستی خۆم ئاوی بۆ گەرم بکەم.

کوڕ لە توخمەکە تێگەیشت، بەڵام لە ئاو گەرمکردنەکە نا، دواتر دایکی بۆی ڕوونکردەوە.

منارە چێڵی لە بیری کوڕی داربی بردەوە، باب گوتیە کوڕ:

تۆ چوویتە ناو منارەی چۆلی؟

کوڕ بە سەرسامییەوە:

چما، منارە ناوی هەیە؟ من هەر لە دەرێوە دیتوومە.

دایک دەڵێ:

وەڵا منیش هەر جاری گۆڕین.

کوڕ ویستی بڵێ، با گوڵناریش بێ، دەتگوت شەرمی کرد گێڕایەوە، باب بە هانایەوە هات:

هەر ئێستا هەر چوارمان دەچین.

دایک دەستی بە زگی خۆیدا هێنا، باب بزەیەکی شیرنی هاتێ.

هەر سێکیان بە رێکەوتن، دایک نەچوو، لەو جادەیەی کە پێش هاتنەوەی تۆڵەستێن سنووری نێوان سەربازخانە و گوڵێنگدارەکان بوو، سواری پاس بوون، هەرسێکیان بە تەنیشت یەکەوە سوار بوون، کوڕ و کچ و خۆیان کورژدەکردەوە، نەیاندەهێشت لەشیان بەر یەکتر بکەوێت. دابەزین، کوڕ و کچ بە دەنگی نزم تابلۆی سەر فرۆشگا و بالەخانەکانیان دەخوێندەوە، لە دووکانێک خۆشاوی مێوژ دەخۆنەوە، لە سەری بە خەتێکی درشت نووسراوە:

مام زۆراب

کچ گوتی:

وای، دەڵێی مام زۆرابی ناو کتێبە!

کوڕ دیتی سەری کەپووی کچ بە ئاوی مێوژە، جوانییەکی وای دابووە کەپوو، لە بیری نەچێتەوە، بە دەم رێی منارەوە لە نێوان منداڵانی داربی باس هەر باسی خۆشاوی مام زۆرابە، باب گوتی:

من زۆر جار لە چیاش بیرم لەو خۆشاوە دەکردەوە.

گەیشـــــتن، پـــێش چـــوونە ژوورەوە، بە دەوری دا سـووڕانەوە، دوو دەرگـای بـێ دەرگـای هەیە، دەرگـایەک روو لە رۆژهەلات، دەرگـایەک رووەو رۆژاوا، نـاوی پـیس دیـارە، پـڕ ریـخ و قشـپلە. لە رۆهەلاتەوە چـوونە ژووری، پێبلکە دەلێی ماری پێچاو پێچە، بە ئاسماندا چووە، کوڕ بە حەپەساویەوە دەلێتە باب:

ئەوە چیە! کێ ئەوهای کردیە؟

باب بە پێکەنینەوە دەلێ:

ئەوە پێبلکەی شەیتانە، دەوێرن پێیدا سەربکەون؟

مندالانی داربی دادەمێنن، وەلام نادەنەوە.

باب دەلێ:

مـن یارمەتیتـان دەدەم، دەچینـە سـەرێ، پێبلکە تـا سـەر سـەرێ دەچێ.

مندالانی داربی دیارە دەترسن، بەلام چ قسە ناکەن.

باب دەلێ:

دوو رێگـا هەیە بـۆ چـوونە سـەری، ئێـوە یەک رێگـا دەبینن.

منداڵانی داربی هەر یەک ڕێ دەبینن و چ لە قسەی باب تێناگەن، چاویان مۆلەقە و دەمیان داپچڕیوە، باب بە کچ دەڵێ:

تۆ لێرە بە، هەوکە دێمە خوارەوە.

کوڕ پێش خۆی دەدات و سەر دەکەون، تەواوێک سەردەکەون، تۆڵەستێن دەڵێ:

لێرە نەجووڵێی هەتا دەچم گوڵناریش دێنم.

کوڕ خۆی بە دیوارەوە گرتووە و جوولەی لە خۆی بڕیوە، چاوەڕوانە بابی بە کچەوە سەرکەوێتەوە، باب بە تەنێ هاتەوە، کوڕ بە شلەژاویەوە دەڵێ:

ئەدی گوڵنار!

باب بە پێکەنینەوە:

خەمت نەبێ، بەر لە تۆ دەگاتە سەرێ.

کوڕ سەری سوڕمایە و نازانێ چ بڵێ، دەستیان بە هەڵگەڕان بە پێبلکەی شەیتان کردەوە، ڕێ ناخۆشە، پێبلکەکان لە زۆر جێ شکاون و رووخاون، دەبێت زۆر ئاگات لە خۆت بێت، کوڕ دەترسێ زۆر دەترسێ، بەڵام زۆر بە سەر خۆی ناهێنێ.

سەرکەوە، سەرکەوە، باب گوتی:

لێرە دانیشە و مەجووڵێ، دەچم گوڵنار سەردەخەم.

کوڕ دەڵێ:

بابە، ئەو جارە-بەجێیمەهێڵە بیهێنە.

باب بە پێکەنینەوە:

کوڕم بە خوا تۆ بە جێبهێلم، ئەو بەجێناهێلم.

کوڕ بەو سوێندە باوەڕی بە بابی کرد، چاوەڕێیە، ئەو جارە لە جارێدی درەنگتری پێچوو، هاتەوە، دیسانەوە بە تەنێ هاتەوە، کوڕ تووڕە بوو، دەیویست بە بابی بڵێت تۆ درۆزنی، گێڕایەوە، بەڵام هیچ گومانی لەوە نەما کە باوکیشی درۆزنە.

ئێ، هەڵکشێ، هەڵکشێ، ڕێگا سەختە، دەترسێ، بیری لای کچەیە، چی لێهات! دەیبینمەوە؟ هاوار نازانێ بابی بۆچی بەو دەردەی دەبات! بۆچی بە پێبلکەی شەیتاندا سەری دەخات و گوڵناریشی بەجێهێشت، هێند تووڕەیە دەیەوێ یەک بە دەنگی خۆی یەک بەگەرووی منارە بە سەر بابیدا بقیژێنێ و پێبلێ بمبەوە خوارێ، بمبەوە کن گوڵنار، گێڕایەوە، گومانی بۆ ئەوە چوو، کە ئەوەی دەیبینێ خەونە.

نەیدەوێرا دەستیشی لە دیوار بەردا، چاوی هەڵگلۆفی، تا ئەگەر خەون بێ، بەئاگابێتەوە و لە پێبلکەی شەیتان بێتە

خـــوارەوە و کـــچەی لە دەســـت نەچـــێ. ئـــای دەڵێـــی بە ئاگاهـــاتەوە، دەبینـــێ وا کـــچ لە ســـەر ســـەری منـــارەیە لە تەنیشت یەک دانیشـتوون، کـوڕ ترسـا ئەوەیـان خەون بێ، پاڕایەوە ئەگەر خەونە بەئاگانەهێتەوە. تا باب سەرهاتەکەی بـۆ نەگێـڕایەوە بـاوەڕی نەدەکـرد، کە منـارە دوو ڕێگـای هەیە، ئەو دوو ڕێـیە لە هـیچ جـێگەک نـاگەنەوە یەک و لە هـیچ جـێگەیەک لێکتـر بە دیـار نـاکەون، تـا نەگەیـتە سـەر سەری ڕێبوارانی دوو ڕێ یەکتر نابینن.

کوڕ گۆتیە کچ:

تۆش نەتزانی دوو ڕێ هەیە؟

کچ:

با، بابت بە منی گوت.

کـوڕ دواتـر نـاوی لەو دانیشـتنەی سـەری منـارە نـا، ژوانێک لە ئاسمان.

دابەزین، ترومبێلێک هەڵیگرتن، لە چاخـانەیەک دابەزیـن، لە سەرلا دیوارێکی بە خەتێکی درشتی ناڕێک نووسرابوو:

چاخانەی بایز

باب دەڵێ:

لە سـەری سـەفینێ لە دوای نـان خـواردن حەزم دەچووە چایەی ئەو چاخانەیە، بخۆنەوە چایەی ئێرە زۆر بە تامە، دوای چل ساڵیدیش تامی هەر دەمێنێ.

کوڕ تا ئێستا تامی چایەکەی لە زارە.

گاڕانێک بە پێش چایخانەکەدا تێپەڕی، باب خۆی گەیاندێ، کوڕ چاوی لێیە باب کۆمەڵێک پارەی لە گیرفانی دەرهێنا، دیتی چێڵێکیان گرت، گۆلکێک لێی نەدەبۆوە، تا نزیک ئاوی کەسکوسۆر لەگەڵ گاڕان هاتن، لەوێ بە خۆ و چێڵ و گۆلکەوە لە گاڕان دابڕان، لەوێ دەنگی:

کرێمستی، کرێمستی، شەکر و شیرە کرێمستی.

باب سەرو کرێمستی بۆیان کڕی، کرێمستی سپی دەرچوو، کوڕ حەزیدەکرد ڕەنگی سوور با، لە جیاتی دوو کرێمستیش یەک با، چاوی دایە دەست و کرێمستی کچ. گەیشتەوە بن داربییەکە، پەنجەکان تێکەڵبوونەوە.

بە پێیان لەو سەری شارەوە هاتنەوە ماڵ، نازانم کچ بەڵام کوڕ هەستی بە ماندووبوون نەکرد، لە خۆشیی چێڵ بوو! خەیاڵی کرێمستی بوو!

ئەو شەوە لە ماڵی کوڕ باس هەر باسی منارە و پێپلکەکانی شەیتان بوو. پرسیار لە دوای پرسیاری لە باب و دایک و پیری گەڕیدە دەکرد، لە هەمووانی پرسی:

تۆ یەکەم جار کە پێبلکەی شەیتاندا سەرکەوتی، گەورە بوویت؟

پیری گەڕیدە چاویلکەکەی دادەگرێ، چاوە لە دەستچووەکەی دەسڕێ:

زەلام بووم، ژنی یەکەمم هێنابوو، لە گرانیی گەورە کەوتمە دوای کەروێشکێک، چووە ناو منارە، لە دووی چووم، بە پێبلکەکاندا هەڵگەڕا، لە دووی نەبوومەوە، لە دوا پێبلکە گرتم.

باب لە بن جەمەدانیەکەیەوە سەری دەخورێنێ:

من هەر لە تەمەنی تۆ دەبووم، دە ساڵێک، بابم وا بزانم لەلای مەهاباد بوو، لەگەڵ خاڵم بە پێبلکەی شەیتاندا سەرکەوتم.

دایک پەنجە دەخاتە سەر لێوی خوارەوەی:

ئەو ساڵەی بابت بە چیا کەوت، هێشتا تۆم نەکەوتبووە زگ، لەگەڵ بابت هەر یەکە بە لایەکدا سەرکەوتین، لە سەرەوە یەکترمان دیتەوە

کوڕ بە شەرمەوە:

وەک من و گوڵنار.

دایک بە دوو پەنجە گۆنای کوڕ دەگوشێ:

ئا، ئا...

کوڕ دەستی دەخاتە سەر رانی دایک:

دایە، تۆ چەند مانگ لە بابم گچکەتری؟

باب نەیهێشت دایک وەڵامبداتەوە، بە پێکەنینەوە:

کوڕم، دایکت هەشت نۆ دە ساڵێک لە من گچکەترە.

کوڕ:

ئۆی!

پیری گەڕیدە کۆخەیەکی کرد:

من بیست ساڵێک لە دایکی بابت گەورەتر بووم.

کوڕ بە چەپۆک لە سەری خۆی دا:

وەی! وەی!

دایک قسەی بەلای چێڵەکەدا راکێشا، دەنا کوڕ پرسیاری لە بارەی منارە و تەمەنەوە نەدەبڕیەوە.

چێڵەکان بۆ کوڕ خێریان داوە، لە گەڕەکی سێ چوار ماڵ چێڵ و ماڵاتیان هەبوو، منداڵان دەیانبردنە لەوەڕاندن، گوڵێش جار جار سێ چوار بزنەکەی دەهێنایە لەوەڕاندن، هەمیشە چەقۆشی بە دەستەوەیە. کوڕ و کچی داربی جار نا جار سەر لە سپێدان زوو، یان عەسرانێکی درەنگ

چێڵیـان دەبـردە دەورو بەری تـاقە دارخورمـا، ئەو نـاوە هاوینان سەراپا قەسەر و پووش وپەلاش بوو، بەهـارانیش کەسـک کەسـک، تەڕ تەڕ، دەتگـوت مێـرگێکە لە بەهەشـت. ئەگەر کـوڕ بە هەڵەدا نەچـووبێ، رەنگبـێ پتـر لە هـاوین و بەهارێک و شتێکیش لە پایز، ناوە ناوە بە چێڵەوە هـاتبنە ئەو ناوە، هەموو جارێکیش لە بن دارخورماکە بە تەنێ یان لەگەڵ ئـاوزەی خۆیـان گەمەی قاقایانێیـان دەکـرد، بەڵام چەندی بۆیان کرابا، تێکەڵی منداڵان نەدەبوون، دوو بە دوو دەمـانەوە، دوو بە دوو بە سـەر دیـواری کەلاوەکەدا کە شەقاوێک بەرین دەبوو، غارغارانێیان دەکرد. ئەو کەلاوەیە بە گۆتەی پیری گەڕیدە سەردەمانێک کۆشک و تەلاری پڕ لە باخ و باخچە بووە، لە بن زوورگەکانەوە جۆگەی ئاوی بۆ هـاتووە، جێی جۆگە ئاوەکە ئێستاش دیارە. لەو بەری مـاڵی کوڕی داربیشـەوە ئەو شـوێنەی سـەربازەکان لێیـان هەڵدابوو، جۆگەکە شـوێنەواری مـاوە، پیـری گەڕیـدە زۆر جار دەڵێ:

ئەو تەلارە زۆری ویسـت تـا بـووە تەلار و پادشـا سەردانی دەکرد.

تۆڵەستێن دەڵێ:

ئەو رۆژەی ئـاگری گـرت و تـاڵان کـرا، بـا پەڕی نیـوە سووتاوی کتێبەکانی لە شار دەگێڕا.

ئێستاش تەنها چەند لا دیوارێکی ماوە و منداڵانی داربی بە سەریدا غارغارێنی دەکەن.

دارخورما تا سەرهەڵدەبڕی بڵندە، کوڕ هەر کەڕەتێ لێی دەڕوانێ، قسەکەی پیری گەڕیدەی بیردەکەوێتەوە:

ئەو دارخورمایە پیرە تەمەنی منی هەیە، ئەوەیە من کووڕ بوومەتەوە، بەڵام ئەو وەک سەردەمی لاوی بە قیتی ماوەتەوە.

قەدی دار خورما ئەستوورە، زۆر ئەستوور، کچ لەو دیو، کوڕ لەو دیوە باوەشی پێدا دەکەن. کوڕ چەند حەزدەکات، دار خورما هێندە ئەستوور نەبا، بۆوەی سەر پەنجەی دەگەیشتە پەنجەی کچ، نەگەیشتێ. ویستی فێڵێک بکات، بەلای راستا هەندێک بخزێ، نەخزی، شەرمیکرد، ئاشکرادەبوو، ئەوە یەکەم گەمەی منداڵانی داربییە لە بن دارخورما.

قەدی خورما کون کونە، پێدەچێ هەمووی جێی گوللە بێ، منداڵانی داربی لە یەکەم دیداری دارخورماییان کونی گوللەیان دەژمارد:

یەک، دوو، دە...

لێیان تێکدەچوو، نەدەژمێردرا، پیاوێک کە ماڵیان هێندە لە دارخورماکە دوور نەبوو، جارێک بە سەردا هات، لێی پرسین:

ئەوە چی دەژمێرن؟

کچ وەڵامیدایەوە:

جێی گوللە دەژمێرین.

پیاوەکە بە پێکەنینەوە:

خۆ ماندوو مەکەن، ناژمێردرێ، ئەوە لای خوارەوەتان ژمارد، ئەدی لای سەرەوە خۆ نایگەنێ.

کوڕ خۆی کڕکردووە، کچ پرسی:

تۆش نەتژماردووە، نازانی جێی چەند گوللەی پێوەیە؟

پیاوەکە:

کچم کێ دەزانێ! هێندە گوللەی بۆ ئەو دارە هاتووە، مەگەر پیری گەڕیدە هێندەی بۆ هاتبێ!

کوڕ بە سەر سوڕمانەوە:

تۆ پیری گەڕیدە دەناسی؟

پیاوەکە:

کەس هەیە پیری گەڕیدە نەناسێ!

کوڕ لێی بووە مەراق، دەبێت بزانێت جێی چەند گوللە بە دارخورماوەیە. کچ ڕێی بۆ دانا، بە پێی قسەی پیاوەکە

ئەگەر بزانێت پیری گەڕیدە چەند گوللەی بۆ هاتووە، ئەوا جێ گوللەی دارخورماکە دەزانرێ، کوڕ ڕێیەکەی کچی بە باش زانی، لە پیری گەڕیدەی پرسی، پیری گەڕیدە شتێکی وای گوت:

نازانم، وێدەچێ هێندەی پەلکی داربی گوللەم بۆ هاتبێ، بەڵام تەنها حەفتیانم بەرکەوتووە.

وەڵامی پیری گەڕیدە مەراقەکەی پتر کرد، کچ لە کوڕی داربی پتر تامەزرۆی ژماردنی کەوتە سەر، پەلکی داربی ناژمێردرێ، کچ و کوڕ بڕیاریاندا کونەکانی دارخورما بژمێرن، سەریان هێنا و برد ئەو هەموو کونە چۆن بژمێرن؟ لە بەهارێکدا ڕێیەکی باشیان دیتەوە، هەرجارەی هەندێکیان دەژمارد، بە قەڵەمبڕ خەتێکیان لە نێوان ژمێردرا و نەژمێردراو دەکێشا، ژمارەکەیان هەر لە قەدی دار خورماکە لە بن خەتە کێشراوەکە دەنووسی، ڕۆژی یەکەم نزیکەی گەزێک لە قەدی دارخورمایان خستە ناو خەتی ژمێردراوەوە. پێدەچێ ئەو گەزەی بەژنی دارخورما کە خوارەوەیە، سەر زەوییە، لە هەموو جێیەک کەمتر گوللەی بەرکەوتبێ، لەو گەزە بۆ سەرەوە پتر جێی نیشانەی سەربازەکان بووە.

بن دار خورما بۆ کوڕ پڕپڕە لە سەرهاتی ناسک ناسک، وەک دەنگی کچ ناسک، کوڕ لە بیریەتی کچ لە بن داربی مەمکی کرد، بەڵام لە بن دارخورما پڕیکرد.

ڕۆژێکی پایزی بۆنی باران کۆڵانی پڕکردبوو، کوڕ پشتی بە داربی داوە، دیارە لە چاوەڕوانی کێ ڕاوەستاوە! بە بن تاوە بارانێک کە چ لە بارانی پایز نەدەچوو، کچ تەڕ تەڕ گەیشت، کراسەکەی بە لە شیەوە نووسابوو، چاوی کوڕ کەوتە سەر سینگی کچ، دیتی دوو شتی خڕ بە دوورایی سێ چوار پەنجەیەک لە یەکتر دوور، بە بن کراسی نارنجیەوە قیت بوونەتەوە، شێوەیان لە هەناری گچکەی دەکرد، سەری داخست، شەرمی لە هەنار کرد، ئیدی لەوەدوا بە تیچاو نەبا، چاوی نەدەدایە سینەی کچ.

وێدەچێ بەهاری دوای پایزی مەمککردن بووبێ، لە بن دارخورما، دوو بە دوو بە بەردی بەستێ قاقایانێیان دەکرد. کوڕ و کچی داربی هەمیشە بە بەردە جوانەکانی بەستێ ئەوانەی ڕووبار دەیهێنان، قاقایانێیان دەکرد کە تەواویش دەبوون، دەیانخستنە پەڕۆکێکەوە و لە بن خۆڵیان دەشاردەوە، تا کەس نەیاندزێ. بەردەکان زۆر جوانن، کەس بەردی وا جوانی نیە، لە هەڵبژاردن و دیتنەوەی بەردی جوان، کێ دەگەیشتە منداڵانی داربی. لە ساتی قاقایانێ، بەردێک لە بەردە جوانەکان لە دەستی کوڕ دەرچوو، نەگیراوە، بە توندی سینگی کچ گرتیەوە:

وەی سینگم!!

کوڕ پەشۆکا:

ئەی، نەمزانی.

کچ لەبەر ئێشی سینگی نەیزانی چی بکات، کوڕ چاوی لێیە، کچ دوو دوگمە لە سێ دوگمەی یەخەی کردەوە، کراسێکی سووری لەبەر بوو، پەنجەی بە جێی بەرددا دادەهێنا کە نێوان هەردوو مەمکی گرتبوو، هەستیکرد هەنارەکان تەواوێک گەورە بوونە، نێوان هەنارەکان سپی بوو زۆر سپی، کوڕ لە هیچ شتێک سپێتیی وای نەدیتووە، لە بەفری سەر لق و پۆی داربیش سپێتی وای نەدیتووە. سەری داخست، حەزیدەکرد وەک سەردەمی زۆر منداڵی جێی بەردەکە ماچ بکات، تا ئازارەکە کەم بکاتەوە. هاتەوەبیری جارێک بە هەڵە بەردێکی هاویشت و بە راستی بە قۆڵی کچ کەوت، گریا، بەڵام بە ماچێکی کوڕ کە لە جێی بەردەکەی کرد، گریان نەما. خۆزی خواست هەوکەش وەک هەینێ با، تا بە ماچێک ئازاری سینگی شکاندبا و چی لە دڵ نەهێشتبا، کچ دوای نەمانی ئازار بە پێکەنینەوە:

تۆڵەی حەسۆی گوڵێنگدارت لە من کردەوە.

کوڕ هێندەی نەمابوو، بگری:

ها، سێ بەردم لێدەوە.

کچ:

دڵم نایە، دەی با گەمە بکەین.

لەو ڕۆژەوە کوڕ بە تیچاویش شەرمیدەکرد لە سینەی کچ بڕوانێ.

دەژمێرن، ئەو ڕۆژانەی بە تەنێن، کونەکانی قەدی دارخورما دەژمێرن، دەستیان ناگاتێ، دەبێ پێداهەڵگەڕێن، هەڵگەڕان بە دارخورما ئاسان نیە، پەتکی دەوێ، چەند بزمارێکی گەورەش پێویستە، لەو جێیەی دەست دەیگاتێ، پەتک بە توندی لە بەژنی دارخورما دەئاڵێنن، دوو سێ بزماریشی لێدەکوتن، پەتک نابزوێ، بە سەری شۆڕبۆوەی پەتکدا هەڵگەڕێ، ئێستا تا ئاستی پەتک و بزمارەکان کونەکان ژمێردراون، ئەو ئاستە بووە جێگەی پێ، لەگژ ژماردنی سەرەوەترن، پەتێکیدی لە سەرەوە دەئاڵێنن، منداڵانی داربی بە نۆرە بە دارخورمادا سەردەکەون. ئێستا نۆرەی کچە، کوڕ لە خوارەوە لە سەر پشت ڕاکشاوە، ماندوو دیارە، تەماشای کچ دەکات دەڵێی سمۆرەیە هەڵدەگەڕێ، چاو، وای لە چاو، جێی سەیر دەبینێتەوە، چاویش لە سمۆرە دەچێ، بە جێی ترسناکدا هەڵدەگژێ، چاوی کوڕ ئێستا لە نێوان ڕانەکانی کچە، زوو دایخست، نەیهێشت چ ببینێ.

کوڕ ترسا، لەرزی، تۆبەی کرد کە جارێکیدی لە ساتی هەڵگەڕانی کچ بە دارخورمادا، لە سەر پشت ڕانەکشێ.

وێنەیەک لە وێنەکانی بن دارخورمای بە شێوەیەک لە دیدە و خەیاڵی پاراستووە، مەگەر وێنەی کرێمستیەکەی وا

پاراستبێ، عەسرانێکی درەنگە، کچ چووە چێڵەکان بگێڕێتەوە، کوڕ لە بن دار خورما لە سەر پشت راکشاوە، سەری بە بەردێکی درێژکۆلە کردووە، ئەگەر بەرگی تێهەڵکێشی، شێوەی بالیفێکی باریکەلە دەدات، دنیا کەمێک گەرمە، دوو قۆپچەی لە کراسەکەی کردۆتەوە.

گوێی لە دەنگی پێی کچە، وەک بڵێی پێی شەرمە سینگی رووت بێ، قۆپچەکانی دادەخاتەوە، چاوی لێیە کچ دێ دێ، لە تەنیشتی رادەکشێ و سەر دەخاتە سەر سەرینە بەردینیەکە، سەرین جێی دوو سەری لێدەبێتەوە، کچ دەست بە قسەدەکات، بەڵام کوڕ چ لە قسەکانی تێناگات، لە شەرمان دەلەرزێت، کوڕ کە تەنها شانی بەر شانی کچ کەوتووە، چەند تالە قژێکیش پەڕیونەتە سەر شانی، لە شانەوە گەرمایی لەشی کچ دەڕژێتە لەشیەوە، ئەو گەرمیە زۆر تایبەتە، کوڕ جاری یەکەمە گەرمیی لەو شێوەیە هەست پێبکات، بەرگە ناگرێ، دەیەوێت رابکات، ناتوانێت، وەک بڵێی بە داوە قژەکان بەسترابێتەوە، کچ قسان دەکات کوڕ هەر دەنگ دەبیستێ و وشەیەک چیە تێنەگەیشت، کوڕ بەستراوەتەوە و خۆی رادەپسکێنێ، هێز دەداتە خۆی هەڵدەستێ و کەمێک دوور دەکەوێتەوە، کچ هەر راکشاوە، کوڕ ناوێرێ تەماشای بکات، دەچێتە لای چێڵەکان، تا کچ قیت نەبۆوە، کوڕ نەهاتەوە بن دارخورماکە.

ئەو رۆژەی چـــوونە شـــیرین بەهـــارەش بە تەنیشـــت یەکەوە دانیشـتبوون، کـوڕ خـۆی کورژکردبـۆوە دەترسـا جێیەکـــی بەر جێیەکـــی کـــچ بکەوێـــت، بەڵام لە ســـاتی چەپڵەلێـدان قـۆڵ و باسـکیان لە یەکتـر دەخشـا، کـوڕ دەیویســـت چەپـڵـە لێـنەدا، بەڵام شـــیرین بەهـــارە بەردی دەهێنـایە جـۆش و خـرۆش، پیـری گەڕیـدە بەو تەمەنەوە هەڵدەسـتاوە سـەر پـێ و چەپڵەی لێدەدا کـوڕ گـوێی لێیە دەڵێ:

ئای! زیرەکیش لێرە با، ئەوجا خۆش دەبوو.

دایـک و بـاوک ڕانەدەوسـتان، کـوڕ دەبینـێ لەو لاوە خـانزاد دەسـماڵ ڕادەوەشـێنێ. دەبینـێ، گوڵێ تەزبێحێکـی قەزوانـی دریـژ بە سـەری پەنـجە هەڵدەسـووڕێنێ. دیـدار هەســـتاوەتەوە و فـــیکە لێـدەدات. ســـەلاح کە لە پـــۆڵ لە تەنیشتی دادەنیشت، زۆر کەس بە بوێر گازیاندەکرد، چۆتە ســەر شــانی پیاوێـک ودەســت هەڵدەشــەقێنێ. کـوڕ یەکەم جاری بوو شیرین بەهارە ببینێ، هەر لەوە ڕۆژەوە منداڵان ناویـان لەو پیـاوە نـا شـیرین بەهـارە، ئەو پیـاوەی هەنـدێ کەس بە پیاوی ئاسمانی ناوی دەهێنن، ئەو پیـاوەی شـاری هێناوەتە خرۆش. شیرن بەهارە جەمەدانیەکەی لە شێوەی تۆڵەسـتێن بەسـتووە، بە دەنگێـک دەڵێـی لە ئاسـمانەوە هاتووە، دەچریکێنێ:

شیرین بەهارە، بەهارە، بەهاری شادان...

کوڕی داربی لە نێوان شیرین بەهارە و کچی داربی، دێ و دەچێ، دەمێک لەگەڵ ئەودا دەڕوات و دەمێک دێتەوە لای کچ، جار جارە تێچاوێکی دەداتێ، ناوێرێ لە سەری رابگرێت، وەکَ بڵێی بەرگەی سەیرکردنی دەم و لێو و روومەتی ناگرێت کە لە پێکەنین و شادی شێوەی دنکە هەناریان گرتبوو، پتر تەماشای دەست و پەنجەی دەکرد، چەند ناسک بوون، چەپڵە ناسکتری کردبوون، بە ئاستەم گوێی لە بابە:

من لەو شیرین بەهارە تێر نابم.

دەبینێ، دایک بزەیەک دەکات:

چوونکێ ناوی منی تێدایە!

باب بە پێکەنینەوە:

هەر وایە.

لە هەستاندا وێنەیەک لەگەڵ شیرین بەهارە دەگرن، لە وێنەکە مندالانی داربی لە پێشەوە لە تەنیشت یەکتر راوەستاون، گوڵێش لە وێنەکەدا دەردەچێت.

گەڕەک رۆژ دوای رۆژ ئاوەدانتر دەبێ، ماڵی گوڵێ دوورتر دەکەوێتەوە، کەمتر دەبینرێ، بەڵام هەواڵی دەگات، حەفتەیەکە وازی لە قوتابخانە هێناوە، دەڵێن، مامۆستایەک لێی توورە دەبێت و دەڵێت:

قاحپە هێندە دەمدرێژی مەکە.

گوڵێ بێ و وەڵام نەداتەوە! دەڵێ:

بە داکت بڵێ دەمدرێژی نەکات و خۆشت قاحپەی.

مامۆستا بە دارەوە بۆی دەچێت، قوتابییەکەی تەنیشتی ئاگای لێیە، گوڵێ خێرا تەنوورەکەی کەمێک هەڵدەداتەوە، دەست بە ناو رانی خۆیدا دەکات و چەقۆیەک دەردەهێنێ و بۆ مامۆستا دەچێت، مامۆستا دەقیژێنێ و هەڵدێ، دەردەپەڕێ، دەرگای حەوشە داخراوە، گوڵێ بە سەر دیواردا ئاودیو دەبێ، هەر ئەو ئاودیوبوونەیە و ناگەڕێتەوە.

لە پشت ماڵی کچ، لەو بەری کەندێ بەلای خوارەوەدا حەفتە نیە چەند خانووێک قیتنەبێتەوە، ئەو خانووانەی خوارەوە، ئەوانی نزیک جادە قیرەکە، کە دەڵێن زیادەڕۆنە، تێکدەدرێن و خاوەنەکانیان دێن لەو دەوروبەرە خانوو دروستدەکەن. ئەوها بڕوا، ساڵێک نابا، لە گەڕەک پارچە زەویەک بە بەتاڵی نامێنێتەوە، کوڕ خەمی ئەوەیەتی تەنیشت ماڵی ئەوانیش بکرێتە خانوو، جێگەی تۆپانێیان لێ بگیرێ. ئێستا لە لە پشت ماڵی کچ بناخەی خانووێک لێدەدرێت، هێشتا تەواو نەبووە، هێشتا ماڵی نەهاتوتێ، کوڕ لەگەڵ کوڕەکەیان بووەبرادەر، قەت کوڕی داربی نەبووە، وا زوو لەگەڵ کەس ببێتە برادەر، بەڵام دیارە چاوی دیدار نهێنییحکی تێدایە رایکێشا و بوونە برادەر، رەنگە لە رێی

دیدار و کوڕی داربیشەوە بووبێت، بابیان بوونە برادەر، بابی دیداریش لە چیا بووە، بەڵام کوڕ کچ بە کەس نادا، ساتەکانی بێ کچی داربیی لەگەڵ دیدار دەبردە سەر.

داربی ئاوەدانە، جگە لە پیری گەڕیدە و نەنە خان، منداڵانی داربی، جارجارەش دیدار، خوشک و براکەی کوڕیش کە سەرپێکەوتوون، خوویان بە بن داربی گرتووە، تا دەگەنێ خۆیان لە قوڕ و چڵپاو وەردەدەن، دێن وەک دوو کۆتر لە سەر سەکۆیەکە هەڵدەنیشن، دەمەو بەهارە زۆری نەماوە نەورۆز بێتەوە، دەنگی تڕومبێلەکە بێ و سوار بن و بچنە نەورۆزێ.

کوڕ لە سیمای پیری گەڕیدە خەفەتێک دەبینێ، نازانێ چیە و ناشپرسێ، بە سیمای نەنەخانیشەوە خەفەتەکە دیارە، دواتر خەفەت پەڕیەوە سیمای دایک و باوکیشی. کەوتە گومان لە چاوی خۆی، پێیوابوو چاوی کەوتۆتە هەڵەیەکەوە، دەیویست بپرسێ، دەیگێڕاوە. بە خۆی نەوەستا لە کچەی پرسی، وەڵامی ویش زۆر روون نەبوو، کوڕ چیدی بەرگەی نەگرت، لە پیری گەڕیدەی پرسی:

+ هەموو خەفەتبار دیارن...

- هیچ نیە، رادیۆ قسەی ناخۆش دەکات.

+ رادیۆ!

ئێوارەیەک لە چاوی کوڕ ماڵ و گەڕەک بە شێوەیەک پەشـۆکان دەتگـوت لە گەردەلوولـدا گێـژدەدەن، هەمـوو تێکدەسووڕان بێ ئەوەی شتێک لێرە هەڵبگرن لەوێی دانێن. بێ ئەوەی قسەیەکی روون بکەن. ماڵی کچش هاتبوونە ماڵیان، تۆڵەستێن، تفەنگەکەی خاوێندەکردەوە، چاوی لە سەر ژن و منداڵەکانی هەڵنەدەگرت، پیری گەڕیدە چاوی لە تۆڵەستێن بڕیبوو، دەیگوت:

دەمزانی وای لێدێ، خۆزگە منیش لە سەر شنگ و تین دەبووم.

دایک ئەو دایکە سوور وسپییەی لە هەنار هەنارتربوو، ئەو شـەو رەنگـی خۆڵەمێشـی گرتـووە، چـاو لە سـەر تۆڵەسـتێن هەڵنـاگرێ، لە دەوری دەسـووڕێ، کەنتـۆڕەکە دەکاتەوە، سێ چوار کراسی بۆ دێنێ، نازانی کامیانی بۆ دانێ، گۆریەی بۆ دێنێ، پێڵاوی بۆ خاوێندەکاتەوە.

باب دەبێت بڕوات، خوا دەزانێ ئەو جارە چەندی پێدەچێت، جاریدی هەشت ساڵێک بوو، باب سەرەتا ئامێزی بە پیری گەڕیدەدا کرد، منداڵانی داربیی پێکەوە لە ئامێز گرت، منداڵە گچکەکانی گوشیە خۆیەوە، دایک لە پێشی راوەستا و گوتی:

خەمی منداڵەکانت نەبێ، ئاگات لە خۆت بێت.

یەکتریان ماچ کرد، دایک گریا، بە کوڵ گریا.

باب دەڵێ:

مەگری، زوو یەکتر دەبینینەوە.

باب ڕۆیی، هەر باب نا، براکەی گوڵناریش ڕۆیشت. هەمەدانییش هات و لەگەڵ تۆڵەستێندا ڕۆیشت. گوڵێش کورتەک و شەرواڵێکی لەبەرکردبوو، پرچی لە ناو جەمەدانیەکەی خڕکردبۆوە، دەتگوت کوڕە، چەندی خەڵک هەوڵیاندا نەڕوات، ڕۆیشت، گوڵێ خۆی کردە پیاو و لەگەڵ پیاوان ڕۆیشت. پیاو لە گەڕەک نەما، کوڕی سەرەوەی شازدە و حەڤدە لە گەڕەک نەما، هەموو هاتن و بەگەڵ تۆڵەستێن کەوتن و بەو ڕێیەدا ڕۆیشتن کە بە تەنیشت جێ جۆگەی ئاوەکەوە بوو، ئەو جۆگەیەی زوو لە بن زوورگەکانەوە ئاوی دەهێنایە شارەوە، هەموو ڕۆیشتن. ئەوەی لە گەڕەک مایەوە تەنها پیری گەڕیدە و شەلەی شامینۆکفرۆش بوو.

ئەو شەوە نەنووست، لە پێش دەرگا تەماشای ڕێی ئەو بەری کەندێی دەکرد، دەیدیت شار هەر هەموو شار بەو ڕێیەدا شار بەجێدێڵن و ڕووەو زوورگەکان ڕووەو چیا ڕێیانگرتووە. کاتێ ڕۆژبۆوە، تێگەیشت شار پیاوی تێدا نەماوە، بە چەکدار و بێ چەکەوە، بە پێشمەرگە و پۆلیس و کرێکار و بێکار و فەرمانبەر و زۆر مامۆستاوە، هەر هەموویان ڕێی چیایان گرتووە و لە شار نەماون.

منداڵانی داربی لەڕێی ئەو بەری کەندێ شتی سەیریان دەدیتەوە، کڵاوی پۆلیس، کاسکێت، کاسێت، پاکەتی جگەرە، پاکەتی پەنیر، پاکەتی فیشەک، جلکی بنەوە، پێنووس، زۆر شت، دەفتەرێکی کچگەی بەرگ قاوەییش، کوڕ لە شتە کەوتووەکانی سەر ڕێ و دەو ڕێ تەنها دەفتەرەکەی بە لاوە گرنگ بوو، بردیەوە، هەندێکی بۆ پیری گەڕیدە خوێندەوە.

کوڕ دەبینێ شار خامۆشە، دەڵێی خۆڵ و دۆی بە سەردا کراوە، شار چۆلە، تۆڵەستێن ڕۆیشت و شاری لەگەڵ خۆی برد. ڕۆژی دواتر دەیدیت خەڵک قل قلە دێنەوە. منداڵانی داربی لەبن گەڵای تەڕی داربییەکەوە، دەیانژماردن، یەک دوو سێ... وردە وردە شار پیاوی تێکەوتەوە، پیاو پەیدابوونەوە، ژیان جۆرێک جوولەی تێکەوتەوە، کوڕ گوڵێ دیت، بە تووڕەیی هاتەوە و لە کۆڵانی بە دەنگی بڵند دەیگوت:

پێکیان نەکردم، چەکیان نەدامێ.

پیری گەڕیدە کە گوڵێی زۆر خۆشدەویست، گازیکرد و دڵیدایەوە:

گوڵێ، کچە ئازاکەم، قەیناکە، گەڕەک پیاوی تێدا نەماوە، تۆ ئاگات لێمان بێت.

چاوەڕێی باب و برا بوون بە دیارکەون، بەڵام پیری گەڕیدە زوو کوڕی داربیی لە باری چاوەڕوانی دەرهێنا:

کــوڕم، بابــت زۆری پێــدەچێت، لەگەڵ ئەو خەڵــکە نایەتەوە.

کوڕ باوەڕی بە قسەی پیری گەڕیدە هێنا، بە ڕۆیشتنی تۆڵەسـتێن و زۆریـدی، زۆر شـت گـۆڕا، هەر زوو ئەی ڕەقیب و ئەوانە لە قوتابخانە و و کۆڵان و بازاڕ کۆکرانەوە و بە پچڕپچڕی و پڕ لە غژەغژ چوونەوە رادیۆکەی پیری گەڕیدە. شەوان بە دزیەوە گوێیان لێدەگرتن، کوڕ یەکەم ڕۆژی چوونە قوتابخانەی دوای بزربوونەوەی تۆڵەستێنی بیرنـــاچێتەوە، لەگەڵ کــــچ بە تــــرس و لەرزەوە، بە خەفەتبارییەوە، ڕێی قوتابخانەیان گرت، لەو جێیەی لێکدی جودابــوونەوە، پتــر ترســان، وەک جــاری جــاران لە گۆڕەپانەکە ڕیزبوون، بەڕێوەبەر قسەی کرد:

لەمەودوا ئەو ســــروودانە نــــاڵێینەوە کە پێشــــتر دەمانگوتەوە.

لە لایەکەوە ئەی ڕەقیــب بەرزبـۆوە، بەڵام بەڕێـوەبەر وجێگرەکەی بە دار بێدەنگیانکرد، لەو دەمە کوڕ گـوێی لە مامۆستایەک بوو:

ئەی ڕەقیب بێ دەنگ ناکرێ.

کوڕ چاوی لە برادەرەکانی گێڕا، هەندێکیان نەمابوون، مامۆستای زللەش دیار نەما، لە هاتنەوە دیتی کچ بە کول دەگری:

+چ بووە؟

-دوو هاوڕێم چیدی نایەنە قوتابخانە.

منداڵانی داربی لە ڕێ لە نێوان خۆیان گفتوگیان لە ئەگەری هاتنەوە سەرباز و گوڵێنگدارەکان دەکرد.

بە چوونی تۆڵەستێن زۆر شت چوو، ئەوە نەورۆز هات و کەس لە ماڵ دەرنەچوو، کەس دیاریەکی نەهێنا. کوڕ هەستدەکات دەشت و دەریش، ئاقاری ئەو بەری کەند تا دارخورماکەش کەسکایی بەهارەکانی پێشووی نیە، دایکیش خۆی ناڕازێنێتەوە جلکە جوانەکانی هەڵگرتەوە. نەنەخانیش ترس دایگرتووە و بەردەوام لە چۆکی خۆی دەدا و وەیش وەیشیەتی. پیری گەڕیدە دڵیدەداتەوە، بەڵام بەلاشە. زۆری نەبرد چیڵەکانیش نەمان، دارخورماکە وەک سەردەمی سەربازەکان بە دووری مایەوە، کوڕ دەیگوتە کچ:

+ئەرێ کونەکانمان تا چەند ژمارد؟

- بیرمناکەوێتەوە، بەڵام هێشتا زۆری مابوو.

دوای بزربوونەوەی تۆڵەستێن چی وەک خۆی مایەوە؟ لە چاوی کوڕی داربی تەنها داربی وەک خۆیەتی گۆڕانی

بە سەردا نایە، باڵندەکان لە خوێندن ناکەون، پەلکەکان کەسک کەسک، لە ناو پەلکانەوە بارانێک دێتە خوارێ، دەڵێی لە پرچی کچی داربییەوە دێ، کوڕ هەستدەکات، پرچی کچ پرچێکە چ پرچ نایگاتێ، نە پرچی دایکی، نە پرچی خانزاد، نە پرچی ئایشە و فاتمە...

بن داربی هێشتا ئاوەدانە، چۆل چۆل بێ شەش کەسی لێیە. خوشک و براکەی هاوار کە بە دەوری داربی دەخولێنەوە و دەکەون و هەڵدەستنەوە، پێدەکەنن و دەگرین، ئەوانیش پێدەچێ هەستیان بەو گۆڕانە کردبێ کە بە سەر ماڵ و کۆلاندا هاتووە. ئەوە نیە هەر ( بابە بابە)یانە و کەس وەڵامیاننادادەتەوە. لە دوای ئەشقیابوونەوەی تۆڵەستێن خاڵی هاوار کە بە مۆسکۆیی ناوی دەرکردبوو، زوو زوو سەردەدات، هیچ جارێکیش دەستبەتاڵ نایە، دەست بە سەر منداڵەکاندا دادەهێنێ، لە باوەشیان دەگرێ، چوکلێتیان دەداتێ، بەڵام کێ جێی باب دەگرێتەوە؟ هاوار هێندە حەز لە چارەی خاڵی ناکات، دێتە بیری جارێک باب و خاڵ بووە قرەقرپیان و هێندە نەمابوو دەمانچە لێکدی راکێشن، باب دەیگوت:

تۆ بەکرێگیراوی رووسیا و ...

خاڵ دەیگوت:

تۆ بەکرێگیراوی ئەمریکا و ....

مۆسکۆیی بە توورەیی هەستا و نەهاتەوە، تا تۆڵەستێن نەڕۆیشت، پێی نەنایە ئەو ماڵەوە. هاوار ئەودەمانی لەو هەموو بەکرێگیراوانە تێنەدەگەیشت، بەڵام بێ چەند و چوون لایەنگیری بابی گرت و لەودەمەوە حەز بە چارەی خاڵی ناکات.

لە چاویان دیارە دایک و پیری گەڕیدە لە سەر ئاو و ئاگرن. کوڕیش هەمیشە چاوی لەو ڕێیەیە کە تۆڵەستێن پێیدا ڕۆیشت، لەو شەوەی دەرچوو هەواڵی نیە، بەڵام تا نزیک دڵنیایی دڵنیایە کە باوکی زیندووە. هەر کەسێ شەوان گوێ بداتە رادیۆکەی پیری گەڕیدە دەزانێ کێ گەشمردە بووە، ناوی گەشمردە دەخوێندرێتەوە، ژمارە و زۆر جار ناوی کوژراوانی دوژمنیش دەخوێندرێتەوە. کوڕ دڵی زۆر خۆشە بە ژمارەکان، بەرانبەر یەک گەشمردە بیست و پتریش کوژراو هەیە. لەو ساتانەی رادیۆ دەبێتەوە تا ناوەکان دەخوێندرێنەوە، دەستی لە سەر دڵیەتی و دەپاڕێتەوە کە ناوی باوکی تێدا نەبێ، کچ لە نیگەرانیی کوڕ تێدەگات، پێیدەڵێت:

خەمی بابت نەبێت، ناوی ناخوێندرێتەوە.

بەو قسەیە ئاهێکی دێتەوەبەر، قسەی کچی داربی بۆ کوڕی داربی وەک دەرمانە.

ئێستا وا لە کەندەکە بە دوای بەرددا دەگەڕێن، پێش کەمێک، کەمێک پرووشاندی، هەورەکەی ڕەواندەوە. ڕۆژ

بە دەرەوەیە، لە نـاو کەنـدێ، کەنـدی وشـک، لە بەرانـبەر یەکتر لە سەر دوو بەردی تەواوێک گەورەی دوو شەقاوی منداڵانە لێکدی دوور دانیشتوونە. دیار نیە کچ خەیـاڵی بۆ کوێ چووە، بەڵام کوڕ گەڕاوەتەوە سەردەمی تۆڵەستێن، سەرکەوتنی سەر منارە و پیاسەی نێوان هێلی ئاسنین و غارغارانێی سەیرانەکان، خشخشۆکەی سەرقەڵات، کچ بە رستەی:

کەند بێ ئاو جوان نیە.

دەیهێنێتەوە ناو کەندێ، لە هەستاندا چ ببینن! بە پانایی کەنـد و بە بڵنـدایی ئەو بەردانەی لە سـەری دانیشـتبوون، ئـاوی شـێلو لە سـەر چنگ بە نەرمە غـار دێت، پێ بە پێ وشـکایی دادەپۆشـێ. ئەوان یەکەم جـارە شـتی وا ببیـنن، رووبار بە بێ باران هەسـتێ و سـەرەتاکەی لە دوورەوە و لە بەر چـاوانەوە دەسـتپێبکات. ترسـان و هەڵاتـن، تـا گەیشـتنەوە بـن داربـیەکە رووبـار تێـپەڕی، رووبـار لە هەڵاتنی ئەوان تیژتر بوو، پیری گەڕیدە گوتی:

مەترسن چ نیە، دیارە لە زوورگەکان بارانە.

زۆری نەبرد ئاو گەیشتە بن دیوار، هاوار ترسا، لە بەر خۆیەوە دەیگوت:

خۆزیا بابم لێرە با.

زوو بەبیری هاتەوە کەند دوور خراوەتەوە، ترسەکەی ڕەویەوە. ژن و منداڵ ڕژانە دەو کەندێ، چاوی گێڕا خانزاد نەبوو، سەری سوڕما، چۆن دەبێ ڕووبار هەستێ و خانزاد بە دیاریەوە ڕانەوەستێ، پێشتر شتی وا نەبووە، دەبێ لەبەر ئەوەبووبێ کە لافاوەکە لە خۆوە هەستا! دواتر کوڕ ناوی لەوە نا: ئەو لافاوەی لە خۆوە هەستا.

کەند بەرە بەرە نیشتەوە، ئەوان پەلەیانە لە نیشتنەوە، چەندی زووتر بنیشێتەوە زووتر دەگەنە بەردە جوانەکان، گەیشتنێ، کوڕ دەیگوت:

با زۆر خڕبکەینەوە لەوانەیە ئەوە دوا ڕووبار بێ، تا ساڵێکی تر نەیبینینەوە.

کچ بە پێکەنینەوە:

خودا ئەو ڕووبارەی لە بەر خاتری من نارد، چوونکە حەزم لێیبوو.

لەو قسانە بوون لە لای حەسارەکەوە دەنگی دوو سێ گوللە هات، زۆری نەبرد گەڕەک ڕژانە حەسارە گەورەکەوە، ئەو حەسارەی ماڵی خانزادی تێدابوو. منداڵانی دراوسێ ناویان لەو حەسارە نابوو حەساری خانزاد، چ بوو، چ بوو؟

خانزاد خۆی کوشت.

ئەو رستەیە بووە رستەی گەڕەک، هەموو گەڕەک دەیگوتەوە، تەنها گوڵێ رستەیەکی جیا لەو رستەیەی هەبوو:

خانزاد خۆ ناکوژێت.

دەیانگوت خانزاد دوو گوللەی بە نێوان هەردوو مەمکی خۆیەوە ناوە و گوللەیەکیش بە ناو دەمیەوە. حەسار سوور بوو لە خوێنی خانزاد، خانزدا خانزاد، گەڕەک هەموو خانزاد خانزادی بوو. کوڕ لە بن فرمێسکەوە تەماشای هەر کێی دەکرد، دەگریا، کچ گریا، دایک گریا، پیری گەڕیدە گریا، نەنەخان گریا، کێ نەگریا! گەڕەک هەمووی بۆ خانزاد گریا. تەرمی خانزادیان لەو گۆڕستانە ناشت کە دەکەوێتە سەر رێی دارخورماکە و لە سەر کێلەکەشی هیچیان نەنووسی، پرسەشیان بۆ دانەنا. حەمەد و جەباری قورئانخوێن لە سەر خانزد بووە شەڕیان، بە ئایەت و فەرموودە بەربوونە گیانی یەکتر، جەباری قورئانخوێن دەڵێ:

خانزاد دۆزەخییە، چوونکە خۆی کوشتووە.

حەمەدی قورئانخوێن دەڵێ:

وا نیە، دوور نیە بەهەشتی بێ، چوونکی کوشتنەکە دیار نیە.

کەسیان نەبەزین.

دەرویش لێکی کردنەوە و بە ڕستەی:

ئێوە چین تا خەڵک بۆ بەهەشت یان دۆزەخ بنێرن!

دارێکی بە نێوانیاندا هێنا، هاوار لەو ڕۆژەوە دوژمنی بووە جەباری قورئانخوێن.

منداڵانی داربی چەندی سەر دێنن و سەر دەبەن، سەرەدەری لە خۆکوشتنی خانزاد دەرناکەن، بۆچی خۆی کوشت؟ چۆن وێرای تەقە لە خۆی بکات؟ چی وای کرد... پرسیاریان لە یەکتر دەکرد، وەڵامی چی! لە دایکیان پرسی، خانزد بۆچی خۆی کوشت؟ لە پیری گەڕیدە و نەنەخانیان پرسی، لە کێیان نەپرسی، کچ لە قوتابخانە لە مامۆستایەکیشی پرسی بوو، خانزاد بۆچی خۆی کوشت؟ وەڵامێکیان دەستنەکەوت.

دوای چەند ڕۆژێ، کوڕ لە ڕێی نانەواخانە لەژنانی پێش دەرگا ڕستەیەکی ترسناکی بیست:

خانزاد بە دەستی براکەی کوژرا.

ئەو ڕستەیە هەژاندی، لە بیریەتی نانەکەی کە خستبووە سەرنانەوە لە دەست کەوت و کەوتە ناو چڵکاوەکە و هەڵینەگرتنەوە، گەڕایەوە ماڵ، بە پرسیارێک ڕێی لە دایکی گرت لە نان و سەرنان بپرسێ:

دایە، براکەی بۆچی خانزادی کوشت؟

دایک گرتیە باوەشی:

ئەوەت لە کێ بیست؟

منداڵانی داربی تا پێکەوتن خانزاد بۆچی بەدەستی براکەی کوژرا، ماوەیەکی ویست، کچ لە پێش کوڕ پێکەوت، لە ڕێی قوتابخانە مەیلەو بە شەرمەوە بۆی گێڕایەوە:

دەڵێن خانزاد زگی پڕبووە، لە کوڕەکی حەساریێ، لۆیە براکەی کوشتی، کوڕەکە هەڵاتووە، چووەتە چیا، دەڵێن براکەی خانزادیش بە چیا کەوتووە.

کوڕ کەمێک بیری کردەوە تا لە واتای زگپڕبوون تێگەیشت، تووڕە بوو، هەڵچوو، جوێنی دا بە کوڕەکەی حەساریێ، بە براکەی خانزاد.

کوڕ جارێکی دی شەڕی دوو قورئانخوێنەکەی دیت، لە پێش دەرگای مزگەفتێ، مزگەفتی نزیک گۆرستانەکە، جەباری قورئانخوێن دوو سێ ئایەت و فەرموودەی دەخوێندەوە و ئەوجا دەیگوت:

خانزاد دۆزەخییە، ئێستا بە پرچی خۆیەوە لە ناو ئاگر هەڵواسراوە، زیناکەر جێی دۆزەخە، من ئامادەنیم لە سەر گۆڕەکەی ئایەتێکیش بخوێنم.

حەمەدی قورئانخوێنیش دوای خوێندنەوەی ئایەت و فەرموودە:

هیچ وا نیە، تۆ چووزانی ئەو زینای کردووە، دەزانی زینا چیە! من دەڵێم خانزاد ئێستا لە بەهەشتێ پیاسە دەکات، من ئامادەم هەموو قورئان لە سەر گۆڕەکەی بخوێنمەوە.

پتر رقی لە جەبار بۆوە، بە دەستی با، رەوانەی دۆزەخی دەکرد، ئەو جارە دەروێش لەوێ نەبوو دارێک بە بەینیاندا بێنێ. دوو سێ ژن گەیشتنە گۆرستانەکە، دیاربوو قورئانخوێنیان دەویست، قورئانخوێنەکان خانزاد و دۆزەخ و بەهەشتیان لە بیرچوو، بە دوای ژنەکان کەوتن.

لەو رۆژانە قسەیەکی گوڵێ کە هەڕەشە بوو لە جەباری قورئانخوێن بە گەڕەکدا بڵاوبۆوە:

ئەگەر جارێکی دی بڵێت خانزاد دۆزەخییە، بە قوربانی چەقۆیەکی دەکەم.

هاوار هیچی لە دەستنایە، هێندە نەبێ، هەمیشە لە خودا دەپاڕێتەوە کە خانزاد بباتە بەهەشت و نەیخاتە دۆزەخەوە. بڕیاریشیدا پارە بداتە حەمەدی قورئانخوێن، تا لە سەر گۆڕەکەی خانزاد قورئان بخوێنێ. دەپاڕایەوە کە هیچ کچێک تووشی زگپڕی نەکات. خانزادی لەبیرنەدەچۆوە، هەمیشە لە پێش چاوی بوو، قسەی لەگەڵ دەکرد، خوێنەکەی دەبریسکایەوە، لە خەوێش لێی دانەدەبڕا، زۆر خەونی پێوەدەدیت، دایکی زۆر هەوڵی لەگەڵی دا، لەبیربکات، لەبیرنەچوو، نامەکەی بابی هێوری کردەوە.

سەر لە ئێوارەیەک ژنێک هاتە ماڵیان، کوڕ پێشتر چەند جارێ دیتبووی ناوی خاتوون بوو، نامەی بابی پێبوو، لە نێوان پیری گەڕیدە و دایک دانیشتووە، چ هەواڵێکی خۆشە، نامەکە بە دەستی دایکەوەیە، کوڕ لە پشتیەوە تەماشای دێرەکان دەکات، دەستخەتی باب چەند خۆشە، باب لە چیایە، لە ناوەراستی لاپەڕەکە خەتێک لە هەموو خەتان درشتترە:

هەر دیتتان بە سەرکەوتوویی هاتینەوە و تا حەمرینمان لە بێگانە پاککردەوە.

خاتوون نامەیەکی لە هەمەدانییەکشەوە هێنابوو کە ئەویش لە قوڵی توڵستێنە، دایک بۆی بردن. دەبوو نامە بۆ توڵەستێن بنووسرێتەوە، دایک نووسی، قسەی خۆی و پیری گەڕیدەی نووسی، دایک رووی لە کوڕ کرد:

تۆ دەتەوێ چی بۆ بنووسی؟

گوتی:

ئەدی بە گوڵنار ناڵێن؟

دایک بە زەردەخەنەیەکی شیرینەوە:

با، بەویش دەڵێم، بەڵام تۆ هی خۆت بڵێ.

کەمێک داما:

بابە، ئەو دوو کەسە بکوژە، کە لە حەساری خانزادەوە هاتوونەتە لات.

کوڕ دیتی دایک فرمێسکی هاتە خوارێ، پیری گەڕیدە داما، خاتوون حەپەسا.

خاتوونی لەبیرناچێتەوە، کە هات زگی لووس، لە هی ئێستای دایکی لووستر، کاتێک بۆ ماوەیەک لەگەڵ دایک لە ژوورەکەی پیری گەڕیدە دوو بە دوو مانەوە، لە هاتنە دەرێ، زگی گەورە زۆر گەورە، لە زگی ئەو کاتەی دایکیشی گەورەتر کە دوو منداڵی تێدابوو. سەیرە، بەو کتوپڕە، زگ چۆن و لە چی پڕ بوو! ئیدی خاتوون بە زگپڕی ڕۆیشت. کوڕ بە چاو لە دایکی پرسی، دایک هەر بە چاو تێیگەیاند کە واز لە پرسیارکردن بهێنێ، وازی هێنا و نەیپرسیەوە.

حەفتە وەرنەسووڕایەوە خاتوون پەیدابۆوە، زگەکەی دانابوو، کوڕ چاوەڕێ بوو نامەیەک بداتە دەست دایکی، نەبوو، شەو مایەوە، هەردووکیان چوونە هۆدەکەی پیری گەڕیدەوە و دەرگایان لە سەر خۆیان داخست، دیسان بە زگپڕی هاتە دەرێ و بە زگێکی لە جاری پێشی گەورەترەوە ڕۆیشت. تێنەدەگەیشت، کوڕ لە نهێنی زگپڕبوونی خاتوون تێنەدەگەیشت، دەبێ چ جادوویەک لە چاوەکەی پیری گەڕیدە لە جوولە بێ و بە سانایی و لە چەند چرکە ساتێکدا زگی خاتوون پڕبکات! دایکی و پیری

گەڕیدە ئەو نهێنییەیان لێی شاردەوە، ئەویش شاردنەوەکەی ئەوانی لە کچی داربی شاردەوە، خۆی گرت و هیچی پێنەگوت.

لە هاتنەوەی جَاری سێیەمی خاتوون کە دوا جار بوو، خۆی پێنەگیرا، ویستی بە زۆر لەگەڵ دایکی و خاتوون بچێتە هۆدەکە، بەڵام پیری گەڕیدە دەستی گرت و بردیە بن داربییەکە و پێیگوت:

+ پەلە مەکە دوایی، ئێستا نا، من هەموو شتت پێدەڵێم.

- باشە.

بێ ئارامە، خۆی پێڕاناگیرێ بۆ دوایی. خاتوون بە زگی پڕەوە ڕۆیشت، کوڕ لای خۆی بڕیاریدا کون و قوژبنی ژوورەکەی پیری گەڕیدە بپشکنێ، لە دوای هەلێک دەگەڕا. هەر ئەو ڕۆژە باش ڕێککەوت، دایک لە ماڵ دەرچوو، پیری گەڕیدە و نەنەخانیش سەرگەرمی قسان بوون، وەک دزێک خۆی کرد بە ژوورەکەی پیری گەڕیدە، خۆ بە لای کەمی ڕۆژی جارێک هاتۆتە ئەم ژوورە، بەڵام ئەمجارە جیایە، هەست بە ترس و لەرز دەکات، دەلەرزێ، وەک بلێی ئێستا دەیگرن و تێر دەیکوتن، یان ڕادەستی پۆلیسی دەکەن، زۆر دەترسێ. ژوورەکە شتێکی وای تێدا نییە، کانتۆرێکی گچکەی سێ دەرگا کە هیچیان کلیل نەدراون، هەندێ بزگوڕ، لەو لایەوە هەندێ قاپ و قاچاخ و دۆڵکەیەک و چەند پەرداخێک، لبادێک بە درێژایی ژوورەکە، جێی

خەوتنی پیری گەڕیدەش کە دۆشەکێکی تەنکە کەوتۆتە بەرانبەر دەرگاکەوە، لای دەرگاش بەلای چەپ و لە بن پەنجەرەکە بەرماڵە هەمیشە راخراوەکەی پیری گەڕیدە، کەم بەرماڵەکە هەڵدەگرێتەوە، بە دیوارەکانیشەوە سێ چوار وێنە و هەندێ گوڵینگ و تەزبێح و دوو سێ خەنجەری گچکۆکە هەڵواسراون و تەواو. ئیدی کوێ بگەڕێ و بە دوای چیدا بگەڕێ؟ هیچی نەدیتەوە، لە ژوورەکە خول خول دەخولیتەوە، نازانێ بە دوای چیدا دەگەڕێ، هێندە گەڕا و سووڕا، سەری گێژی خوارد، چەند جار بە سەر بەرماڵەکەش کەوتبوو، پیسی کردبوو، باشبوو هەستیپێکرد، دایکی دەیگوت:

گوناهی گەورەت دەگاتێ ئەگەر بە پێڵاوەوە بە سەر بەرماڵ بکەویت.

هەڵیگرتەوە، خاوێنیکردەوە، ماچی کرد و سێ جار لە سەر یەک تۆبەی کرد. دەیویست بەرماڵەکە لە جێی خۆی دابنێتەوە، لە نیگایەکدا جێی بەرماڵەکەی جیا هاتە پێش چاو، جێی بنە مەنجەڵێک لە عەردی بن بەرماڵ و عەردی چاوەکە نەدەچوو، وەک بڵێی تازە هەڵکەندرابێ و پڕ کرابێتەوە وابوو، سەرێکی بە دەرێ داگرت، پیری گەڕیدە و نەنەخان وەها چوونەتە ناو قسانەوە، تا ئێواریش لێنابنەوە، وێدەچێ قسەی سوڵتانە شێت راست بێ!

بە شیشـــەیەک کەوتە هەڵکـۆڵین، نەرم بـــوو، هەڵــکەنە هەڵکەنە خێرا هەڵکەنە. دەنگی دەرگای حەوشـە هـات، تـــێکەوە، پــڕکەوە، پێڕانەگەیشـــت، کـــچ لە ســـەر ســـەری راوەستا:

+ ئەوە چی دەکەیت؟

- هـیچ، ئەوە... تـۆ لە دەرگـا راوەسـتە، ئەگەر کەسـێک هات پێمبڵێ، پاشان تێتدەگەیەنم.

+ باشە

قـۆرت گەیشــتە سـاخە و هیچـی نەدیـتەوە، بە خێرایـی پڕیکردەوە، بەرماڵەکەی لە سەری راخستەوە. وەک هەرێی بە کچ دابوو، سەرهاتی زگپڕبوونی خاتوونی بۆ گێڕایەوە، بەڵام هەرێی لێ وەرگرت کە بۆ کەسی نەگێڕێتەوە، کچش سەری سوورِما و هیچی تێنەگەیشت.

چاوی لێیە، پیری گەڕیدە هەر لەگەڵ پێ خستنە سـەر دەرگـا، هەسـتدەکات هـۆدەکە پشـکنراوە، چـووە ژووری، زۆری نەبرد هاتە دەرێ و رووی کردە کوڕ:

پەلەت کرد!

کوڕ:

پەلەم کرد، بەڵام چ تێنەگەیشتم.

پیری گەڕیدە:

خاتوون بە بن بەرماڵەکە زگی پڕ دەبوو، ئیدی دووگیان نابێ.

کوڕ:

بە چی؟

پیری گەڕیدە:

بە فیشـەک، ئەو فیشـەکانەی بابـت لە شـەوی ڕۆیشـتن بۆی دەرنەچوون.

دایک سەرکۆنەی کوڕی کرد، شکایەوە و هەستپێکرد هەڵەی کردووە و نەدەبوو لە ژوورەکەی پیری گەڕیدە بە دوای شتدا بگەڕێت. دایک کوڕی تێگەیاند کە خاتوون و فیشەک ڕازە و نابێ کەس بزانێ، گوڵناریش نابێ بزانێ، ئاشـکرابوون وێرانکردنـی مـاڵ و گـرتن و کوشـتنی بە دواوەیە. دایک گوتی:

لە سـەرمانە نـزا بکەیـن لە بـازگە گومـان لە خـاتوون نەکـرێ و دەسـت لە زگـی نەدەن، ئاشـکرابێ ئـێمەش تێدەچین، نازانم بۆ ئەوجارە دڵم دەترسێ؟

کوڕ لە ترسی دایکی ترسا، هەبێ نەبێ ترسـێ لە ڕێیە، وەرنا دایک لە خۆوە ناترسێ. ئەو ڕۆژە کچ پێیەکی هەر لە ماڵی کوڕ بوو، کوڕ بە چرپە دەیگوت:

پێویستە نزابکەین شتی خراپ روونەدا.

کچ پرچی لە سەر چاوی لادەدات:

نزای چی، بە َمن نالێی چ لە رێیە رووبدات؟

هەناسە هەڵدەکێشێ:

نازانم، هیچ نازانم، بەڵام با هەر بپارێینەوە تا هیچ بەڵایەک روونەدات.

تاریک داهات، بە فەرمانی پیری گەڕیدە دایک و هەر سێ منداڵەکەی لە ماڵ دەرچوون، گوێی لێیە پیری گەڕیدە دەڵێتە دایکی:

کچم، کێشەکە خاتوون نیە، بیستوومە هەڵدەکوتنە سەر ماڵە بەچیاکەوتووان، کچەکەی نەنەخانیش خۆی شاردۆتەوە.

چوونە ماڵی دەروێش کە بە مزگەفتەکەوە بوو، ماڵێکە کوڕ هەستدەکات بۆنی قورئانی لێدێ، دیوارەکان بە ئایەت رازاونەتەوە، جۆرێک لە ئارامی خستە دەروونییەوە.

ئەو شەوە هەموو بیری بە دەوری زگپڕبووندا دەخولێتەوە، دایکی گوڵنار ئەگەر لەو ساڵە زگی پڕ نەبا، بابی نەدەکوژرا. خانزاد ئەگەر زگی پڕ نەبا، نەدەکوژرا. خاتوون ئەگەر زگی خۆی بە فیشەک پڕنەکردبا، بازگە چیان لێی دەویست؟ چەند شەوێک لە ماڵی دەروێش

مانەوە، ئۆقرەی نەدەگرت، دەیویست سەر لە ماڵ، لە پیری گەڕیدە بداتەوە، سەر لە داربی بداتەوە، دایکی ڕێینەدا. بەوەی باشبوو لە پێش قوتابخانە گوڵناری دەدیت، لە هاتن و ڕۆیشتنەوە یەکتریان دەدیت و لە یەکتریان دەپرسی. گوڵنار پێدەچوو بزانێت بۆچی نایەنەوە ماڵ، بۆیە لەو بارەوە پرسیاری نەدەکرد، هاوار پرسیاری داربی دەکرد، گوڵنار دەیگو:

پیری گەڕیدە و نەنەخان کز و مەلوول لە بنی دانیشتوون.

دەگەڕینەوە ماڵێ، کۆتایی ساڵی خوێندن هات و وەک ساڵان منداڵانی داربی بە یەکەم دەرچوون، بەڵام کوا تۆڵەستێن جوانترین دیاریان بۆ بهێنێ؟ کچ دوو کرێمستی سووری لە دەستە، کوڕ گوتی:

یەک کرێمستیمان بەسە.

کچ پێکەنی، کوڕ کەمێ بە سەر خۆیدا شکایەوە، لێی وەرگرت و...

ئەو هاوینە نە چێڵ مابوو، نە ڕێی ئەوێ وەک جاران بێ کێشە بوو، تا بچنە بن دار خورماکە، گەمەی دارخورمایی دەستپێبکەنەوە، ژماردنەکە تەواوبکەن کە ئێستا ڕەنگبێ کونی نوێشی تێکەوتبێ، زۆر جار دەبیستن رووی گولله لە دارخورماکەیە، بەڵام تا داربی مابێ

منداڵانی داربی خەمیان نیە، گەمەکانی سێبەری داربی لە گەمە جوانەکانن.

ژێـر بە ژێـری هەواڵـی مردنـی خـاتوون هـات، کـوڕ سەرهاتی مردنەکەی لە زاری پیری گەڕیدەوە بیست:

لە بازگەکـــان دەرچـــوو، فیشـــەکەکانی گەیانـــدبووە بەچیاکەوتووان، فیشـەکەکانی ئیمە نـا، هـی ماڵێکی دی. لە گەڕانەوە، لە هێلـی تخـووبی شـۆرش و حکـومەت دەبێـتە تەقە، گوللەیەک بە سینگی خاتوون دەکەوێت، لەوێ گیان دەسپێرێ و دەنێژرێ.

هەر لەو سەروبەندە لە رادیۆوە هەواڵی لە سێدارەدانی لەیلێیەک بڵاوبۆوە، خەڵک هەموو فرمێسکیان بۆی رشت، سـەرت بە هەر کۆڵانێکـدا بە هەر ماڵێکـدا دەکـرد (لەیلـێ، لەیلـێ) بـوو، بەڵام کوڕ لەیلێی نەدەناسی، گریانی وی بـۆ خـاتوونە، دەیویسـت هـاوار بکات: خەڵکینە بـۆ خـاتوونیش بگـــرین. حەیفـــی هـــات کە کەس نـــازانێ خـــاتوونیش گەشـمردەیە، حەیفـی هـات کە لە رادیـۆوە نـاوی خـاتوون نەخوێندراوەتەوە.

دەبینـێ، دایـک هێنـد گریـاوە هێنـد گریـاوە، چاوەکـانی بوونەتە دوو گۆمیلکەی خوێن، سـەرەتا وای زانـی ئەویـش بـۆ لەیلـێ دەگریـێ. بەڵام گـوێی لە دایکـی بـوو، لە نێـوان هەنسـکەکانی خـاتوون خـاتوونی بـوو. کـوڕ بە کـوڵ بـۆ خـاتوون گریـا، دوا وێـنەی خـاتوونی هەوکەش لە نـاو

چـاویەتی، ژنـێکە لە تەمەن لە دایکـی گەورەتـرە، بە بەژن هەنـدێک کـورتترە، کراسـێکی مەیـلەو شـینی درێـژی بە باخەڵی لە بەرە، کەوێیەکی رەش، چەفیەکی سپی و رەش، زگی گەورەیە وەک بڵێی لە سەر مانگ و رۆژی خۆیەتی، هێواش شەقاوان داوێ، گران زۆر گران دەڕوات.

فرمێسک بە چاوی کچەوە دەبینێ و پێیدەڵێ:

تۆ بۆ لەیلێ دەگری یان بۆ خاتوون؟

کچ بە شەرمەوە:

کاتێ دەبینم تۆ دەگری، فرمێسکم راناوەستێ.

چاوی خۆی دەسڕێ:

من بۆ خاتوون دەگریم.

کـچ خـاتوونی نەدەناسـی، بەڵام وەک کـوڕ بـۆی گریـا، گریـان وەک چۆن بۆ خـانزاد گریـان، ئاواش بـۆ خـاتوون گریان، پیری گەڕیدە لە چۆکی خۆی دەدا:

حەیـف، حەیـف بـۆ ئەو ژنە قارەمانـانە، بە راسـتی قارەمان بوون، ئیدی شۆرشە، خاتوونیش گەشمردە دەبێ لەیلێش گەشمردە دەبێ.

بە هەنسکەوە دەڵێتە پیری گەڕیدە:

خانزادیش گەشمردەیە؟

پیری گەڕیدە کەمێک داما:

ئەویش...

لەو ساتە ترومبێلێک لەو بەری کەندێ ئیستۆپێکی گرت، دەنگی تایەکانی دەنگی پیری گەڕیدە و چۆلەکەکانی ناو داربی خنکاند، هێندەی گەردەلوولێک تۆز و خۆڵی بۆ کۆڵان هێنا، کۆمەڵێک چەکدار دابەزین، بە بێ سلاوکردن هاتنە بن داربی. کوڕ زوو بە کچی گوت بچێتەوە ماڵی خۆیان، بەڵام بەقسەی نەکرد، چەکدارەکان کە هەندێکیان جلکی سەربازییان لەبەر بوو، بە عارەبی چەند قسەیەکیان لەگەڵ پیری گەڕیدە کرد و رۆیشتن.

چەکدارەکان لە بیریان بردەوە، نەیانهێشت پێبکەوێت داخوا خانزاد گەشمردەیە یان نا، بەڵام ئەوەی لە بیرنەبردەوە کە لەگەڵ کچ هەرێیان دابوو سەردانی گۆڕەکەی بکەن. دووە حەفتەی جارێک دەچوونە سەر گۆڕەکەی، ئەوڕۆ رۆژی چوونە سەر گۆڕستانە. رۆژانەی خۆیان بۆ ئەو رۆژە کۆدەکردەوە و لە مستی حەمەدی قورئانخوێنیان دەکرد، تا لە سەر گۆڕەکەی خانزاد قورئان بخوێنێ و خودا لە بەهەشت بیهێڵێتەوە. دیتیان لە پێش دەرگای مزگەفتی لای گۆڕستان، لە نێوان حەمەد و جەبار مشتومڕە، گوێیان لێیە، حەمەد بە هێواشی دەڵێ:

دووبارەی دەکەمەوە هەر کەسێک لە رێی نیشتمان بمرێ، شەهیدە، چ ژن چ پیاو کە دەکوژرێ شەهیدە.

جەبار بە تووڕەییەوە:

وا مەڵێ، گوناهبار دەبیت، بەچیاکەوتوو خۆ لە ڕێی خودا شەڕ ناکات شەهید بێت، شەهیدی چی؟

لەو ساتە پتر لە جەبار بە رقدا دەچێ و بڕیاردەدا تۆڵەی لێبکاتەوە، تۆڵەی پێشتریشی لێبکاتەوە، حەمەد بە دیتنی منداڵەکان جەبار بە جێدێڵێ و بەرەو گۆڕەکەی خانزاد هەنگاوی گورج داوێ. حەمەد چەندی دەنگی بڵندتر دەکرد، کوڕ دڵخۆشتردەبوو، وای دەبینی خانزاد بەهەشتیترە.

کچ تێدەگات کوڕ نیازی خراپە، دەیەوێ لەگەڵی بمێنێتەوە، ڕێنادا، تێیدەگەیەنێ ئەگەر لەگەڵی بێت، ئاشکرادەبن، تا دەرەوەی گۆڕستان پێکەوە دێن، کچ دەڵێ:

بەڵام نەکەی لە ساتی قورئانخوێندندا لێیدەی، گوناهت دەگاتێ.

تێ دەبێتەوە و بە پشت مزگەفتەکەوە خۆی دەگەیەنێتەوە گۆڕستان. بە پێدزە و کووڕە کووڕ بە نێوان کێلەکاندا دێ و بە دەنگ جەبار دەبینێتەوە، لە سەر گۆڕێک قورئان دەخوێنێ. کوڕ خۆی لە پەنای کێلێک ناوە، چاو دەگێرێ، کەس لێی نزیک نیە و نابینرێ، باش ڕێککەوتووە، لە نێوان کێلانەوە لایەکی دەموچاوی قورئانخوێن جوان دیارە، هێندە دووریش نیە. بەردێکی ڕەشی لە لایەکەوە

قرنجاو دەخاتە ناو کەوڵی دارلاستیقەوە و سێرەی لێدەگرێ، سێرە لە بن کەپوو لە لا لێوی دەگرێ. بە نیازە ددانی قورئانخوێن بشکێنێ قسەی کچەی بیردەکەوێتەوە، نابێ لە ساتی خوێندندا لێی دا. جەبار دەڵێی زانیویەتی سێرەی لێگیراوە و چاوەڕێی لێبوونەوە دەکرێ، لێنابێتەوە، درێژی دەکاتەوە، کوڕ خۆی پێناگیرێ و دەشترسێ لەو چاوەڕوانیەدا کەسێک بە سەریدا بێ و ئاشکرا بێت. ناوی خودای لێدەهێنێ، نزادەکات کە لای تیژی بەردەکەی پێبکەوێ، کەمێک دەستی دەلەرزێ و دەیهاوێ، بەرد سەردەکا و بە لێو نا بە لا بڕۆی دەکەوێت، جەباری قورئانخوێن هێندە لە خۆی هەڵدەدا، قورئانی لە دەست دەکەوێتە سەر گۆڕەکە، هەڵدەستێتە سەر پێ:

ئەوە چ دێڵە سەگێک بوو؟

لە بەر خۆیەوە دەڵێ:

ئەوە تۆڵەی خانزاد، راوەستە هێشتا ماوە.

بەردێکی دی تێدەگرێ و ڕێک لە سەری ئەو پەنجانەی دەدا کە خستبوونیە سەر جێی بەردی خانزاد، دواتر کوڕ ناوی لەو جێ بەردە نا، بەردی خانزاد، جەبار بە دەنگی بڵند:

هەی قاحپە دایک، نابێ بسمیلات لێ کرابێت.

کوڕ بە هێواشی گوتی:

ئەوەش تۆڵەی شەهید، راوەستە تۆڵەی دایکیشم ماوە، دایکی من قاحپەیە!

بەردی سێیەمی لە چەنەگەی گیرکرد، ئەگەر چاوی ریشکەوپیشکەی نەکردبێ، خوێنی بە دەموچاوی قورئانخوێنەوە دیت. بە پشتەوەدا کوورە کوورِ هەڵات و گوێی لە قورئانخوێن بوو، جوێنی پیس پیسی دەدا، لەپڕ پیلی کورِ کەوتە ناو دەستێک، چاو هەڵدەبڕێ کورێکی جاحێلە پێشتر چەند جاری لە نزیک حەسارەکە دیتبووی:

ئەو بەردانەت بۆچی لە قورئانخوێن دا؟

خۆی راپسکاند، بەڵام لە ناو دەستێکی وادا نەبوو، هەلی دەربازبوون لە ئارادابێت، کەمێک بێدەنگ بوو، گوتی:

ئەو قورئانخوێنە، دەڵێ خانزاد ناچێتە بەهەشت.

پیلی بەردا و پێیگوت:

زوو برۆ با نەتبینێ.

هاوینەکەی لە سالان گەرمتر دیارە، بەڵام هەر کاتێک با لە لای چیاوە هەڵدەکات، فێنکدەبێتەوە، بە خۆی دەڵێت:

بایەک لە لای بابمەوە بێ، فێنکە زۆر فێنکە.

بەو با، با هەمیشە لە سەفینەوە هەڵیکردبا و بە پێش دەرگای ماڵی گوڵنارەوە بەرەو ماڵێ و داربی هاتبا، بە کورِ

با هەموو بایەکان سەر بە سەفین بان. شەوان ئەگەر تەقوتۆق نەبا لە سەر بان دەنووستن، تا خەوی لێدەکەوت، چەند جار هەڵدەستایەوە سەرپێ و دەیڕوانیە حەوشە و سەربانی ماڵی گوڵنار و بە تاریکاییشدا رووەو چیا سەری هەڵدەبڕی.

شەوێ لە شەوان کە هەیوەشەوێک بوو دەرزیت لە سەر عەرد هەڵدەگرتەوە، چاوی کەوتە سەر زگی دایکی کە لە سەر پشت راکشابوو. ئای، زگی گەورەیە، دەڵێی زگی هەیە! باوەڕی بە چاوی خۆی نەکرد، چەند جار چاوی داخست و کردیەوە، زگ گەورەیە، لە جێی خۆی هەستا، سووڕایەوە ئەو دیو، زگ گەورەیە، بیری بۆ خواردنی ئێوارە چوو، خواردن چی بوو؟ وێدەچێ دایکی نانی زۆر خواردبێ، خواردنی زۆر زگ گەورە دەکات، دەستی بە زگی خۆشیدا هێنا بزانێ گەورە نەبووە، نا. رەنگبێ دایک تووشی نەخۆشی بووبێ، نەخۆشی هەیە زگ هەڵدەپەنمێنێ. کوڕ ئەو شەوە چەندی هێنا و بردی نەگەیشتە سەرەداوێ. رۆژبۆوە، تیچاوێکی لە سەر زگی دایکیەتی، دوای حەفتەیەک پتر زگ گەورەتر بوو، رۆژ بە رۆژ گەورەتر دەبوو، گومانی نەما کە دایکی زگپڕە، لە خۆی دەپرسی چۆن دەبێ؟ خۆ باب لێرە نیە، ترسا زۆر ترسا، ئەو زگپڕبوونە لە کوێوە هات؟

خۆ وەک و هی خاتوون نیە، پاشۆڵێک فیشەکی تێپێچابێت، نا، تێناگات. دەڵێ تۆ بڵێی وەک زگەکەی خانزاد

بێ، کێ زگی دایکی پڕکرد! نا، شتی وا نابێ، دادەما، کەمتر گەمەی لەگەڵ خوشک و براکەی دەکرد، کەمتر دەچووە بن داربی. کچ زۆر کۆشا شتێکی لێدەربێنێ بەلاش بوو. دەبێ دایک هەستی بە نیگەرانیی کوڕ کردبێ، بۆیە، ئێوارەیەک لە سەر بان، قسەی بۆ کرد، تا تێیگەیاند زگەکەی لە باوکیەتی زۆری ویست، ئیدی کوڕ بە ئاسوودەیی نووست.

سبەی لەگەڵ داربیەکە ئاسایی بووەوە، پووشکاخەزێکی گەورەی دروستکرد، جوان دروستدەکات، لە تۆڵەستێنەوە فێربووە. بانگی کچەی کرد، هەڵیاندا بڵند بوو، نزایکرد رووەو چیا هەستێ، نزا نەگیرا، با رووە و ئەوێ هەڵینەکرد. پووشکاخەز بەرزبۆوە، دوو سێ دارتێل بەرزبۆوە. چووە خەیاڵەوە، ئەها تۆڵەستێن لە سەر دوندێکەوە بە دووربینەکەی پووشکاخەزەکە دەبینێ و دەیناسێتەوە، دەزانێ هی کورەکەیەتی، تەنها ئەو پووشکاخەز لە شێوەی پووشکاخەزی تۆڵەستێن دروستدەکات، پێویستە نامەیەکی بۆ بنێرێ، دەڵێتە کچ:

داوەکە بگرە، پێنووس وکاخەز دەهێنم.

هێنای و نووسی:

بابە، دایکم دووگیانە.

به داوەکەیەوە کــرد و ڕۆیشـــت، کــچ شــتێکی گــوت، نەیبیست، لەبەر دەنگی بابی نەیبیست، گوێی لێیە لە سەری چیاوە نامەکە دەخوێنێتەوە!

ساڵی خوێندنِ داهاتەوە، تۆڵەستێن دیار نیە تـا منداڵانی داربی بباتە بازاڕ و بە دڵی خۆیان جانتا هەڵبژێرن. پار ئەو دەمـانەی خــۆی هــاتەوە بەر چــاو و چــاوی پــڕ بــوو لە فرمێسک. بـاب هەردووکیانی برد، لە سـەری ئەو کۆڵانەی کە ڕووی لە مزگەفتـــی حـــاجی لەقـــلەقەکە بـــوو، لە جانتافرۆشـێک، کـچ جانتــایەکی ڕەنــگ ڕەشــی هەڵگـرت، خۆیشی جانتایەکی سپی، باب دیاربوو سەری سوڕما لەو هەڵبژاردنە وبە پێکەنینەوە گوتی:

من چ لە ئێوە ناگەم

کچ گوتی:

من زۆر حەزم لە ڕەنگی ڕەشە.

کوڕ بەشەرمەوە:

منیش ڕەنگی سپی.

قوتابخـانە بـێ سـروودە، بـێ سـروودی گەرم و گـوڕە، هەنـدێک سـروود بە خـاوی و پچڕپچڕ دەگـوترێتەوە. کـوڕ هەسـتدەکات کەس ئەو سـروودانەی ئەزبەر نـیە و حەزی ئەزبەرکردنیش لە کەسدا نیە. خواخوایەتی زوو بچێتەوە و

زوو ئێواره دابێ، تا له رادیۆکەی پیری گەڕیدەوە گوێ له ئەی رەقیب و ئەوانیدی بگرێت.

رۆژ دوای رۆژیش چەکدار پتر دەبن و ناوە ناوە بە ترومبێل بە کوڵانەکاندا جرت و فرت دەکەن. سەرباز لێره و لەوێ بە دیاردەکەون، بەڵام چادریان هەڵنەداوە و جێگیر نین. بیستی لە دوور زۆر دوور لە پشت دار خورماکە و چەند جێگەیەک هەڵیانداوە، شەوانیش تەق و تۆق هەیە، نازانرێ کێ لە کێ دەکات، دایکیش زوو دەڵێ:

مەترسە ئەو تەقانە روو لە ئێمە نین.

دەبینێ پیری گەڕیدە رۆژ دوای رۆژ دڵخۆشتر دیارە، پێویست ناکات بپرسێ، دەزانێت دڵخۆشییەکەی هی رادیۆیە، رادیۆ قسەی خۆش بکات، پیری گەڕیدە دڵخۆشە، ناوە ناوە دەڵێتە کوڕ:

کوڕم، زۆر نەماوە بابت بێتەوە، بە سەرکەوتوویی دێتەوە، هەر دیتت شار لە جاش و سەرباز و ئەمن پاکبۆوە و پێشمەرگە هاتنەوە.

کوڕ لە خۆشیدا لە خۆی هەڵدەدا و کچی بە سەما دەخست.

زستان داهات، لە سەر بانەوە چاو دەداتێ، چیا سپی سپییە. بابی لە ناو بەفرێیە، بەفر هات، گەیشتە لق و پۆی داربییەکەش. ساقۆ قاوەییە درێژە تۆکنەکە لەبەردەکات،

کەمێک بۆی تەسکبۆتەوە، ساقۆ پەمبەییەکەی کچش توکنە و پڕ بە بەریەتی. وەبیریدێتەوە زستانی پێشوو بابی ئەو دوو ساقۆیەی بۆ هێنان و گوتی لە شێوەی رووسین. زستانی پار هەردووکیان پڕ بە بەریان بوو. بە خۆی دەگوت، دەبێ کچ هەڵێنەدابێ، یان من زۆر هەڵمدابێ، بە کچە دەڵێ:

دەمێکە خۆمان نەپێواوە.

کچ پێکەنینێکی کرد، کێ دەزانێ تا کەی لە گوێی کوڕ بە تازەیی مایەوە! پێکەنینێکی کچانە و شیرن بوو، کوڕ پێکەنینی وای نە لە کەس و نە لە کچە نەبیستبوو، چەند لەمێژە ئەو پێکەنینەی لە کوێ شاردبۆوە، پێکەنینێکی درێژ، زۆر درێژ لە قژی کچد درێژتر، زۆری برد تا پێکەنینەکەی وەستا، نەوەستا، لە کەلێنی پێکەنینی پساوەوە گوتی:

ئەوە دەنگت بۆ وا گڕ بووە؟

کوڕ سەری سوڕما! باشە دەنگی چی لێهاتووە، بۆ گڕ بووە، کچ بە پێکەنینێکیدی دەنگگڕی لە بیری کوڕ بردەوە و گوتی:

دەی با بچین خۆمان بپێوین.

چوونە بن داربییە تەڕەکە، ئەو جارە بزماریان لە بری گەچ بەکارهێنا، لەو پێوانە کوڕ لە ئاست کچ دوو پەنجە

کــورتی هێنــا، کەمێــک دڵتەنــگ بــوو، کــچ لە چاویــدا دڵتەنگییەکەی خوێندەوە، پێکەنینێکی دی بۆ کرد و گوتی:

تۆ دایتە قەڵەوی، من بەژن، خەمت نەبێ دەگەیتە من.

بەفر زەوی سپی کرد، پتر کەوت، ورد و درشت هـاتنە دەرێ، لە گشــت لاوە شــەڕە بەفــرە. خوشــک و بــراکەی هــاواریش بە دەســتە وردیلانەکانیــان بەفــر هەڵــدەگرن و دەهاوێن. نەنەخانیش هـات، لەگەڵ پیری گەڕیدە دوو سێ تۆپەلیان بۆ یەکدی هاویشت. منداڵانی داربی شەڕەبەفرێکی جوانیان کرد، لەو دەمە کوڕ خـانزادی بیرکەوتەوە کە پـار زســتانێ شـــەڕەبەفری لەگەڵ دەکــردن، کــچ لە خەیــاڵی دەرهێنا و گوتی:

وەرە با بووکە بەفر...

قســەکەی تەواو نەکــرد، دایکــردە بارانێـک هێنـدەی تـا بیسـت بژمێرێ، عەرد سـپێتی پێوە نەمـا، بووە یەک لیتـاو مەپرسە. لەو دەمە براکەی گوڵنار هات و خۆی لێ تووڕە کرد و بردیەوە.

***

*((ئەوڕۆ ١٢-١٢-١٩٧٤، دایکــم ژانــی گــرت، بـابم لێـرە نەبـوو مامـان بێنــێ، کـاتژمێر ١٢ی نیـوەڕۆ کـوڕێکی بـوو، پیـری گەڕیـدە نـاوی نـا گیڤـارا، ئەگەر بە دەسـتی مـن بـێ، گیڤارا دەدەمە ماڵی کچی داربی))*

ئەو چەند رستەیە دەستپێکی نووسینەوەی یادەوەریی کوڕی داربییە، کە دواتر لە ژێر ناوی (کریمستی) نووسی و بە دنیادا بڵاویکردەوە.

زۆری نەماوە َسالٚ وەرسووڕێتەوە، لە رۆژمێری کوڕی داربی سالٚی نویٚ لە ١١ی ئازارەوە دەستپێدەکات، چوونکیٚ لەو رۆژە بابی بۆ پەیدا بوو. لەو رۆژە بابی هاتەوە، هەر لەو رۆژە بابی رۆیشت و تا ئێستا نەگەڕاوەتەوە، بە قسەی رادیۆکەی پیری گەڕیدە بیٚ ناگاتە سالٚی نویٚ تۆلەستێن دێتەوە و لە هاتنەوەدا تۆلەی سالێک دووری و ناخۆشیەکان دەکاتەوە و ئیدی دابڕان کۆتایی دیٚ.

چەند رۆژێکی ماوە بۆ سالٚی نویٚ، کوڕ دەبینیٚ پیری گەڕیدە برۆکانی لێکناوە و ئاگر لە چاوی دەباریٚ، تا هێزی تێدابوو رادیۆکەی بە دیوار دادا. کوڕ لەرزی، گریا، هەبیٚ نەبیٚ کۆتایی دنیایە، پیری گەڕیدە رادیۆ بشکێنیٚ، نیشانەی کۆتایی دنیایە. کوڕ کۆتایی دنیای لە رادیۆ شکانەکە خوێندەوە. دایک کزە و قسەی بۆ ناکریٚ، کوڕ زراوی چوو، گومانی نیە کە باب تووشی بەڵایەکی گەورە بووە، مردووە. هاوار بە هاوارکردنەوە دەپرسیٚ، کەس وەڵامێکی روونی ناداتەوە، لە ناو فرمێسک و هاوارەکانی خۆی تەنها گوڵنار دەبینیٚ، ئەویش دەگری و دەیەویٚ باوەشی پێدابکات، شەرم دەیگریٚ. لەودەمە خاڵ دەگاتیٚ، دەست لە ملی دەکات، ماچی دەکات، فرمێسکەکانی دەسڕێت و پێیدەڵیٚ:

تەواو، شتێک نەما بە ناوی شۆرش، چاوەڕێبکە بابت دێتەوە.

قل قل دەهاتنەوە، پیاوە بە چیاکەوتووەکان دەهاتنەوە، پیاوە رۆیشتووەکانی حەسار هاتنەوە، براکەی خانزادیش هاتەوە، هاتنەوە پیاوەکانی ئەو بەری کەندێ هی پشت مالّی کچی داربی هی سەرەوەی مالّی شەلەی شامینۆکفرۆش، هەموو دەرکەوتنەوە، بابی دیداریش هاتەوە. ئەوەی دیار نیە تۆلەستێنە، ئەو کوڕەی زگی خانزادیشی پڕکرد سۆراخی نیە.

دایک منداڵەکانی بردە مالّی کچی داربی، لەگەڵ پیری گەڕیدە و کوڕی داربی بەرەو مزگەفتەکەی دەرویش رۆیشتن. بیستیان مزگەفت دارماڵە لە گەڕاوە، دەیانهێننە ئەوێ و لەوێوە دەیاننێرنەوە مالّێ. گەیشتن، کوڕ کۆمەلّێک پیاوی سەر و ریش هاتووی چلکنی دیت، لە حەوشەی مزگەفتەکە لە سەر چیچکان دانیشتبوون، سیمایان رەنگی مردووی گرتبوو، دەتگوت کەڕولاڵن، ورتەیان لێوە نەدەهات. کۆمەلّێک پۆلیسیشی لە پێش دەرگا دیت، بەڵام نایەتەوە بیری چیان دەکرد، لەهیکڕا دایکی بە دەنگێک چ لەو دەنگەی نەدەچوو کە لە لێیەوە بیستبووی:

کوڕە حوسێن، ئەوە تۆی!

سەر و ریش هاتوو، تۆزی لە داوی سپی، جەمەدانییەکەی لە مل ئاڵاندبوو، لە بن دیوار لە نێوان دوو

پیاوی وەک خۆی لە سەر پارچە گوشێک دانیشتبوو، پێی لێراکێشابوو. دایک و پیری گەڕیدە غاریان دایێ، ڕێ نیە کوڕ بیگاتێ، کەلێنێکی کردەوە و خۆی بە باوەشی دادا. هەو بوو، باب بوو، سەیرە، باب بۆ هەڵناستێتە سەر پێ؟ دایک دەگری، پیری گەڕیدە دەگری، باب دەگری، قیتیانکردەوە. ئای، دوو دارشەقی لە بن پیلە. بە دیتنی دارشەق لەرزی، لە هەنگاوی یەکەمدا چاوی کەوتە سەر دەلینگی چەپی بابی کە بە بۆشی دەجوولایەوە. لە چۆکی بۆ خوارەوە شەرواڵ بە بەتاڵی دەجولایەوە. لە هارژنی دا، باب راوەستا. بە گریانەوە بانگیکرد، لە سەر دارشەقەوە لە باوەشی گرت، گوتی:

مەگری هاوار، کوڕم مەگری، شۆرشێک چوو، پێی من هەر هیچ نیە.

کوڕ پتر هاواریکرد. باب هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا:

مەگری کوڕەکەم، بە یەک لاقیش دەتوانم بابایەتیت بۆ بکەم و بە سەر منارەی چۆلیش بکەوم.

کەمێک ئارام بۆوە و هێواش هێواش بە پێی تۆڵەستێن، بەرەو ماڵ بوونەوە، هاوار لە دواوە دەڕۆیشت و چاوی لە سەر دەلینگە بەتاڵەکەی تۆڵەستێن هەڵنەدەگرت. ئەو شەوەی بیردەکەوتەوە کاتێ تۆڵەستێن خۆی بەست و دەمانچە لە نێک، تفەنگ لە شان، ریشی تراشی و قیت و قۆز بە دوو پێی ساخەوە، گورج وەک شێر لە ماڵ

دەرچوو. ئێستاش بە یەک پێ و بە دوو دارشەقەوە و بە بێ چەک و رەخت، بەشەلە شەل بە بن نمەی باراندا بەرەو ماڵ دەبێتەوە.

نەگەیشتبوونە دارتێلەکەی ئەو بەری کەند. باران توندی کرد، رێژنەیەک دایکرد نەبێتەوە، لەو ساتە پێ و پێمەرەی بابی هاتەوە بەر چاو، هەناسەیەکی لە کزەبای پایز سارتری هەڵکێشا. ئیدی باب کاری پێمەرەکاری بۆ ناکرێت. بە لای بەردەبازەکە پەرینەوە، تا گەیشتنە ژووری، ئاویان لێدەچۆڕاوە. دەیویست لە ساتی جلکگۆڕین پێی بابی ببینێ، بزانێ پێی بڕاو چۆنە، بەڵام بابی لە کاتی شەرواڵ گۆڕین پێیەکانی خستە بن لێفەوە و نەیهێشت کەس ببینێ. منداڵەکان لەگەڵ گوڵنار و دایکی هاتنەوە، باب سەرەتا گوڵناری لە ئامێز گرت و ماچی کرد و بە سینگی خۆیەوە نووساند، خوشک و برای لە ئامێز گرت، دایک ساواکەی بۆ راگرت و گوتی:

ئەوەش هی تۆیە، گیڤارای ناوە.

باب تەماشای دایک دەکات، چاوی زەق دەبێتەوە، دەم دادەپچڕێ، باوەش دەکاتەوە و قسەی بۆناکرێ، پیری گەریدە بە پێکەنینەوە:

کوڕم ئەو کوڕەمان لە تۆ شاردبۆوە.

باب ماچێکی نەرم لە ساوەکە دەکات، لە سەر کۆشی خۆی دادەنێ و چەند دڵۆپە رۆندکێ هەڵدەوەرێنێتە سەر بەروانکەکەی.

ئەو شەوە لە خەیاڵی پێیە رۆیشتووەکەی بابی بوو، بۆچی نەما! دەبێ لە کوێ کەوتبێ! کێ هەڵیگرتبێتەوە؟ بیریدەکردەوە، پەنجەکانی چیان لێهاتووە، ئەدی نینۆکەکانی، بۆچی لەگەڵ خۆی نەیهێناوە، بەڵکوو تێبخرێتەوە، پێی براو تێناخرێتەوە؟ فرێیداوە، یان لە گۆڕی ناوە؟ ئای پێیەکە، پێیە گەورە بەهێزەکەی بابم، پێیە پڕ مووەکەی بابم، چیت بەسەرهات! ئەدی پێڵاوەکەی! بابم لەمەودوا یەک لنگە پێڵاو دەکڕێ، لنگی راستە، پێڵاوفرۆشەکە یەک لنگ دەفرۆشێ! یان هەردوو تاک دەکڕێ و هی چەپە فڕێدەدا؟ بریا پێیە براوەکەی دەهێنایەوە، بە شتێک تێماندەخستەوە، یان لە ماڵێ هەڵماندەگرت، نەماندەهێشت سەرمای بێ گەرمای بێ، نەماندەهێشت شتێک پێوەی بدات، لە کوێی پێیە براوەکەی بابم لە کوێی؟

دەهاتە سەری پرسیاری پێیە بزربووەکە لە بابی بکات، پەشیماندەبۆوە.

هەستدەکات بەهار لە گەڕەک بە بێ بەهاری تێدەپەڕێ، چوونکێ دڵی کەس بەهاری تێدا نیە. نە کەس دەچێتە دەشت و دەر، نە شایی بە دۆڵ و زوڕنا دەگەڕێ، نە

دراوسێکان هێنده هاموشۆی یەکتر دەکەن. بەوەی باشە داربی هەروەک خۆیەتی، کەسک کەسک، باڵندەکان شەو و ڕۆژ لە خوێندنی خۆیان ناکەون. کچەش هەر کاتی هەبێ، براکەی لە ماڵ نەبێ دێت. خوشک و براش لەوێ نابنەوە، ئێستا ئەو دوو منداڵە ناویان بۆتە خوشک و برا، گەڕەک بە خوشک و برا ناودێری کردوون، ئەگەر تەن بە تەنیش بیابیبینن بکەن هەر بە خوشک و برا بانگیان دەکەن. دیداریش زوو زوو دێ، نەنەخانیش بە لۆژە لۆژ دێ و تاوێ دادەنیشێ. دەبینێ پیری گەڕیدە پرزەی لێبڕاوە، هەندێ قسەی خۆشی بۆ دەکات، بە پێکەنینی دێنێ، بەڵام هەر ئەو دەمە، نەنەخان دەڕوات پیری گەڕیدە وەک خۆی لێدێتەوە. دادەمێنێ، ناوە ناوە سەری گۆچانەکەی لە عەرد دەخشێنێ، وەک بڵێی عەرد خورشتی هەیە و بۆی دەخورێنێ. پیری گەڕیدە پێدەچێت زۆر خەم لە تۆڵەستێن بخوات.

زۆر هەوڵی لەگەڵ دەدەن بێتە دەرێ و بایەک لێی بدا، نایە، تۆڵەستێن خۆی لە ژوورێ پەستایە و نابزوێ. هەموو دەڵێن تۆڵەستێن تۆڵەستێنی پێشان نیە، کوا نە قسەیەک دەکات، نە بابەتێک دەکاتەوە، نە وەڵامی پرسیاران دەداتەوە، ئەوە کەی وەڵامدانەوەیە! ( ئا، نا، وایە، نازانم) تۆڵەستێنی پێشان دەزانی چەند خزمدۆست و مێواندۆست بوو، ئێستا، هەر ئەوەتا خۆشهاتنت لێ دەکات.

کـوڕ هەسـتدەکات، تۆڵەسـتێن تەماشـای کەس ناکـات، وەک بڵێی چاوبەرەژێری هەمـووانە، دەڵێی هەرێـی زۆری بە خەڵـک داوە و هیچـی نەگەیانـدۆتە جـێ، یـان بەرانـبەر نەیار و ناحەزەکانی دەمکورت دەرهاتووە و قسەی نەماوە.

لەبیریەتـی کە خـاڵی هـاتە کنـی و بەرێـزەوە سـلاوی لێکرد و بۆی نووشتایەوە و رروومەتەکانی مـاچکرد، بەڵام باب سارد و سڕ، بە ناچاری دەستی تەوقەی درێژکرد و بەخێرهاتنەکەشی لە منگەیەک زیـاتر نەبوو، خـاڵ بە سـەر خۆی نەهێنا، گوتی:

حوســـــێنی تۆڵەســـــتێن، خەم مەخـــۆ، مـــــیللەت لە سـەرکردەیەک و دەسـتەیەک و بزووتنەوەیەک گەورەتـرە، ئەوان دێن و دەڕۆن، بەڵام میللەت دەمێنێ.

بـاب تەماشـای بنمیچەکەی کـرد و هیچـی نەگـوت، خـاڵ دەستیپێکردەوە:

خەم لە قاچیشت مەخۆ، چوونکێ لە رێی میللەت بەختت کرد، هەموو خزمەتێکیش لە منەوە.

باب متەقی لە خۆی بڕیبوو، وەک بڵێی کەس لەوێ نیە و هیچی نەبیستووە.

منداڵانی داربی کارتیان بە دەستەوەیە و دێنەوە، هی کچ هەر وەک سـاڵانە ( دەرچـوو بە یەکەم) بەڵام هــی کــوڕ (دەرچـوو بە سـێیەم)، قـوڕگی پـڕ گریـانە، کـچ قسـەی بـۆ

دەکات، دڵیدەداتەوە، بەڵام کوڕ لە ناوەوە بریندارە، وا دیارە بە قسەکانی کچ ساڕێژ نابێ، کچ لە دەوری دەسووڕێ، چ نەما نەیڵێ، پێدەچی ئەوە دوا رستەی بووبێ:

بە خودای بمزانیایە تۆ سێیەم دەبوویت، منیش خۆم سێیەم دەکرد.

لەو ساتە ئەگەر شەرم نەدەبوو، لە باوەشی دەکرد دەمی ماچدەکرد، پێکەنی، لە دڵەوە پێکەنی. وەک ئەوەی بەو قسەیە یەکەم بووبێ، گوتی:

کچێ، بە قەستی خۆم خەفەتبار پیشاندا.

بە پێکەنینەوە گەڕانەوە ماڵێ، باب روو لە داک:

هەر ئێستا بڕۆ بازاڕ و سەرو دیاریی جوانیان بۆ بکڕە.

لە بیریەتی دایک بە دیارییەوە گەڕایەوە، بووکەڵەیەکی جوان بۆ کچی داربی و تۆپێکیش بۆ کوڕی داربی، قەمەرۆکەش بۆ خوشک و برا، لەگەڵ میوە و حەلواو دەرمان مشک و... لەو ساتە لە دەرێ دەنگی (یازدەی ئازار) هات، باب پارەی دا کوڕ کە سەرو یازدەی ئازاریان بۆ بێنێ، بە دەم خواردنی یازدەی ئازارەوە، تۆڵەستێن چاوی لە دەرمان مشکەکە بڕیبوو ک ەلە سەر تاقەکەی سەرەوە دانرابوو، بە پەنجە ئاماژەی بۆ کرد، گوتی:

شیرین ئەوە چیە؟

دایک سەری بۆ تاقەکە هەڵبڕی:

مشکمان زۆربووە، ئەوە دەرمان مشکە.

باب هەناسەی هەڵکێشا:

نا، دەرمان مشک نیە، پێیبڵێ شەشی ئازار، دەزانی یازدەی ئازار وەک ئەو یازدەی ئازارەی دەستمان شیرن بوو، بەڵام شەشی ئازار وەک ئەو دەرمان مشکەیە.

کوڕ لە شەشی ئازارەکە تێنەگەیشت، بەڵام زۆر دڵخۆش بوو بەو قسەیەی بابی، ئاخر لەوەتەی هاتۆتەوە، ئەوە یەکەم جارە خۆی سەری قسە بکاتەوە. دواتر پێکەوت شەشی ئازار ئەو رۆژەیە کە شۆرشی تۆڵەستێن بە ئاوێدا چوو.

مانگی رەمەزان داهات، پیری گەڕیدە هەر یەکەم رۆژ رایگەیاند کە:

ئەو ساڵ میللەتێ مە رۆژووی لە سەر نیە.

هەموو سەریان سوڕما، پیری گەڕیدە چیە لە خۆوە فەتوا دەدات! چما فەتوادان فشەیە، گەمەی منداڵانە! هەبێ نەبێ ئەو پیرە شێواوە، خەرەفاوە، دەنا قسەی ئەوها دەکات؟

پیری گەڕیدە گوێ لە کەس ناگرێ، لە بن داربییەکەوە مـژ لە جـگەرە دەدات و بە دەنگـی بڵنـد فەتـوای خـۆی دەڵێتەوە، تۆڵەستێن زوو گوتی:

وازی لێبێنن، هێندە لەگەڵی پێدامەچن.

بەڵام زۆر کەس گوێیـــــان نەدایە تۆڵەســــتێن. ئەو رەمەزانە کە کەوتبووە وەرزی گەرماوە، سێبەری داربیەکە هەمیشە جمەی دەهات، دەهاتن گوێیان دەدایە گۆتەکانی پیری گەڕیدە. منداڵانی داربی جێی گەمەیان تەسکبووبۆوە و نەیاندەتوانی بە دڵی خۆیان گەمە بکەن.

فەتوای پیری گەڕیدە گەیشتەوە قورئانخوێنەکان، جەبار گوتبووی:

ئەو پیاوە کافر بووە، ئەوی بیکوژێ دەستی کەسک دەبێ.

هەرچی حەمەدە حەمەدە گوتبووی:

ئەو پیرە رەنگە هۆشی لەدەستدابێ، نەک هەر بۆ کەس نـیە بیکـوژێ، دوورنـیە قسـەکانی بە گونـاهیش بـۆ نەنووسرێ.

کوڕ کە بیستی جەبار وای گوتووە، لە دڵی خۆیەوە گوتی:

تۆڵەی پیری گەڕیدەشت لێدەکەمەوە.

ڕەمەزان ڕۆیشت و جەژن هات، پیری گەڕیدە نە ڕۆژێکی گرت و نە شیوی جەژنانەی خوارد. سبەینێکەی وەک ڕۆژانی ئاسایی چایە و ماستی خوارد و جەژنانەی لەگەڵ کەس نەکرد.

پیری گەڕیدە ڕۆژ ڕۆژ لە کورتی دەداو کەمتر دەچێتە بن داربی و پتر لە ژووری دەمێنێتەوە. وازی لە رادیۆ و گۆرانی و هەواڵ هێناوە، بەڵام پتر لە جاران حەزی لە قسەیە و سەرهاتی کۆنی خۆی دەگێڕێتەوە. خوا خوایەتی کەسێکی دەستبکەوێ تا سەرهاتی کۆن بگێڕێتەوە. تۆڵەستێن ناوە ناوە بەشەلەشەل دەچێتە ژوورەکەی و گوێی بۆ شل دەکات، منداڵانی داربیش دەچن، کوڕ چەند ڕستەیەکی سەرهاتەکانی پیری گەڕیدەی لەبیرماوە:

هێی دنیا، چاوێکم لە پێناوی بزووتنەوەی شێخی پیران دانا، تیری تورک بردی. دەستێکم لە ڕێی کۆماری پێشەوا دانا، تیری عەجەمی پێکەوت و سێ پەنجەمی لە کار خست. پێی چەپیشم عارەب نیوە پێی کرد. کوڕەکەشم پێیەکی تەواوی لەو جوولانەوەیە دانا و عارەب لە بن چۆکەوە فڕاندی. داخوا نەوەکەم، چ ئەندامێکی لەشی دەکاتە قوربانیی کێ و کێ دەیبات! بوومە گەڕیدەی شاخ و شاران، لە هەر حەفت ساڵ ئەگەر ساڵێک بە ماڵ کەوتبمەوە. تەمەنێکم دوور لە ژن و منداڵ بەسەربرد، هیچیشم بە هیچ نەکرد.

کوڕ چەند رستەیەکی پیری گەڕیدەی وەک خۆی لە گوێ دەزرینگیتەوە، کە پێدەچێت هی سەرەمەرگ بووبن، کچەشی لە تەک بوو، پیری گەڕیدە زۆر بە خاوی دەیگوتنەوە:

کوڕەکەم، تاقە کوڕە پێ بڕاوەکەم، ئاگات لە خۆت بێت، ئاگات لە بووکەکەم بێت، منداڵەکان بەجێمەهێڵە،، من لەو دنیایە باردەبکەم، ستییە جوانەکەم، هاتم.

کوڕ دێتە بیری دایکی دەستی گرت و لە ژوورەکەی دوورخستەوە و نەیهێشت چاوی لە سەر پیری گەڕیدە بێ. زۆری نەبرد، بووە گریان و زانی پیری گەڕیدە گیانی سپاردووە.

تۆڵەستێن لە پرسەکەی پیری گەڕیدە هاتەوە ئاوەدانی. کوڕ لە سەر دەرگای مزگەفتێ کە لەگژ پێڵاو ریزکردنە، دەبینێ بابی لە بنەبانێ لە تەنیشت حەمەدی قورئانخوێن کە ناوە ناوە چەند ئایەتێک دەخوێنێتەوە، دانیشتووە. دەڵێنەگە بەتاڵەکەی لە پێش خۆی خڕکردۆتەوە، دارشەقەکانیشی لە تەنیشتی. خاڵیشی لەو سەرە راوەستاوە، کوڕ لەوێش دارلاستیقەکەی لە بەرکی شەرواڵەکەیەتی و ناوە ناوە ئاوڕ لە لای گۆڕستانەکە دەداتەوە، ئێ ئەوە خوایە، جەباری قورئانخوێن ببینێ، تۆڵەی پیری گەڕیدەی لێبکاتەوە، چۆن دەبێ پێببڵێ کافرە!

به بارکردنی پیری گەڕیدە بۆ گۆڕستان، بۆ لای خانزاد، کـوڕ هەسـتدەکات مـاڵ مەیـلەو چـۆڵە، داربـی ئەنـدامێکی هەمیشـەیی خـۆیَ لەدەسـتدا، نەنەخـانیش نـایە، دوو سـێ جارێک هات لە سەر سـەکۆیەکە تاویَ دادەنیشت و ریزیَ هوردە رۆندکانی دادەباراند.

تۆڵەسـتێن نـاوە نـاوە دێـت. تـاویَ لە سـەر کورسـی دادەنیشێ. شیرینیش زوو زوو سەری دەدات، بە دیاریەوە رادەوەسـتێ. خوشـک و بـراش لە دەوری خولـدەخۆنەوە، دارشـــەقەکانی دەبەن، دەلیـــنگە بەتـــاڵەکەی رادەکێشـــن. هەرچی مندالانی داربییە بێ داربی هەڵناکەن و هەلی هـاتن لە دەستنادەن و حەفتانەش سەر لە گۆڕستان نابڕن و ئەو پـــارەی دەیانـــدایە حەمەدی قورئـــانخوێن دوو هەنـــدیان کردووە، لە ریێ چوون بۆ گۆڕستان، کوڕ دەڵێ:

دەزانی ئەگەر بە پێی تەسکەرە بێت، من نەبابم هەیە، نە دایک، نە خوشک و برا، نە خاڵ... زۆر بێ کەسم .

کچ بە پێکەنینەوە:

ئەدی برادەر!

تەماشای دەکات و بزەیەکی بۆ دەکات .

کچ دەڵێ:

من لە هی پیری گەڕیدەش بەشداری دەکەم.

کوڕ رازی نەبوو، بەڵام کچ سوێندی لێخوارد ئەگەر وا نەکات، دووشک دەکات و لە بنی قسەی لەگەڵ ناکات، ناچار ملیدا، لە هاتنەوەدا دەڵێ:

ئەوەتا جەباری قورئانخوێن، لێمگەڕێ، تا زووە با تۆڵەی پیری گەڕیدەی لێبکەمەوە.

کچ رازی دەبێ، وەک بڵێی دەیەوێ دەست و نیشانەی ببینێ، دەمێکە نەیدیتووە، خۆیان خستە پەنای دیواری مزگەفت، کوڕ دەپرسێ:

ئەتو بڵێ، حەزدەکەی لە کوێی بدەم؟

کچ دوودڵی پێوەدیارە، دەڵێ:

لە سەر چۆکی.

سێرەی لێدەگرێ، باش هەڵکەوتووە، قورئانخوێن بە پێوە راوەستاوە و رووی لە وانە. دەیهاوێ، بەو جێیە دەکەوێ کە چاوی کچی لە سەرە. قورئانخوێن جوێنێکی گەورە دەدات. کچ دەڵێ:

بە راستی نیشانشکێنی.

کوڕ شایی بە خۆی دێت، بەو دیودا غاردەدەن، دەگەنەوە بن داربی. دایک بانگیان دەکاتە ژووری و میوەیان لە پێش دادەنێ، لە دەرگا دەدرێ، دایک دەیکاتەوە:

فەرموو، فەرموو مامۆستا.

ئای، ئەوە جەباری قورئانخوێنە، دادەنیشێ، منداڵانی داربی ژوورەکە بەجێدێڵن، بە ئاستەم گوێیان لەقورئانخوێنە بەَ تۆڵەستێن دەڵێ:

کوڕەکەت دارلاستیقێکی لە سەر چۆکم دا، ئێستاش ژان دەکات.

باب بانگی کوڕ دەکات، کچەش لەگەڵی دەچێت، باب دەڵێ:

کوڕم تۆ دارلاستیقت لە جەبار داوە؟

کوڕ بە شەرمەوە:

من بووم.

باب بە سەرسامییەوە:

لەبەرچی؟

کوڕ بێ ترس:

چوونکی گوتی پیری گەڕیدە کافرە و هەرکەسێک بیکوژێ، دەستی کەسک دەبێ.

باب دەڵێتە جەبار:

قسەی وات کردووە؟

قورئانخوێن هیچ ناڵێت، باب بەتوورەییەوە تەماشای دەکات و دەڵێ:

لە سەر ئەو قسەیە هەقت گوللەیە نەک بەرد.

کوڕ لەو رۆژەوە هەستدەکات هەموو ئەو بەردانەی لە دارلاستیقەکەیەوە دەرچوون، بەردی هەق بوون، رەوا بوون، بەردی نارەوای نەهاویشتووە.

جەبار باشی بۆ نەدەهات، هەر لەو سەروبەندەش گوڵێ چەقۆی لە سەر راگرت، چەقۆکەی گوڵێ لە چاویدا بریسکە دەداتەوە کە لە پەنای چێورمەیەک لە سەر شانی جەباری راگرتبوو، گوێی لێیە، چاوی لێیە، گوڵێ دەڵێتە جەبار:

قورئانخوێن بێڕەوشتیت لە من دیتیە؟

قورئانخوێن بە حەپەساویەوە:

بێڕەوشتی چی کچم، چ بووە.

گوڵێ بە توورەیەوە:

ئەدی لۆ من بە بێڕەوشت باس دەکەیت؟

جەبار دەڵێ:

کچم قسەی وام نەکردووە، ئەوەی وای بۆ گێڕاویەتیەوە، بوختانی کردووە، خودا لە دوڕ دەوی بدا.

گوڵێ دەست بۆ گیرفانی دەبات، وێدەچێ بیەوێ چەقۆ دەربێنێ:

خۆم بیستم، چاوِدێ، سەرم کۆتە؟

جەبار:

بەڵێ

گوڵێ:

لنگم رووتە؟

جەبار:

ئەستەغفیرولا، بەڵێ.

گوڵێ چەقۆکەی لە دەستە:

ئەدی تۆ ناڵێی هەر ژنێک هەر کچێک سەری کۆت بێ، لنگی رووت بێ، بێڕەوشتە، من بێڕەوشتم؟!

جەبار دوو سێ ئایەت دەخوێنێتەوە، گوڵێ چەقۆکە لە سەر شانی دادەنێ و بە دەنگێک کە چ لە دەنگی گوڵێ ناچێ:

بە کوردی قسە بکە، بە کوردی بێڕەوشتیم بسەلمێنە.

لەو ساتە حەمەد دەگات و جەبار لە بن دەستی گوڵێ دەردەهێنێ، گوڵێ دەڵێ:

جارێکی دی بە من بڵێی بێڕەوشت بە قوربانی دوو چەقۆت دەکەم.

هەر ئەو ڕۆژەش بوو گوڵێ سەگ گرتی، کەلپەی لە بەلەکی بردبووە خواری، سەگەکەش دوو چەقۆی خواردبوو. هەندێ کەس پێیانوابوو، ئەوە خودای قورئانخوێن بوو وای بە سەرهات، چۆن دەبێت چەقۆی لێهەلکێشێ،.دەیانگۆ:

بەلام ئەو نێرە هەیتەیە لە چ دەترسێت، ئەها جێی کەلپەی سەگ بە بەلەکییەوە دیارە، دەبوو لەبەر ئەوە لاقی داپۆشێ.

کەچی گوڵێ دەیگۆ:

دەبوو دوو چەقۆش لە جەبار بدەم، هەر کێ پەلامارم بدات، بەر چەقۆی دەدەم.

کوڕ لە بیریەتی هەر لەو ڕۆژانە دایک مەکینەیەکی دروومان دەکڕێ، جلک بۆ خەڵک دەدوورێ. تۆڵەستێن کە دەبینێ شیرین کار دەکات، دەنێرێ هەندێ شووشەی ئەستوور و کەرەستەی بۆ دێنن، دەستدەکات بە تەزبێح دروستکردن. ئیدی لە ماڵیان دەنگی مەکینەی دروومان و تەزبێح دروستکردن نابڕێتەوە. کوڕ دڵی بەو تەقەتەق و جینگەجینگە دەکرایەوە، چوونکێ جوولەی خستبووە ماڵەوە و باب کەوتبووە کار. وەک پێشوو نەما کە هەمیشە

چاوی لە پنتێکی نادیار دەبڕی، لە ماڵ دادەبڕا و قسەی نەدەکرد. ئێستا بە دەم ئیشکردنەوە قسە دەکات، قسەی خۆش، بەڵام ئەوەی تا ئێستا جێی نیگەرانیی کوڕە، تاکە پێڵاوە ڕەنگ قاوەییەکەیە کە بابی لە پشت سەری خۆی دایناوە و لە پێی نەکردووە. تاکەکەی دی لەوەیە کۆن ببێت، بەڵام ئەوەیان هەر نرت و نوێیە.

پێ و پێڵاوی باب لەبیرناکات، زۆر شەوان خەونی پێیانەوە دیتووە. دەبینێ باب بە دوو پێوە، بە دوو تاکە پێڵاوی قاوەییەوە قیت قیت دەڕوات، ڕۆژێک ئەو خەونە دەبێتە ڕاستی.

لە قوتابخانە دێتەوە، دەبینێ بابی لە پێش دەرگا قیت ڕاوەستاوە، دەمێکە بەو قیتیە نەیدیتووە، یەکسەر تەماشای پێیەکانی دەکات، ئای! خۆ هەردوو تاکە پێڵاوی لە پێیە. ئەوە چیە! تەماشا دەکات، دارشەقی لە بن هەنگڵ نیە. کوڕ چاوی هەڵدەگلۆفێت، خەونە، ڕاستییە! جوانتر تەماشادەکات، باب گۆچانێکی جوانی بە دەستەوەیە، لە گۆچانەکەی پیری گەڕیدە ناچێ. ئای، بە خۆی ناوەستێ، هاواردەکات:

بابە، پێت هاتەوە؟

باب بزەیەک دەکات:

بوومە خاوەن پێیەکی وا، ئەگەر گوللەشی بەرکەوێت، نە ئێشی دەبێت نە خوێنی لێدێت.

جانتاکەی دادەنێ و بەتاو دەسووڕێتەوە، لە سەر سیلە تووشی کچە دەبێ:

- گوڵنار، دەزانی پێی بابم هاتەوە!

+ زانیم، دایکم پێی گوتم، هاتم بیبینم.

ڕۆژ و حەفتە تێدەپەڕن، مانگ ئاودیو دەبێ و ساڵ دەسووڕێتەوە. گەڕەک تا دێ پڕتر و پڕتر دەبێ. کۆڵانی ماڵی کوڕ پڕبۆوە، پارچە زەوییەک بەتاڵ نەمایەوە. تەنیشتیشیان بووە خانوو، ماڵێک لە کوێستانەوە، لە بن کێلەشینەوە هات و لە تەنیشتیان خانووێکی خۆشی قیتکردەوە. قەمەرەیەکی جوانیشیان لە پێش دەرگا ڕادەگرت، دوو کوڕیان هەبوو، فریا گەورە بوو، سیامەندیان هەر ئاوزەی کوڕی داربی دەبوو، بۆی دەگێڕایەوە:

ئێمە ڕەز و باخێکی گەلەک گەورەمان هەبوو، هەرچی میوەت دەویست لە ڕەزی ئێمەدا دەتدیت، حەفتا بنەگوێز بەس دارگوێزمان هەبوو، حکومەت پارەی داینێ و دەریکردین.

ماڵەکەی تەنیشتە وان لە بەری گەرمێنەوە، لە دوورایی قەراجەوە هاتبوون، کوڕێکیان چیای ناو بوو، ژنەکە گوتبووی:

دیشداشە لەبەری پێخواس، رەشماڵیان لە پێش دەرگامان هەڵدا، سەرباز تفەنگیان راکێشا بە عەرەبی گوتیان:

سێ رۆژتان لە پێشە، بارنەکەن قڕتان دەکەین.

بە پرەپڕ بزگوڕمان پێچایەوە و ئەو چەند سەربزنەی هەمان بوو، هێنامان و فرۆشتمان.

ماڵەکەی سەرەوەی ماڵی کچی داربی، پێدەچوو خزمی ماڵی نەنەخان بن کە لە نێوان خۆیان قسەیان دەکرد، کەس تێیاننەدەگەیشت، کچەکەیان بۆ کچی داربیی گێڕابۆوە:

لەشکر دەوری گەڕەکیان دا، گوتیان:

ئێوە هی ئەو وڵاتە نین، سنوور بەدەرتان دەکەین. بابم یەکیانی دەناسی، شتێکی دایێ و خۆمان دزیەوە و هاتینە ئێرە.

گەڕەک لەهیکرا گەورەبوو، دڵی بەوە خۆشە، لای کەندێ تا دەگاتەوە ئەو بەری دارتێلەکە چۆلە. گەڕەک تێکەڵەیەکە کەس کەس ناناسێ. ماڵە کۆنەکان بزربوون، کوڕ تا منداڵێکیان دەبینێتەوە زۆری پێدەچێ. هەر لەو

سەروبەندەش ناوە گەنجێک دیار نەدەما، کەس نەیدەزانی چی بەسەردێ. لە بیریەتی هەمەدانیش ئێوارەیەک هاتە لای بابی، سەریان لە بن گوێی یەکتر نابوو، ئیدی بزربوو. کۆلان جمەی دێت و داربی هێمنییەکەی جارانی نەماوە.

چۆلەکەکان دەخوێنن، بەڵام ناوە ناوە لە لایەکەوە بەردێک دێت و لە خوێندنیان دەکات. بەردیش لە ناو پەلکانەوە بەردەبێتەوە و چەند بەردێک بە سەری تۆڵەستێن کەوتووە، بەڵام ئازارێکی وای نەبووە. گەڕەک پڕبووە لە دارلاستیق، هەمووشیان روویان لە باڵندەکانە، باڵندەی سەر دار و دارتێلەکان، تەنها دارلاستیقەکەی کوڕە وەک خۆی ماوەتەوە و تا ئێستا بەردێکی رووەو باڵندە لێ دەرنەچووە. کوڕ ناوە ناوە لە سەربانەوە، بە دزیەوە تۆڵە لەو دارلاستیقهاوێژانە دەکاتەوە، سەری چەند منداڵی شکاندووە.

بەینێکە کچی داربی کەم زۆر کەم دێتە بن داربی و ماڵێ، دەڵێی گەورەبوونە و شەرم لێکدی دەکەن. لەگینە پتر لە ترسی براکەشی بێ، براکەی ئێستا چەکدارە، خەڵک دەڵێن بووەتە جاش. ئێستا رێی قوتابخانەشیان یەک نیە و ئەگەر چۆن لا بەلایی لە رێ تووشی یەکتر بن. کوڕ هەموو بیر و خەیاڵی هەر لای کچەیە، لە هەموو جێیەک چاوی لێ دەگێڕێ، لە رێ، لە سەر بان، لە بن داربی، لە سەر جێ، لە ناو کتێب، لە تەلەفزیۆن. تازە تەلەفزیۆنیان

کڕیوە، پێی سەیربوو، بابی تەلەفزیۆنی بۆ خۆیان کڕی بۆ ماڵی کچی داربیی نەکڕی، شەرمیشی دەکرد پێیبڵێ.

لە تەلەفزیـۆنیش لە دوای دەگەڕێ، تەلەفزیـۆن پـڕ لە کچی جوانە، بەڵام لە چاوی کوڕەوە هیچیان نـاگەنە کچی داربـی. دەزانـی کچـی داربـی چەنـدێ جوانە، بەژنـی دەڵێی شەنگەبییە، پرچی درێژ درێژ خـاو خـاو، لێوەکانیی سـوور سـوور، چـاوی گەش گەش، روومەت ناسـک ناسـک. کـچ ئێـواران جـار جـار لەگەڵ دایکـی دێ و سـەیری تەلەفزیـۆن دەکەن، کوڕیش بە شەرمەوە ناوە نـاوە تیچـاوێکی دەداتـێ. ئـاگری گرتـووە، بە تـایبەتی بـۆ لێوەکـانی، سـوورایـیەکیان تێدایە لە سووری چ لێوێک ناچێ. دێتە بیری ڕۆژێک کچ لە ماڵیـان بـوو، کـوڕ لە حەوشـە لە خەیـاڵی وی بـوو، گـوێی لێبوو دایکی دەیگوت:

کچم ئەوە لێوت سووردەکەیت؟

کوڕ بە پێدزە خـۆی گەیانـدە پەنـجەرە گچـکەکە، کـچ بە شەرمەوە دەڵێ:

نا، هەر بە خۆی ئەوهایە.

چـاوی لێـیە، دایـک وەک بڵێـی بـاوەڕ ناکـات، لێـی نزیکدەبێتەوە و پەنـجە بە لێویـدا دێنـێ، تەماشـای پەنـجەی خۆی دەکات:

کچێ خۆ راستدەکەیت سووراوت لێنەدایە.

لەو ساتە هەزار خۆزگەی بە دایکی خواست، خوا خوای بوو، کچ زوو بڕوات، تا بگاتە دایکی و ئەو پەنجەیەی ماچ بکات کە بە لێوی کچەی داهێنا. لە بەدبەختی ئەو کچ دانیشتووە و هەڵناستێ، گوێی لێیە دایک دەڵێ:

کچە جوانەکەم، منیش کاتی خۆی وەک تۆ جوان بووم.

کچ بە شەرمەوە دەڵێ:

دادە شیرن، ئێستاش زۆر جوانی.

دادە شیرین لە ئامێزی دەگرێ، کوڕ هێندە نەمایە ئاگر بگرێ، خۆی پێناگیرێ، کشاوە دواوە، گوێی لە دایکیەتی:

من کە شووم کرد هەر لە تەمەنی تۆ بووم، بەڵام تۆ تا خوێندن تەواو نەکەیت بیر لە شووکردن مەکەوە، هەنگینێ من کوڕێکی بە دڵی خۆت بۆ دەبینمەوە.

خۆشی لە بەشی یەکەمی قسەکەی دایکی نەهات، تا خوێندن تەواو دەکات، تازە پۆلی یەکەمی ناوەندین، بەشی دووەمی قسەکەی بەدڵ بوو، هەر دەبێ ئەوی بەدڵ بێت.

لە قوتابخانە دێتەوە، کارتی پێش کۆتایی ساڵی لە دەستە، دڵی خۆش نیە، لە هەموو وانەکان بەخشراوە، بەڵام لە وانەی عەرەبی دەبێت بچێتە تاقیکردنەوە. چەند بە تاسەیە تووشی کچی داربی بێت. خۆی گەیاندە سەری ئەو کۆلانەی کە ڕێی وی بوو، دیتی سووڕایەوە، نەیگرت،

نزایکــرد ئەو لە هەمــوو وانەکــان بەخشــرابێت، نــزاکەی گیربوو. زۆری نەبرد کچ هـاتە ماڵیـان و هەواڵەکەی هێنـا، کاتێ زانی کوڕ وانەیەکی ماوە، دیاربوو خەفەتی خـوارد، بەڵام هیچی نەگوت، تۆڵەستێن دەڵێ:

شیرین، دیارییان بۆ بکڕە.

دایـک رۆژی دوایــی بە کــاتژمێرێکی کچــانەوە، یەکــی کوڕانە لە بازاڕ هاتەوە، کچ دیار نەبوو، دایـک دیـارییەکەی هەڵگرت و چوو، زۆری پێچوو، نەهاتەوە. خوشک و برا بە جووتە بە دوایدا چوون و هـاتنەوە. دەمەو ئێـوارە بوو، چ هاتنەوەیەک! کوڕ لە سیمای دایکی خوێندیەوە کە شتێکی ناخۆش لە گۆڕێیە، چووە پێشـی و چاوی لە چاوی بڕی، بەڵام دایک خۆی لێ لادا و هیچی نەگوت. کـوڕ بە بێدەنگی کشـایەوە، تەنگەتـاو بـوو، یەکســەر چـووە سـەربان بەری خـۆی دایە حەوشــەی مـاڵی کـچ، چ لە گـۆڕێ نـیە، ئـاهێکی وەبەر هـاتەوە، دیـارە نیگەرانیـی دایـک پەیوەنـدی بە مـاڵی کچەوە نیە. کوڕ گوێی لە دایکە قسە بۆ باب دەکات:

ئاخر ئەو منداڵە هی مێردە!

باب دەڵێ:

گوڵنار! مارەشیان کرد، دایانە کێ؟

دایک دەڵێ:

ئـا، لەو دوو سـێ رۆژەش دەیـبەن، شـەوێ مارەیـان کردووە، براکەی بە مێردی داوە، دایکیشی هێندە ئاگای لێ نیە.

وەی! هاوار، وەک بڵێی پشکۆی ئاگر بخەنە سەر دڵێ، لە قـوڕگیەوە بـۆ کـرووز هـات، بە ئـاگر ئـاگری گـرت، هەناسـەی سـواربوو، چـاوی رەش بـوو، هـیچ نـابینێ. بە دوای سەتڵێک ئاوی ساردا دەگەڕێ بە خۆیدا بکات، خۆی بکوژێنێتەوە. ئاو نـابینێتەوە، هـاوار لە سـەر ئەوە بوو یەک بە ماڵ و کۆلان هاوار بکات، خۆی گرت، رێی هـاوارەکەی گۆڕی، ئاراستەی هاوارەکەی بەرەو ناخی خۆی گۆڕی. لە ناخەوە هاوارێکی کرد، ئەگەر دایک و بـاوک بیانبیسـتایە بە زەبری گوللەش بایە گوڵناریان دەگێڕایەوە. هاوارێک ئەگەر براکەی گوڵنار بیستبای، دوورنەبوو، پەشیمانبێتەوە. ئەگەر گوڵنار بیستبای، بێ ترس دەهـات دەسـتی لە مـل دەکرد و سـەری خۆیـان هەڵـدەگرت. کەس نەیبیسـت، هـێ لە هـاوار کەس هـاوارەکەی هـاواری نەبیسـت. رووی خـۆی پیشـانی دایک باب نەدا. چووە بن داربی، کەس دیـار نەبوو، دڵۆپ دڵۆپ فرمێسکی هەڵدەوەراند. دەنگی پێیەک هـات، هەسـتا چـووە سـەر بـان، روو لە مـاڵی گوڵنـار راوەسـتا، کەس لە پێش دەرگا و حەوشـە دیار نیە. گریا، هـاوار بە دڵ گریا، هێند گریا هێزی تێدا نەما. سینەی کەمێک ساردبۆوە، هـاتە خوارێ، تاریک بوو. چووە سەرشۆرک ئاوێکی بە خۆیدا کرد، بە سەر خۆی نەهێنا. لە کاتی نـان خـواردن هەندێک

گەمەی بە کەوچک و شیوەکە کرد، هەوڵیدەدا، دایک و باوک هەست بە نیگەرانییەکەی نەکەن. هاوار باشی لە بیر نیە ئەو ئێوارەیە چۆن گەیشتە شەو و چۆن رۆژ بۆوە.

رۆژ بۆوە، هاوار رەنگبێ سەد کەرەت بە کۆڵانی ماڵی گوڵناردا هاتبێ و چووبێ، کچ سەرێکی بە دەرێدا دانەگرت. لە سەر بانەوە تەماشای حەوشەی ماڵیانی دەکرد، کچ هەڵێک رێی بە حەوشە نەکەوت، چەندی حەزیدەکرد منداڵ با و بێ لە دەرگادان خۆی بە ماڵیاندا کردبا، بیزانیایە گوڵنار لە کوێ دانیشتووە، چی دەکات، دڵی خۆشە، یان نیگەرانە؟ هاوار لە سەر ئاو و ئاگرە و لە هیچ جێیەک تۆتکە ناگرێ، بایی هێندە ئاگای لە دەور و بەرە کە دایک و باوک هەست بە شتێک نەکەن. پەنا بۆ گۆڕستان دەبات، دەچێتە سەر گۆڕی خانزاد و پیری گەڕیدە کە بە تەنیشت یەکەوەن. لە نێوان هەردووکیان دانیشتووە و هەندی لەقسەکانی خۆی لەبیرە کە بۆی دەکردن:

خانزاد، کچە جوانەکەی گەڕەک، تۆ ئاگات لێیە! گوڵنار دەبەن، دە توخوا پێیبڵێ بە گوڵنار بڵێ، با لەگەڵیان نەچێت.

پیری گەڕیدە، گوڵنار دەڵێی لیم تووڕەیە، نایەتە بن داربی، دەڵێن گوایە بە یەکجاری دەڕوا و نایەتەوە، پێیبڵێ نەڕوات.

هاوار دەچێتە ماڵی نەنەخان، لە دەرگا دەدات و قسە رێکدەخات، ئەگەر دەرگای لێ کاتەوە، پێیدەڵێ:

نەنەخـان، بـیکە خـاتری گـۆڕەکەی پیـری گەڕیـدە، بـڕۆ ماڵی گوڵنار، پێیبڵێ نەڕوات، تەنیام نەکات.

نەنەخان دەرگا دەکاتەوە:

ها، هاوار، کوڕم چیت دەوێ؟

زمانی تێکدەئاڵێ، قسەی بۆ نایە، نەیزانی چی بڵێت:

هیچ، تینوومە.

نەنەخان جامە ئاوێکی بۆ هێنا، نیو دیناریشی لە گیرفان نا:

بیدە قورئانخوێن با چەند ئایەتێک لە سەر گۆڕی پیری گەڕیدە بخوێنێ.

نەیدەویست پارەکەی لێ وەربگرێ، نەنەخـان خـۆی لێ تووڕە کرد.

لە هاتنەوە تووشی گوڵێ بوو، بە گاڵتەوە دەڵێ:

ئەوە گوڵناریان بە مێرد دا! من بۆ تۆم دانابوو.

هـاوار هەوکـی پـڕ گریـان دەبـێ، هـیچ نـاڵێ. گـوڵێ تەماشـایەکی دەکـات، وەک بڵێـی لە قسـەکەی خـۆی پەشیمانبێتەوە، لێی نزیک دەکەوێتەوە:

گوێ مەدێ، ئازابە، کە ئەو تۆی نەویست، تۆش ئەوت نەوێ.

خۆی پێناگیرێ و فرمێسک دادەبارێنێ، گوڵێ بەجێدێڵێ. لە دەو کەندێ پووشکاخەز هەڵدەدات، دەخوازێ بفڕێتە سەر حەوشەی ماڵی گوڵنار. چەندی ئەو سەر و ئەم سەر دەکات، ناچێت، بایەک هەڵناکات بیباتە ئەوێ. دێ لە سەر بانەوە دەیفڕێنێ، پووشکاخەز لە ئاسمانی حەوشە لەنگەر دەگرێ. بە پرتاو بە خەتی درشت دەنووسێت:

بۆ وات کرد بۆ؟

پێوەی کرد زوو گەیشت، بەڵام گوڵنار دیار نیە، تا بیبینێ، پووشکاخەز و نامە ببینێ. هەوڵدەدات پووشکاخەزەکە لە حەوشەیان بەربێتەوە، داو توند دەکات، شلی دەکات، دەیداتێ، رایدەکێشێتەوە، پووشکاخەز هەر جارەی دەیەوێت لە سەر بانێک لە حەوشەیەک بنیشێتەوە، بەڵام وەک بڵێی هێزێک هەیە لە حەوشەی ماڵی گوڵنار دووری دەخاتەوە. ویستی بە دارلاستیق گوڵنار ئاگادار بکاتەوە، تا بەردێکی لە گیرفانی دەرهێنا، پووشکاخەز لە دارتێلەکەی دوو ماڵ سەرەوەتر گیر بوو.

لە سەر بانەوە تەماشای حەوشەی ماڵی گوڵنار دەکات، جمەی دێت لە ژن و منداڵ. خۆزی خواست دووربینەکەی باب مابا تا لە دووربینەوە تەماشا بکات و گوڵنار لە نزیکەوە ببینێ. بەڵام کوا دووربین، هەر شتێک

پەیوەندی بە پێشمەرگایەتییەوە هەبووبێ، لە ماڵی نەماوە، تۆڵەستێن مەتارەکشی نەهێناوە.

زۆری نەبرد چوار پێنج قەمەرە لە لای کەندەکەوە هاتن و لە پێش ماڵی گوڵنار وەستان. هاوار جگە لە فرمێسک هەڵوەراندن چی لە دەستدێ! بەڵام شتێک نەکات دڵی دەتەقێ، خەریکە گوڵنار دەبەن. بە پرتاو هاتە خوارێ و لێیان نزیکبۆوە، کەسی نەدیت جگە لە گوڵنار. چ گوڵنارێ، دەست و پەنجەکانی سوور کردبوو، لێوەکانی لە پەنجەکانی سوورتر. هاوار یەکسەر کرێمستی بن داربییەکەی هاتەوە پێش چاو، ئەو سووراوە چەند لە کرێمستییە سوورەکە دەچوو. سەری گێژ دەخوات، لە سەر ئەوەیە بکەوێت، هێز دەداتە بەر خۆی، نابێت بکەوێت، ئیشی بە پەلەی هەیە. کاتی نەما تا چاو بداتە زاوا، خۆی گەیاندە پەنای ئەو عارەبانەی تراکتۆرە کە ماوەیەک بوو لە خوار دارتێلەکەی ئەوبەر لە نزیک رێ، لە تەنیشت خانووێکی تەواو نەکراو راگیرا بوو. قەمەرەی بووکێ لەو لاوە هات، بووک و زاوا لە پشتەوە سواربوونە. باش رێککەوتووە، زاوا کەوتۆتە لای هاوارەوە، جامیش کراوەتەوە. بەرد نا پارچە شووشەیەکی مەیلەو خڕ، پێیدەڵێن جامی فرۆکە، ئەوەی بابی تەزبێحی لێ دروستدەکات، دەخاتە دارلاستیقەکەیەوە. ئای ئەوە چ دەبینێ! زاوا گوڵینگدارە، هاوار هەڵەی نەکردبێ ئەوە حەسۆیە حەفت ساڵێک دەبێت نەیدیتووە بەڵام ناسیەوە بە

لـووتی ناسـیەوە. لاسـتیقی دارلاسـتیقی چەنـد راکێشـابوو، لەبەر خـاتری حەسـۆ پتـری راکێشـا. هاویشـتی رێـک لە سەری کەپووی دا، ویستی شووشەیەکیدی تێگرێ، ویستی ببینێ، خوێن ببینێ، کەڵکی نەبوو، قەمەرە راوەستا، دەبوو بەو دیـودا هەڵـێ و خـۆ بزرکـات، دواتـر بیسـتیەوە، مسـتە خوێنێـک لە لـووتی زاوا هـاتووە، کراسـی بـووکێش پەلە خوێنی بەرکەوتووە.

حەفتەیەکە لە سەر سەر دەسوورێ، بۆوەی داک و باب هەسـتپێنەکەن و نـیگەران نەبـن، کەم بە مـاڵ دەکەوێـتەوە. ئەو دەمـانەی بـاب لە بـن داربـی نـیە، لەوێ کـات بەسـەر دەبـات. نـاوە نـاوە دەچێـتە گۆڕسـتان، دەچێـتە مزگەفتـی دەروێـش. زۆر کـاتیش دیـدار لەگەڵیەتـی، دیـدار زوو بە دەردەکەی زانـی، دڵـی دەداتەوە، بەلاشـە، دیـدار تـوورە دەبێت و پێیدەڵێ:

بـۆچی خـۆت دەکوژیـت، ئەو ئەگەر تـۆی ویسـتبا، وای نەدەکرد، بەلای کەمی پرسێکی پێدەکردی.

هاوار هیچی بە گوێدا ناچێ.

هەینی بوو، گوڵناریان برد، لە هەینیش هـاتەوە. گوڵنـار بە دیارکەوتەوە، هاتەوە ماڵی هـاوار، لە حەوشـە سـلاوێکی لە لێ کرد و غـاری دایە باوەشـی دایـک. دەبینـێ گوڵنـار بە حەفـتەیەک زۆر گـۆڕاوە، لە کچێکـی منـداڵکارەوە بـۆتە ژن، قسەی، رۆیشتنی ژنانەیە، سوراو و سپیاوی لە خۆی داوە،

دەست و پەنجەی سوور سوور، دیسان کریمستیی منداڵیی دێتەوە بەر چاو، لە چاوی نابێتەوە. زۆر لە خۆی دەکات و ورد لێی دەڕوانێ، بەڵام گوڵنار هێندە چاوی هەڵناهێنێ، وەک بڵێی نەیەوێ بیبینێ، لە ڕۆیشتنێ لە سەر دەرگا، گوڵنار بە هێواشی کەس گوێی لێ نەبوو:

تۆڵەی خۆت لە حەسۆ کردەوە، قەیناکە، لە دڵم گران نیە.

ویستی بڵێ، کچێ تۆڵەی تۆم لێکردەوە. زمانی بەسترا، بیستبووی لە شەوی بووک و زاوا، لە ناو ڕانی بووکێ خوێن دەڕژێ، لە پێش خۆیەوە دەیگوت:

ئای حەسۆ، سەری منت بە خوێن هێنا، ناو ڕانی گوڵنارت بە خوێن هێنا، بە دارلاستیقێ وازت لێناهێنم، تۆ زۆر قەرداری منی.

هاوینێکی سەخت بوو، ئەو پشووە بۆ هاوار ماندووترین ماندوویێتی بوو، لە ماڵێ تۆتکەی نەدەگرت، لە چ جێ ئۆقرەی نەدەگرت. لە گەڕانێکی هەمیشەییدا شەو و ڕۆژی دەکردەوە، شەوانیش لە گەڕان بوو، چاوی دەچووە خەو پێیەکانی هەڵیان دەگرت و دەیانبردەوە هەموو ئەو جێیانەی بە ڕۆژ سەری لێدابوون. هاوار بە تەنێ، زۆر جاریش دیدار بەگەڵی دەکەوت. هاوار دەچووە سەر گۆڕی پیری گەڕیدە و خانزاد، دەچووە بن دارخورماکە، ناو قەیسەری دەکرد، بە قەڵاتدا هەڵدەگەڕا، لە خۆشاوەکەی

مـــام زۆرابـــی دەخـــواردەوە، بەڵام تـــامی لـــێ نەدەکـــرد، ســـەردانی منـــارەی دەکـــردەوە، پێـــدا هەڵـــدەگەڕا، ئـــێ ئەوە خوایە لە سەرەوە گوڵنار ببینێ، سەری دەسووڕا، بە پڕەپڕ دەهاتە خوارێ. ئەو هاوینە پشووێکی پڕ ماندوویتی بـوو، هاوار چی نەدەبیست، چی نەدەدیت، پێدەچوو باڵندەکانی داربـــی لەو پشـــووەدا گەشـــتیان کردبـــێ، چ گـــوێی لە خوێندنیان نەبوو. رۆژ نەبوو سەرێک نەچێتە پێش دەرگای قوتابخانەی گوڵنار. ناوە ناوە لە سەربانەوە تیچاوی دەدایە ماڵی گوڵنار، گریانی دەهات، چ ماڵێکی چۆلە، بێ گوڵنار چ کۆلانێکی چۆلە، بێ گوڵنار چ شـارێکی چۆلە، بێ گوڵنـار... بیســـتی گوڵنـــار لە دەرەوەی شـــارە، بەڵام پێـــنەکەوت لە کـوێیە، شەرمیشـــی کـرد بپرســـێ. رۆژی بیســـت جـار بە کـۆلانی مـاڵی گوڵنـاردا تـا پشـت مـاڵی نەنەخـان دەچـێ و دێتەوە، ئێ ئەوە خوایە، گوڵنار هاتبێتەوە و لە سـەر دەرگا ببینـــێ، نـــایەتەوە. لەو پشـــووە یەک جـــار لە دوورەوە گوڵنـاری دیـت، جـارێکیش هـاتبووە ماڵیـان، بەڵام لەو دەمە چووبووە دیداری دارخورماکە. دەستی خۆی دەشکاندەوە چۆن لە ماڵ نەبووە.

قوتابخـــانە هـــاتەوە، بە کـــزی و بـــێ وازی ملـــی رێـــی گرتـووە. کتێبیـــان وەرگـــرت، ئەو ســـاتانەی بیـــرکەوتەوە کە پـێکەوە لەگەڵ گوڵنـــار کتێـــب و دەفتەریـــان بەرگ دەکـــرد. کتێبەکان هەندێکیان عەرەبی بـوون، گـوتیان خوێندن بـۆتە عەرەبـــی، هـــاوار تەماشـــادەکات لە کتێبەکـــان زۆربەیـــان

بوونەتە عارەبی، هەندێکیان لێ دەخوێنێتەوە، فریان تێناگات، لە سەری خۆی دەدات، لە بەر خۆیەوە دەڵێ:

چ ساڵێکی سەختە ئەوساڵ، گوڵنار رۆیشتبێ، کتێب بووبێتە عەرەبی، باشترە واز لە خوێندن بهێنم، یازدەی ئازار یان شەشی ئازار بفرۆشم.

بە ناوهێنانی یازدەی ئازار کرێمستی بیرکەوتەوە، لە کرێمستیشەوە لێو و دەست و پەنجەی خەناویی گوڵناری هاتەوە بەر چاو کە بۆ حەسۆی جوانکردبوون. چەند تنۆکە رۆندکێکی هەڵوەراندە سەر کتێبان. لەو دەمە دیارە مامۆستایەک رۆندکەکان دەبینێ، بە نەرمی دەست دەخاتە سەر شانی و بە ئەسپایی دەڵێ:

کوڕم، بۆ دەگری، هیچ بووە؟

پرسیارەکە زۆر لەپڕ بوو، نەیزانی چی بڵێ، بۆی هات:

من عارەبی نازانم.

مامۆستا دەست بە سەری دادێنێ و دەڵێ:

هەر تۆ نا، کەس عەرەبی نازانێ، هەوڵبدەن، بەرە بەرە فێر دەبن، چ دەکەی لەگەڵ ئەو حکومەتە!

قوتابیەک پرسی:

مامۆستا کوچەر، حکومەت لۆ کتێب دەکاتە عارەبی؟

مامۆستا:

لۆی دەچێتە سەر، لۆیە...

لەو دەست بەِ سەرداهێنان و قسانەوە، مامۆستا چووە دڵی هاوارەوە.

ئێوارەیە، لە سەر خوان کوڕ بۆ دایک و باب باسی بە عەرەبیکردنی کتێب دەکات، باب هەناسەیەکی قووڵ هەڵدەکێشێ:

ئەو سەرۆکە هەموو شت دەکات، خاک و زمان و جلکوبەرگ دەکاتە عارەبی.

دایک دەڵێ:

تا سەر بۆی ناچێتە سەر، ئای بیبینم پەتکی بە ملەوەیە.

هاوار زۆر لە سەرۆک بە رکدا دەچێ، مەگەر هێندە لە حەسۆ بە رکدا چووبێ. بیری بۆ دارلاستیق چوو، چووە خەیاڵەوە. دەبینێ سەرۆک لە سەر ترۆمبێلێک بە پێوە راوەستاوە و سلاو لە خەڵک دەکات، هاوار لە سەر بانێکەوە، سێرەی لێ دەگرێ، پارچە ئاسنێکی تیژی خستۆتە کەوڵی دارلاستیقەوە، تێیدەگرێ، رێک لە ناو لەپی دەدا و خوێن بە قۆڵیدا دێتە خوارێ، چەکدارێک دەیبینێ، خەریکە دەکەونە دوای. دایک بە رستەیەک نەیهێشت چەکدارەکان بە دوای بکەون:

گوڵنار هاتەوە، تەلاقدرا.

تەلاق! ئەوە گوێی لە چی دەبێ، خەونە، خەیاڵە! چیە؟ خۆ راستی نیە! ئەوە چ وشەیەک بوو لە زاری دایکەوە دەرچوو؟ بەزۆر خۆی گرت، دەیویست دایکی لە باوەش بگرێ و لێوەکانی ماچ بکات، ئەو لێوانەی (تەلاق)یان گۆکرد. لەو ساتەوە وشەی تەلاق لای هاوار شیرینترین وشەیە کە لە زاری شیرینی دایکەوە بەر گوێی کەوت. ئۆخەیش، گوڵنار هاتەوە، دەستبەرداری حەسۆ بوو، هاوار بە جێ نەدەکەوت، نەیزانی چۆن نانەکەی خوارد، باڵی گرت، چووە سەر بان، هاتە خوارێ، سەرکەوتەوە، حەوشەی ماڵی گوڵنار رووناکە، زۆر لە شەوانی پێشتر رووناکترە. لە چاوی هاوارەوە گلۆپ نا، مانگ لە حەوشە هەڵکراوە، بەڵام گوڵنار دیار نیە، چەند جارێ بە کۆڵانەکەیاندا هات و چوو، گوڵنار سەرێکی بە دەرێدا دانەگرت.

سێ شەو و دوو رۆژ رابرد، گوڵنار دەرنەکەوت، ئەو سێ شەوە هاوار هێندەی نیو شەو نەخەوت، کەلەکەی بە عەرد نەدەکەوت. رۆژی سێیەم سبەینێکەی زوو دەچووە قوتابخانە، چ دەبینێ! ئەوە گوڵنارە، جلکی قوتابخانەی لە بەرە. ئای، منداڵ بۆتەوە، لە سەری کۆڵان سووڕایەوە، هاوار چاوی کەسی نەدیت، یەکپێ غاریدا، گەیشتە تەنیشتی:

دەچیە قوتابخانە؟

گوڵنار سەری خۆی نەوی کرد، بەشەرمەوە:

ئا، دەچم.

هەر هێندەی گوت، هاواریش قسەی دی بۆ نەهات، بەڵام دوور بە دووری تا پێش دەرگای قوتابخانە لە دوای ڕۆیشت. لەو ڕێیە گوڵنار یەک جار ئاوڕیدایەوە، ئەو ئاوڕدانەوە بۆ هاوار هەموو شت بوو. ئیدی ناوە ناوە یەکتریان دەدیت و دوو سێ قسەی ئاساییان دەکرد. چەند حەزدەکات هۆی تەلاقدانەکەی لێ بپرسێ، یان بیزانێ، هەڵێک ویستی لە دایکی بپرسێ، نەیپرسی، بەڵام لە زاری دایکی گوڵنارەوە شتێکی بیست. ئەوە لە ماڵێ دایکی گوڵنار بە دەنگی نزم بۆ دایکی قسەی دەکرد، لەو دیو دەرگاوە چەند رستەیەکی بیست:

حەسۆ پێش گوڵنار سێ ژنی دی تەلاقداوە، هیچ ژنێک لە سێ مانگ پتر لای نەبووە. ئەو کوڕە هەر شێتە شێت، خوا کوڕەکەی من بگرێت، نازانم ئەو کەربابەی لە کوێ دیتەوە، فرۆشتی، بە پارە فرۆشتی، منیش چ دەسەڵاتم نەبوو.

هاوار قوتابخانە و ژیانی لا شیرن بووەتەوە.

ڕۆژێ لە ڕارەوەکەی پێش هۆدەی بەڕێوەبەر، دەبینی لە نێوان دوو مامۆستا قڕە قڕە، مامۆستا چوارشانەکە دەڵێ:

خوێندن بە عەرەبی زۆر باشە، منداڵەکانمان فێری عەرەبی دەبن، هەر کەسێ دژی بوەستێ، نەزانە.

مامۆستا باریکەلەکە:

ئەوە فێربوونی عەرەبی نیە، بە عەرەبکردنە، هەر کەسێ پشتیوانی لێ بکات، ناپاکە.

مامۆستاکان لێک بڵند دەبن، هاوار لەو دەمە ئاخێک هەڵدەکێشێ:

ئای ئێستا دارلاستیقم لە کن با، چۆن نیشانەیەکم لە نێوچەوانی ئەو چوارشانەیە دەنەخشاند.

چەند مامۆستایەک کەوتنە ناوبژی، حەفتەیەکی نەبرد، مامۆستا باریکەلەکە دیار نەما، گوتیان گواستوویانەتەوە بۆ دەرەوەی شار.

جوان دێتەوە بیری، بە عەرەبیکردنی خوێندن گەیشتەوە جەبار و حەمەدیش، هاوار لە سەر گۆڕی پیری گەڕیدە و خانزاد دەهاتەوە، بە گوڵناریشی گوت کە پێکەوە بچنە گۆڕستان، لەگەڵی نەچوو، بەڵام پارەی قورئانخوێنی هەر دەدا، هی ئەو سێ چوار مانگەی کە لە کن حەسۆی

گوڵینگدار بوو ئەویشی بە زۆر دایێ. هاوار گوێی لە جەبارە دەڵێ:

حکومەت کارێکی پیرۆزی کرد کە خوێندنی کردە عەرەبی، ئاخر عەرەبی زمانی قورئانە، زمانی ئەو دنیایە، زمانی بەهەشتە...

هەرچی حەمەدە دەڵێ:

وایە، بەڵام کەس مەرج نیە لە سەری، لە سەر دنیا عەرەبی بزانێت، لە سەر دنیا خودا رێی بەوە داوە هەر کەسە بە زمانی خۆی باخڤێ، بە زمانی خۆی بخوێنێ.

هاوار پێیوایە لە سەر ئەو قسەیە جەبار دارلاستیقێکی توند قەردارە، بەڵام قسەی بابی بیردەکەوێتەوە:

کورم، خۆت لە جەباری قورئانخوێن و شەلەی شامینۆکفرۆش و براکەی گوڵنار مەگەیەنە، ئەوانە لە حکومەت نزیکن.

چ بکات باشە، جەبار بەردی هاوار دەناسێتەوە، لە بنی دنیاوەش دارلاستیقی بۆ بێت، هەر هی هاوارە. بەردێکیشی لێ نەدەدات، دڵی دەتەقێ. لەوەتەی گوڵنار تەلاقدراوە و حەسۆی بەجێهێشتووە، خولیای تۆڵەکردنەوە لە سەری هاوار گڕ گڕ دەگەڕێ و تۆڵە نەکاتەوە خەوێ لێ ناکەوێت. ئەو ماوەیەی گوڵنار لە کن حەسۆ بوو جگە لە حەسۆ بەلایەوە هێندە گرنگ نەبوو تۆڵە لە خەڵک دەکاتەوە یان نا.

هـاوار پێدەکەوێت گوڵنـار لە وانە عەرەبییەکـان بـاش نـیە، بەوە پتر لە مامۆستا چوارشـانەکە و جەبـاری قورئـانخوێن بە رکدا دەچێ. مامۆستاکە ئاسـانە، چوونکێ بەردی هـاوار ناناسـێتەوە، گـرفتەکە جەبـارە. دوای زۆر لێکـدانەوە و تاوتوێکردن گەیشتە ئەوەی بە گوللە لێی بدات.

هـاوار گوڵنـار دەبینـێ، جاروبـار دێـتە ماڵیـان و لە رێـی قوتابخـانەش جـار نـا جـار تووشـی یەکتـر دەبـن و چـاکوچۆنیەک لەگەڵ یەکتـر دەکەن. داوای لێـدەکات کە فیشـەکێک دوو لە بـراکەی بـدزێ و بـۆی بهێنـێ، گوڵنـار دەپرسێ:

+ بۆ چیتە؟

- تۆ لە وانە عەرەبیەکـان خراپیت، کەچـی جەبـار دەڵـێ عەرەبی لە کوردی باشترە، نابێ لە سەری بچێ.

گوڵنار هەرێی پێدەدات کە فیشـەکی بۆ بهێنێ، بەڵام تـا دەیهێنـێ، هـاوار لە بـن دارتـێلەکەی ئەو بەری کەنـدێ، گوللەیەکی بێ فیشەک دەبینێتەوە. لە دوای هەلێک دەگەڕێ، دەبێت لە جێگەیەگ بۆسـە دابنێـتەوە، جەبـار گومـانی لـێ نەکات. دەبینێتەوە، ئەو جێگایە دەبینێتەوە کە قورئـانخوێن مووچەی لـی وەردەگرێت. لە نزیکە وێ، لە رێ دەیبینێت، درەختێکی کورتە بنەی گەڵا پڕ هەیە. دوور لە چاوان مینـا سمۆرە بە درختەکەدا هەڵدەگەڕێ، دەچێتە نـاو لـق و پۆپ و پەلکان. لە گەڕانەوەدا، نیشانە لە جەبـار دەگرێ، حەیف،

هاوار دەڵێ حەیف، لە پێشەوە، نێوچەوانی نەکەوتە ناو سێرەوە. لە تێپەڕبووندا، سێرەی لێ گرت، رێک لە پشتی ملی دا. جەبار هاواری لێ هەستا، هاوار چاوی لێیە، وێنەی فرفرۆکە بە چوارِ دەوری خۆیدا دەسووڕێتەوە، کەسی نەدیت، چاوی لێیَە گوللەکەش هەڵدەگرێتەوە، گوێ لێیە دەڵێ:

لە بنی دنیا تەقەیە گوللە بەر من دەکەوێت، خوا کردی ساردبووەتەوە، دەنا ساردی دەکردمەوە.

هاوار پێکەنینی دێ، پێکەنین بەری نادا، لە ترسی ئاشکرابوون لچکی کراسەکەی دەپەستێتە زاریەوە.

دەزانێت کە گوڵنار هەر لە وانە عەرەبیەکان نا، لە ماتماتیکیش نمرەی خراپە. چی بکات باشە! پیاوی ماتماتێک لە کوێ ببینێتەوە، کێ ماتماتیکی داهێناوە! هەرچەندە خۆی زۆر زیرەکە لە ماتماتیک و هەمیشە سەدی مسۆگەرە، بەڵام لە بەر خاتری گوڵنار دەبێت تۆڵەی لێ بکاتەوە. رۆژێک لە مامۆستای بیرکاری دەپرسێ:

مامۆستا، کێ بیرکاری داهێنا؟

مامۆستا دەڵێ:

ئەوە چ پرسیارێکە؟!

هاوار:

دەمەوێ بزانم کێ بیرکاری داهێنا و کردیە وانە؟

مامۆستا کەمێک دادەمێنێ، لە هاوار نزیکدەبێتەوە و دەڵێ:

هەرچەندە تۆ لە ماتماتیک نمرەت زۆر باشە بەلام زۆر کەری.

تا هێزی تێدایە زللەیەک لە بن گوێی دەدات، دنیا لە بەر چاوی ژێراوژوور دەبێ، دەکەوێ، بە خۆ دێتەوە لە ژووری بەرێوەبەر، راکشاوە و سەر و سینگی تەڕە.

بڕیار دەدات تۆڵەی ماتماتیک لە مامۆستای ماتماتیک بکاتەوە، بەلام حەفتەیەک رانابرێ، دەبینێ پارچە پەڕۆیەکی رەش بە دەرگای قوتابخانەوە هەڵواسراوە ومامۆستای بیرکاری چووەتە بەر دۆلۆڤانیی خودا. بە دیتنی ناوی مامۆستاکە لە سەر پەڕۆ رەشەکە، راچڵەکی و پەشیمانبۆوە لەوەی ویستبووی تۆڵەی لێ بکاتەوە. لەبەر خاتری مەرگی مامۆستای بیرکاری لەو مامۆستایەش خۆشبوو کە عەرەبی لە کوردی پێ باشتر بوو.

ئەوساڵ هێندە و نیوی ساڵانی پێشوو سەری بە سەر کتێبەوەیە، کتێبە عەرەبییەکان، چ عەرەبی نازانێ، بۆیە دێر بە دێر ئەزبەر دەکات و نمرەی تەواویش وەدەست دەهێنێ، مامۆستای جوگرافیا جارێک لێی پرسی:

تۆ پێشتر خوێندنت بە عەرەبی بووە؟

بەسەرساميیەوە:

نەخێر.

مامۆستا دەپرسی:

ئەدی چۆن، لە جوگرافیا نەوەت و هەشت دەهێنی؟

دەنگێک لە ریزەکەی لای پەنجەرەوە بە منگەوە گوتی:

قۆپیە دەکات.

هاوار دەنگەکەی ناسیەوە، لێی بەرکدا چوو، بیری چۆوە لای دارلاستیق، ویستی بڵێ، مامۆستا خۆ من لە رۆژانەش باش وەڵام دەدەمەوە، ویستی بڵێ مامۆستا نمرە بەرزیی من بە هۆی هاتنەوەی گوڵنارە نەک قۆپیە، نەیگوت، چۆن دەیڵێت! بە پێویستی نەزانی، رۆژی دواتر تاقیکردنەوەی جوگرافیایە، مامۆستا هاوار بە کورسی و مێزەوە دەباتە بەر دەم تەختەرەشەکە و جوان جوان بەرکەکانیشی دەپشکنێ، بە وردیش لە دیواری بن تەختەرەش و سەر تەختەرەش و تەنیشتەکانی ورد دەبێتەوە. چارەگێک دەبا و نابا، هاوار لێدەبێتەوە، مامۆستا لێی وەردەگرێت و دەینێرێتەوە جێگاکەی خۆی. مامۆستا پێنووسەکەی دەرهێنا، پەرەکە دەخوێنێتەوە، بانگی هاوار دەکات و لە پێش تەختە رەشەکە لە تەنیشت خۆیەوە رایدەگرێ و بە قوتابییەکان دەڵێ:

پێنووسەکانتان دانێن و تەماشای من بکەن.

دەست دەخاتە سەر شانی هاوار و ماچێکی دەکات و پەرەکە پیشاندەدات و دەڵێ:

ببینن سەدی هێناوە، هاوار زیرەکترین قوتابی قوتابخانەیە، چەپڵەیەکی توندی بۆ لێدەن.

مامۆستا رووی لە هاوار کرد و گوتی:

لەو قوتابییەش ببوورە کە پێیوابوو قۆپیە دەکەیت.

دەیویست ئەو رووداوە بۆ گوڵنار بگێڕێتەوە کە لە تەنیشتییەوە دانیشتبوو، گوڵنار ناوە ناوە دەهاتە ماڵیان و هاوار ماتماتیکی بۆ راڤە دەکرد. لە ماتماتیک توانایەکی سەیری هەبوو، قورسترین هاوکێشە لای وی ئیشی یەک خولەک بوو، ئاو خواردنەوە بوو. مامۆستای بیرکاری سەری لێ سوورمابوو، هەر پرسیارێکی لێ دەکرد، هی پۆلەکانی سەرووتریش، بۆیە دەیگوت:

هاوار مامۆستایە.

بووەتە مامۆستای ماتماتیکی گوڵنار، جێی دانیشتنیش بەر چاوانە، هاوار حەزیدەکرد لە پەنایەک دوور لە چاوان دوو بە دوو دانیشتبان، بەڵام وەک بڵێی بۆی دیاریکرابێت بە حەزی وی نەدەهاتەوە. بە شێوەیەک بۆی راڤەدەکات، گوڵنار بە ئاسانی تێدەگات و دەڵێت:

ماتماتیکی تۆ زۆر ئاسانە، هی مامۆستا قورسە.

لە ساتی راڤەکردنی ماتماتیک، پەنجە رەشتاڵەکانی هاوار بزۆزن، ناوەستن و دەبزوون، نزیکدەبنەوە لە پەنجە سپیوسۆلەکانی گوڵنار، نزیکدەبنەوە و دەکشێنەوە، چەند حەزدەکات، بیانگاتێ و توند بیانگوشێت، بەڵام کوا زاخی ئەوەی هەیە. جارێک لەو جارانە پەنجەی هاوار بزووت، رۆیشت و نەکشاوە، گەیشت و بەر پەنجەی نەرمی گوڵنار کەوت، بەڵام ئەو دەستی خۆی کێشایەوە، هاوار بە شەرما داکەوت، پەشیمانبۆوە لەو هەڵەیەی لە رێی پەنجەی بزۆزەوە روویدا، دووبارەی نەکردەوە. بە خۆی دەڵێت بۆ وا بکەم، ئیدی گوڵنار گوڵناری خۆمە، کاتێ خوێندنمان تەواوکرد لێکدی مارەدەکرێین. رێنادەم کەسی دی بیبات، نا، خۆیشی شوو بە کەس ناکات، دڵم دەڵێ، گوڵنار جگە لە من کەسی ناوێ. لە چاویڕا دیارە، ئەها جار جارە چۆن تەماشام دەکات، ئەو تەماشاکردنە هی حەزلێکردنە، هەر دەبێ هی حەزلێکردن بێ، کوا هیچ کچێکی دی بەو شێوە تەماشام دەکات! نا دەستی لێنادەم، ماچی ناکەم، هەمووی هەڵدەگرم بۆ شەوی گواستنەوە، ئەو شەوە تۆڵەی سەردەرێ و بەردەرێ دەکەمەوە، نا، نابێ دەستی لێبدەم، زۆر تەماشاشی ناکەم، خۆم تووشی گوناح ناکەم.

زۆر لە (نەزەر و زینا) دەترسا، ئەو دوو شتەی هەردوو قورئانخوێن لە سەری کۆک بوون، حەمەد و جەبار لە بارەی هەموو شتەکانی هەردوو دنیا کێشەیان

هەبوو، نەدەگەیشتنە یەک، بەڵام لە بارەی (نەزەر و زینا) هەندێ جار هێند کۆک و تەبا بوون، لە باتی یەکتر قسەیان دەکرد، چەند جار گوێی لە حەمەد بووە:

گوناهە تەماشای ژن و کچان بکەن، گوناهە دەستتان بە لەشیان بکەوێ و دەستگەمەیان لەگەڵ بکەن، ئەگەر دڵتان بە کچێکدا چوو، تا مارەی نەکەن لێی نزیک نەبنەوە.

جەباریش هەر وای دەگوت، بەڵام (گوناهـ)ەکەی توندتر گۆدەکرد.

ئیدی هەوڵینەدەدا جێیەکی بەر جێیەکی گوڵنار بکەوێت، بەڵام بە خەیاڵ هەمیشە لە باوەشی بوو، بیستی بە خەیاڵیش بیر لە لەشولاری کچی خەڵکی بکەیتەوە هەندێک گوناهت دەگاتێ، بەڵام گوێی بەو گوناهە نەدا.

هاوار دێتەوە بیری، دیداری هاورێی، ئەو دیدارەی کە هاوار پێیوابوو تاکە کەسە کە شتێک لە کەینوبەینی ئەو و گوڵنار بزانێ. چەند جارێ بە گوێی هەڵدا کە پێیبڵێ، بە گوڵنار بڵێ و خۆی لێ ئاشکرا بکات کە حەزی لێدەکات، هاوار قسەی دیداری بە دڵ نەبوو، چوونکێ پێیوابوو گوڵنار لە خۆی جوانتر هەستیپێکردووە، ئەوەی رووشیدا، شووکردنەکە بە حەسۆ لە ناچاریەوە بووە، ئیدی تەواو هیچ بەربەستێک لە نێواندا نیە و خوێندن تەواوبکەن بۆ یەکتر دەبن، ئەوەشی بە دیدار گوت:

واز لەو قسانە بێنە، دووبارەی مەکەوە.

ساڵی خوێندن گەیشتە رۆژەکانی دوایی، کارتی پێش کۆتایی وەرگیرایەوە، هاوار لە سەرجەم وانەکان بەخشراوە، لە هاتنەوە بیر لە گوڵنار دەکاتەوە، داخوا نمرەکانی چۆن بێ، دایک و باب کارتەکەیان لە دەستە و دەستخۆشی لێدەکەن، باب هەندێک پارەی بۆ رادەگرێ و پێیدەڵێ:

دڵت چی دەخوازێ، بیکرە، ئەگەر بەشی نەکرد داوابکە.

کوڕ بە نابەدڵی دەستی برد و پارەکەی وەرگرت، هاتە سەر زاری بڵێ، بابە پەلەت کرد، هێشتا گوڵنار نەهاتۆتەوە. لەگەڵ قووتدانەوەی تفێک قسەکەشی قووتدایەوە و نەیکرد. خەمی خوارد، نیگەران بوو، چۆن دەبێ، باب گوڵنار لە بیربکات، ئایا بەهۆی مێردکردنەکەوەی دیاری بۆ ناکڕێ، تێنەگەیشت. چاوەڕێیە گوڵنار بە خۆو کارتەوە بێ، کات بە سەر چوو، نەهات، چووە سەر بان، تەواوێک تەماشای ماڵیانی کرد، نە لە پێش دەرگا نە لە حەوشە نەیدیت. بە پێش ماڵیان تا ئەو سەری کۆڵان رۆیشت، گەڕایەوە، نەبوو. ئۆقرە ناگرێ، عەسر داهات، گوڵنار هەر نەهات، دەیویست بە دایکی بڵێ، بچێ، شەرمیکرد، دایک دەڵێی دڵی کوڕی خوێندۆتەوە، دەڵێ:

گوڵنار دیارە نەهات، با بچم، بزانم.

باب دەڵێ:

لە بیرنەکەیت دیاریەکی جوانی بۆ بکڕە.

دایک دەڕوات، کوڕ وەکات دەچێتە سەر بان، بەڵکوو لە ساتی دەرگا کردنەوە گوڵنار ببینێ، لە دوورەوەش هەر باشە. دیتی گوڵناری دیت، بەڵام لەو دوورەوە سیمای دیار نیە، تا بزانێت خەفەتی هەڵگرتووە، یان پڕە لە شادی، هاوار دەپاڕێتەوە، لە خودا دەپاڕێتەوە کە نمرەکانی بەرز بن. لە ڕێی نمرەکانی پێشوویەوە دەزانێ زەحمەتە لە هیچ وانەیەک ببەخشرێ، هەر نەکەوتبێ، تا دایک هاتەوە بیست جار پتر چووە سەربان، دایک دەڵێ:

حەیف ئەو کچە زیرەکە وای بەسەرهات، لە دوو سێ وانە کەوتووە، هەر دەگریێ، بەڵام باشە هەموویان لە سەرەوەی چلە، بخوێنێت پڕیاندەکاتەوە.

هاوار بە خۆی نەوەستا:

لە ماتماتیکیش!

دایک بزەیەکی شیرینی کرد:

نا، چۆن لە ماتماتیک دەکەوێت، دەزانی چتۆ مامۆستایەکی هەبوو!

چۆن بگاتە گوڵنار و دڵی بداتەوە، بە پەنجەکانی فرمێسکەکانی بسڕێ. نا، قسەی مەلاکانی بیرکەوتەوە،

نابێت دەستی بە هیچ جێیەکی کچی خەڵک بکەوێ. چ بکات باشە، نەیبینێ دڵی دەتەقێت، سەر بان دەکات، دەچێتە کۆڵان، نەیدیت.

ڕۆژی دواتر گوڵنار خۆی هات، داوای لێکرد کە کیما و... پێبڵێ، هاوار هێندەی نەمابوو پڕ بە دەم پێبڵێ، وەی بە سەر هەر دوو چاوم هەر تۆ و وانە! گێڕایەوە، بەڵام بە چاو هەمان ڕستەی گوت و گوڵناریش پێدەچوو ڕستەکەی بیستبێ. ئەو چەند ڕۆژە گوڵنار زوو زوو دەهاتە ماڵیان، هاوار هەموو توانای خۆی وەک مامۆستایەک لە وانەگوتنەوە بەکارهێنا، گوڵناریش قوتابیەکی گوێڕایەڵە.

گەیشتە ڕۆژی کارت وەرگرتنەوە. چوو، لە سیلەی خانووێ ڕاوەستا، نەدەبوو کوڕ لە پێش دەرگای قوتابخانەی کچان ڕاوەستێ. نزادەکات گوڵنار سەرکەوێت و نەکەوێت. لە بیریەتی خێرێکی لە خۆی گرت، لە سەر ئاو و ئاگرە، ئۆقرە ناگرێ، دەست و پێی لە جوولەیە، بۆ ژوان و ڕامووسانیش با، هەر وای لێدەهات! ئەها کچان وا دێنە دەرێ، هەندێک حریت حریت پێدەکەنن، هەندێک کز دیارن و دەڵێی دەگرین، ئا، ئەو دوو کچە نزیکبوونەوە، خوڕ خوڕ فرمێسک دادەبارێنن، هاوار دەڵێ:

خودایە، فرمێسک بە چاوی گوڵنارەوە نەبینم، خودایە بە پێکەنینەوە، بێتە دەرێ.

هات، به تەنێیە، نزیکبۆوە، سەیرە نە پێدەکەنێت، نە دەگری، دەچێتە پێشی:

چ بوو، بڵێ؟

بزەیەکی شیرینی کرد:

سوپاس بۆ تۆ سەرکەوتم.

هاوار هەناسەی ئۆخەی هەڵکێشا و بە دەنگی بڵند (ئۆخە)یەکی کرد، گوڵنار بزەیەکی شیرینتری بۆ کرد و بە چاو پێیگوت:

وا باشترە پێکەوە نەچینەوە.

خۆ چاو قسەشی نەکردبا، هاوار ئەوەی دەزانی. ئەو پێی هەڵێنا و ڕۆیشت و هاوار دوور بە دوور بە دوایەوە. تەماشای بەژن و بالای زراڤی دەکرد؛ خۆی بە پرچیەوە هەڵواسی کە لە دواوە کردبوویە دوو کەزی، درێژ گەیشتبوونە سەر سمتی، چ سمت! هاواری ڕاچڵەکانت، ئەوە یەکەم جارە لە سمتی وردبێتەوە و حەزی بچێتێ. قسەی مەلای بیرکەوتەوە و هەوڵیدا حەزی سمت لە دڵی دەربکات، دوورابیەکی دیاریکراوی لە نێوان خۆی گوڵنار دانا، بە پێی ئەو دەڕۆیشت، وای دانایە پێش ئەوەی گوڵنار بگاتە پێش دەرگا، ئەو بگاتە سیلەی کۆلانێ، دانانەکەی تەواو هاتەوە، گوڵنار لە سەر دەرگا ئاوڕێکی دایەوە، هاوار

فێنکبۆوە، بە دڵخۆشیەوە گەیشتەوە ماڵ، چەند حەزیدەکرد بڵێتە دایکی کە گوڵنار دەرچووە، شەرم دەمی بەست.

هـاوینێکە، رێـک پـێچەوانەی هـاوینی پێشـوو، هـاوێنیکە فێنـک، پشـوویکە پڕ لە ئاسـوودەیی، هـاوار دەیەوێـت ئەو هاوینە کرێکاری بکات، باب رێی نادا و پێیدەڵێ:

لە هیچمان کەم نیە، تۆ بۆ خۆت پشووبدە.

کـوڕ حەزی لە کـارە، دایکـی رازی دەکـات کە سـبەینێ زوو لەگەڵ بانگدانی بانگیبکات. بەو تـاریکیە دوو سـێ نـان و سێ چوار هێلکەی کوڵاوی خسـتە کیسـەیەکەوە و لەگەڵ دیدار و سـیامەند دەردەچـن و دەچـنە مەیـدانی کرێکـاران، حەزیـان لێـیە هەرسـێکیان پـێکەوە بـن، رێکناکەوێـت، هەر وەسـتایەک دێ یەک یـان دوانیـانی دەوێ. لە کۆتـایی رازی دەبـن کە تەنیـا تەنیـاش بچـن، هــاوار بە تەنــێ بەگەڵ وەسـتایەک دەکەوێت، سـواری شـڕە ترومبێلێـک دەبن، تەق تەق، بڕۆ بڕۆ، هێشتا رۆژ هەڵنەهاتووە، ئەوە دەچێتە کوێ! سەر هەڵدەبڕێ، ئێرە مـاڵی نەنەخـانە، سـووڕایەوە، رێک لە سەر ئەو پارچە زەوییە راوەستا کە تاکە زەوییە لەو ریزە بە بەتـاڵی مـابێتەوە، لە تەنیشـت مـاڵی گوڵنـار و پشـت بە پشتی مـاڵی دیدارەوە. دوو رۆژ پێشـتریش دیتبووی سـێ چوار کرێکار بنـاغە لێدەدەن، هـاوار خـۆزگەی خواسـت کە ئەو چـوار کرێکـارە بـۆ ئەوان کـار بکەن و ماڵیـان بە مـاڵی

گوڵنارەوە بێت و گۆرانی ( ماڵمان ماڵێکە دیوارمان بەینە) بڵێتەوە.

ویستی بە وەستاکە بڵێ کە توانای ئیشکردنی نیە، شەرمیکرد، هاتە سەری بە بێ پرس خۆی بدزێتەوە، بە شتێکی جوانی نەزانی، ئێ چ بکات! ئاساییە دایکی بێ و لە بن ئیشێ ببینێ! ئەدی گوڵنار چی دەڵێ! بەڵام خۆشە گوڵنار دەبینی، هەر بێتە دەرێ دەیبینێ، ملیدا کە بمێنێتەوە و کار بکات، بەڵام بە جەمەدانییەکە جوان خۆی دەمامکدا، تەنێ کونی چاوی دیاربوو. داینابوو ئەگەر وەستا یان کرێکارێک بپرسێ، بۆ وات لە خۆت کردووە؟ بڵێ دەموچاوم دوژمنایەتی لەگەڵ تیشکی رۆژ هەیە.

دوو پەقرەجی لە دەستە و چەمەنتۆ دەکێشێ. ئەوە گوڵنارە بە تەنیشتیەوە تێپەڕی، بە لای کەندێدا سووڕایەوە، هاوار هێندەی نەمابوو پەقرەج تووڕهەڵدا و تا ماڵێ گیر نەبێ، خۆی گرت، ئای ئێستا گوڵنار وا لە ماڵیانە، چەند رۆژە نەچووە، هەر دەبێ بۆ دیتنی هاوار چووبێت، هاوار نازانێت چۆن چەمەنتۆ تێدەکات و دەیبات و دێتەوە، زۆری نەبرد گوڵنار بە لەنجەولار هاتەوە، هاوار جەمەدانیەکەی لە سەر لووتی کەمێکیتر هەڵکێشایەوە، تەماشای ناو چاوی گوڵنار دەکات، دەبینێ سەری دادەخات، پێناچی بەو تەماشاکردنەی زانیبێ. چاوی لە سەر هەڵناگرێ، تیژ دێ و خۆی بە ژووریدا دەکات، دوای کەمێ گوڵنار بە سۆندەی ئاوێوە دێتە دەرێ. بڕیاردەدات لە تێری تەماشای بکات، چ

دەبینێت خودایە! دەبێت جوانی وا هەبێت لەو دنیایە؟ تا ئێستا گوڵناری جوان نەدیتبوو، شەرمیکردبوو، ترسابوو، بە وردی لێیبڕوانێ، بەلام ئێستا لە بن دەمامکەوە لە تێری لێی دەڕوانێ. گوڵنار پێناچێ هێندە ئاگای لەوە بێت کە کەوتۆنە بۆسەی نیگای کوڕێکی دەمامکدراوەوە. جاروبار سەر هەڵدەبڕێ، بەلام رەنگە جگە لە سەرێکی بە جەمەدانی داپۆشراو چ چاو نەبینێ. هاوار لە ساتی چەمانەوە بەشێک لە سینگی گوڵناریشی دیت، چاوی لە سەر کەلێنەکە راگرت. گوێی لێیە وەست ا( چەمەنتۆ چەمەنتۆ)یەتی، ئەوە یەکەم جارە وەستا چەمەنتۆی لێبڕێ. هاوار هەرچەندە رۆژی یەکەمی کرێکاریی بوو، بەلام باش ئیشی دەکرد، خۆی کوشتبوو، چوونکێ دیدار زوو پێیگوتبوو:

ئەگەر دەتەوێت وەستا بتباتەوە ئیش. دەبێ ئیش بکەیت و خۆت نەگنخێنیت.

خۆی نەدەگنخاند، دەیویست بەیانیش بێتەوە ئێرە، جگە لەوەش هەستی بە ماندوویێتی نەدەکرد. چاوی گوڵناری لێوە دیار بێت، چەمەنتۆکێشان چیە! وەستا هەر چەمەنتۆ چەمەنتۆیەتی، بەلام هاوار تا سەیری کەلێنی دوو مەمکان هەبێ، دەست بۆ دوو پەقرەجە چەمەنتۆ دەبات! هاوار ئێرەیی بە حەسۆ برد کە سێ چوار مانگ چۆن کەوتبووە ناو رەز و میوەی بەهەشتێ. ئەو رۆژە هاوار جوانیی گوڵناری دیت، ئەو رۆژە بە شێوەیێ تەماشایکرد، لە کوێ ببینێ بە سیما بیناسێتەوە. پێشتریێ پتر بە دەنگ

دەیناسـیەوە. نیوەڕۆکەشـی لەگەڵ کرێکارەکـان هەر لەوی مـایەوە، بەڵام لەو مـاوەیە گوڵنـار نەهـاتە دەرێ، لە سـاتی دەستهەڵگرتنی چاوەڕێ بوو وەستا بڵێ:

سبەی وەرەوە.

هەیهـوو! دیـوار تەواو بووبـوو، بەڵام هیـوابڕ نەبـوو، گـوتی کـاری دیـوار تەواو بـووە، هێشـتا ئیشـی زۆر مـاوە، بەڵکـوو لەگەڵ وەسـتایەکی دی بێـتەوە ئێـرە. بە نـابەدڵی رۆژانەکەی وەرگـرت، کرێکارەکـان رۆیشـتن، ئەو خـۆی بە میزکردن و دەستشووشتنەوە خەریکرد. هەستیکرد گوڵنـار هاتە دەرێ، خێرا خۆی دەمامک دایەوە و لە جێی خەفتەکە نزیکبـۆوە. هەوبوو، چووە فرۆشـگاکەی ئەوبەر و شـتێکی کـڕی. لە گەڕانەوە سـاتمەی لە شـتێک کـرد و دەمـاودەم کەوت. دەیویسـت غـاری داتـێ، بەبیـری هـاتەوە کە دەمامکدراوە. هەستایەوە و لە هەسـتانەوە دیسـان چـاوی کەوتەوە سـەر سـینگی، بەرگەی نەگـرت و رووی خـۆی وەرسـووڕاند. لەگەڵ چـوونە ژوورەوەی گوڵنـار ئەویـش بەرەو مـاڵ بـۆوە و لە دەو کەنـدێ دەمـامکی کـردەوە. رۆژێکی خۆش بوو، رۆژێک بـوو پڕ لە دەستکەوتی چاو، بڕیاریشیدا بەو پارەیەی ئەوڕۆ دیارییەکی جوان بۆ گوڵنار بکڕێت.

ئەو شـەوە جـوانیی گوڵنـار وەهـا دایگرتبـوو ئاگـای لە هیچ نەبوو. لە سەر جێ راکشابوو، دایک و باوک رەنگە وا

تێگەیشتبن زۆر ماندووە بۆیە وا کفت بووە. دایک ناوە ناوە دەیگوت:

کوڕم مەچۆ ئیش، تۆ هی ئیش نیت.

کوڕ نەیدەویست کچ لە خەیاڵی بچێتە دەرێ، بۆیە وەڵامی دایکی نەدەدایەوە، دوا جار گوتی:

دایە، سبەی زوو هەڵمستێنە، دەچمە مەیدان.

خۆی وەرگێڕایە سەر زگ و چاوی بڕیە سینەی گوڵنار و لە خودا پاڕایەوە کە سبەی وەستایەک بیهێنێتەوە جێی ئەورۆ، بەڵام پاڕانەوەکەی نەگەیشت. زۆربەی رۆژەکانی ئەو هاوینە گەرمە چووە کار، ئێ رۆژێک ئیش بکەوێتە کۆڵانی ماڵی گوڵنار، نەکەوت. لەو هاوینەش لەو کۆڵانە سێ چوار خانوو تێکدرا و چاککرایەوە.

ئەو هاوینە زۆری کار کرد، پارەیەکی باشی خڕ کردەوە. هەر رۆژێ دەچووە کار، دیارییە نادیارەکەی بۆ گوڵنار دانابوو، گەورەتر و گرانبەهاتر دەبوو. نەیدەزانی چی بۆ بکڕێ و چۆن بیداتێ. دەمێک بیری بۆ بازنی زێڕ دەچوو، دەمیک بۆ کاتژمێری زێر، دەمێک بۆ خەناوکەیەک هیچ ژنێک لە گەرەک لە ملی نەکردبێ. باشە، ئەوە کڕی بە ناوی چی و چۆن بیداتێ؟ شەرمدەکات، دەترسێ، ئەگەر وەرینەگرت، یان ئەگەر کەسێک زانی، نالێ ئەو زێڕەت لە کوێ بوو؟ ئێ هەر دەشزانن، دایک و براکەی دەزانن،

ئەدی چ بکـات، هەر دەبـێ دیـارییەکی جـوانی بـداتێ، دیارییەک لە جوانیی خۆی بێ.

هـاوین رۆیشـت، پشـوو تەواو بـوو، سـبەی دووەی قوتابخـانەیە، دیاری نەکرا. پارەیەکی زۆری گلداوەتەوە و دەستی لێنادا، بۆ دیاریی هەڵگرتووە، بەڵام کەی؟ دیار نیە، رۆژێک ئـازایەتی گرتـی و چـووە نـاو زێڕنگـران، هەرچـی پارەی هەبوو بە خەنـاوکەیەکی دا. بە دزی هێنـایەوە مـاڵێ، دەیویسـت لە هەڵێکـدا بیـداتە گوڵنـار رێکـنەدەکەوت. ئەو سـاتەی بـوێری دەیگـرت، گوڵنـار دیـار نەدەکەوت. ئەو ساتانەی گوڵناریش دەهات، چۆرە بوێریەکی تێدا نەدەما، چ بکات باشە؟ دەترسێت دایکی خەناوکەکە ببینێ، هەینێ چ بڵێ، بڵێ هی کێیە بۆ کێیە. باشترە چەندی زووە بیداتێ بەڵام کوا زاخ! بیریکردەوە تا دەیداتێ لە جێیەک باش باش تەقەتی بکات، کوێ باشە! کوێ باشە! بن بەرماڵەکەی پیری گەڕیدەی بە خەیاڵـدا هـات کە ئێسـتا پەسـتراوەتەوە و لە جیاتی بەرماڵیش کـانتۆڕێکی گچکەی لێ دانراوە. دوور لە چـاوان بسـتێک پتـر عەردی هەڵکەنـد، زێـڕەکەی لە دەستەسرێک پێچا و خستیە بن خۆڵەوە.

لە سـەر سـەکۆی بـن داربـی دانیشـتووە، گـوێی بـۆ خوێنـدنی داربـی هەڵخسـتووە. چـاوی لە سـەر خوشـک و برایە کە بە دەوری داربی غارغـارانێ دەکەن، بیریشـی لای گوڵنارە. لە یاریی خوشک و براوە خۆی و گوڵناری دێتەوە

بەر چاو، ئەها خوشک و برا زۆرانێ دەکەن، پرچی یەکتر رادەکێشن. لە بن لێوانەوە دەڵێ:

خۆزی لە خۆزیداران هەر منداڵ دەبووین و لە بن داربی دەماینەوە. چەند خۆشبوو منداڵی، پڕ بوو لە زۆرانێ، لە تۆپانێ و قاقایانێ، کرێمستی، چەند خۆشە منداڵی نە مێردکردنی تێدا بوو، نە دوورکەوتنەوە.

بە سەرێکیش گەورەبوونی پێخۆشە، ئاخر هەر خوێندن تەواوبکات، دەنێرێتە داخوازیی گوڵنار. خوشک و برا گەمە دەکەن و ئەو ئیرەییان پێدەبات. رۆژانی پیری گەڕیدە و نەنەخان و خۆی و گوڵناری بە خێرایی بە بەرچاودا وەک کاسێتێک کە بیدەیتە سەر خێرایی، ئاوا تیژ بە بەر چاویدا تێدەپەڕن و گرتەکانی بۆ ناگیرێ. چەند گرتەیەکی ئایندەیی، هی گەورەیی دەبینێ، ئەوەتا بە جلکی زاوایەتییەوە لە ناو قەمەرەیەک لە تەنیشتی دانیشتووە، گوڵنار بەرگی فریشتەی پۆشیوە لێو و پەنجەکانی لە رەنگی کرێمستیی سوور کردووە. ئەها گەیشتنەوە ماڵێ، شەو داهات، لە تەنیشت یەک راکشاون، وەک ئەوجارەی لە بن دارخورماکە راکشابوون، بەڵام ئەو جارە شەرمناکات، دەست دەخاتە سەر سینەی گوڵنار، رایدەمووسێ... دەخەون لە باوەشی یەکتر دەخەون، باب نەبا وەها زوو بە ئاگا نەدەهاتنەوە:

کوڕم، وەرەوە شەو داهات.

* * *

دوو ڕۆژە دەرگـای قوتابخـانە کـراوەتەوە، سـێ ڕۆژە گوڵناری نەدیتووە، نە لە ماڵ و کۆڵان نە لە ڕێی قوتابخانە. یالا خێر! دەبێت چی ڕوویدابێت؟ سـەر بان دەکات، کۆڵان دەکـات، گوڵنـار دیـار نـیە، لە سـووچێک، لە سـیلەیەک دەرناکەوێـت. هەر دەبێـت لە دایکـیـەوە شـتێک ببیسـتێ، شەرمیش دەکات بپرسێ، ناچار دەبێت بە دوای دایکییەوە بێت، خۆی لێ بگرێت، ئێ، ئەوە خوایە، قسەیەک لە زاری دەردەچـێ کە پەیوەنـدی بە گوڵنـارەوە هەبـێ. دەرچـوو، هاوار گوێی لێیە دایک بۆ باب قسە دەکات:

وێدەچێ ئەو جارە بەخـت یـاری بـێ، چـوونکێ دایکـی بۆی دۆزیوەتەوە.

باب دەڵێ:

ئەو گوڵنـارە منداڵە چـی بەسـەرهات، لەو تەمەنە و دوو جار مێردکردن!

هـاوار چـاو دەکـاتەوە، ئێـرە کـوێیە، نە مـاڵە، نە قوتابخانەیە، نە بن داربیە، نە بن دارخورما، نە سەر منارە و بازاڕ، ئێرە کوێیە؟ بە هەردوو دیودا ئاوڕدەداتەوە، ئەو ژوورە گەورە پڕگڵۆپە کوێیە، ئەو هەمـوو پەڕۆکە سـپییە چـین؟ دایکـی دەبینـێ لە سـەر سـەریەتی، سـەری سووڕدەمێنی، باب دەگاتە سەری و دەڵێ:

هیچ نیە کوڕم، هەوکە دەچینەوە ماڵێ.

هاوار شتێکی ئەوتۆی لەو ڕۆژ و حەفتە و مانگانەی دوای خەستەخانەی بیرناکەوێتەوە، جگەرەی بە دەستەوەیە، دایک دەڵێ:

ئەیرۆ! کوڕم، جگەرە دەکێشی؟

گوێی لە دەنگی بابیەتی:

لێیگەڕێ، وازی لێدێنێ.

لە ڕێی کارتەکەیەوە کە یەکەم کارتیەتی مابێتەوە دەزانی نمرەکانی زۆر خراپن و بە جرەجر سەرکەوتووە و پۆلی سێیەمی ناوەندی بڕیوە.

وەک خەون ئەوەشی دێتەوە بیر، لە بن داربی دانیشتووە، دڵی پڕە، گریانی دێت، دایکی دێت لە ئامێزی دەگرێت، ماچی دەکات و فرمێسکەکانی دەسڕێت.

لە بیریەتی هاوینی پاشتر گوڵنار بە مێردی تازەوە دێنە ئەو خانووەی کە بە دەمامکدراوی ڕۆژێک کرێکاریی تێدا کردووە، ئەو خانووەی پشتی بە پشتی ماڵی دیدارەوەیە. دێتەوە بیری لە سەر بانەوە ڕۆژانە پووشکاخەزی بۆ سەر بان و حەوشەیان هەڵدەدا و نامەی بۆ گوڵنار دەنارد، بەڵام هەرگیز لە نامەکانی نە ناوی خۆی نە هی گوڵناری نەنووسیوە.

دێتەوە بیری داوا لە دیدار دەکات کە لە شەوێکی هەیوەشەوی سەربانەکەی خۆیانی بە قەرد بداتێ. دیدار هەرنی پێدەدات هەر کاتێک کە وادەی سەردان هات، ئەوان ناوە ناوە دەچوونە سەردانی خزمانی دەرەوەی شار و شەو نەدەهاتنەوە، کلیلی دەرگای حەوشەی بداتێ. دیدار بێ ئەوەی بپرسێ چیت لە بن سەرە؟ هەرێکەی دەباتە سەر و کلیلی لە مست دەنێ.

شەوێک نازانێت چ کاتی شەوە، لەبیریەتی مانگەشەوێکی ئاوینەییە، هەڵەی نەکردبێ هەر ئەو شەوە بوو کە برادەرەکەی بابی بە (شەوترین تەمووز) ناوی هێنا، ئەو شەوەی جێگر لە تەلەفزیۆنەوە، لە جێگرییەوە خۆی کردە سەرۆک، تۆڵەستێن کاتێ ئەوەی دیت و بیست، گوتی:

ئەو پیاوە قەت جێگر نەبووە، هەمیشە سەرۆک بووە.

برادەرەکەی گوتی:

وایە، بەڵام لەمەودوا لە تاوان گەرمتر دەبێت، بەراستی ئەوشەو شەوترین تەمووزە.

هاوار لە شەوترین تەمووز خۆی لە ماڵ دەدزێتەوە، بن دیوار و بن دیوار دەگاتە بن دارتووەکەی پێش دەرگای ماڵی دیدار و چاو بە کۆڵان و دەرگاکاندا دەگێڕێ، باشە دەرگا کەوتۆتە سێبەری درەختەکە. دەرگا دەکاتەوە و بە

هێواشــی بە قــادرمەدا هەڵــدەگەڕێ، خــۆی دەداتە پەنــای دیواری خانووەکەی قاتی سەرێ، پەنایە و تریفە لێی نـادا، کەس نایبینێ. دیـواری ستارەکە بڵندە، چاو دەگێڕێ، سێ چوار بلۆک لە سووچەکە دەبینـێ، دەچێت بلـۆک بێنـێ، لەو ساتە لە سـەر بـانی ئەو لا کە سـتارەکەی نـزمە، دەبینـێ دەڵێـی منداڵە خـۆی لە باوەشـی گوڵنـار نـاوە. هـاوار زوو رووی خـۆی وەردەگێـرێ، دوو بلـۆک دێنـێ و دەیانخـاتە سەر یەک.

ئێ، لە تەنیشت یەکتر لە سەر پشت راکشاون، سـەر لە لای وی، پـــێ لەو لا، راکشــــانی بــــن دار خورمـــاکەی بیرکەوتەوە، سەربانی بەجێهێشت و گەڕایەوە بن داخورما، دەســـتەکە نەبـــا وا زوو نەدەهـــاتەوە، پیــاوەکەی خــۆی وەرگێـڕایە سـەر تەنیشـت و دەسـتی خسـتە سـەر سـین و مەمکان. هـاوار گەیشـتەوە دار خورمـاکە و وەکـات هـاتەوە سەربانەکە، ئاخێکی قووڵی هەڵکێشا:

لە دەستمچوو دەستم نەخستە سـەر سینەت، هەر بۆیە لە دەستمچووی.

چاو لە سەریان هەڵناگرێ، دەبینێ، دەستی سـەر سینە بــۆ خــواری شــۆڕبۆوە، لەگەڵ ســەرکەوتنەوە، لچکــی کراسـەکەی لەگەڵ خـۆی هێنـا، جووتێ ران کە دەتگوت لە بەفـرەوە هـاتوون کەوتـنە بەر تـریفەی مانگەشـەو. هـاوار بەرگەی نەگـــرت و ســـەری داخســـت، ویســـتی بـــڕوات،

بیـــریکەوتەوە بـــۆچی هـــاتووە، دەســـتی بە گیرفـــانی شەرواڵەکەیدا کرد، دارلاستیقی دەرهێنا و بەردێکی جوان لەو بەردانەی گوڵنار حەزی لێبوون، خستە ناویەوە. رایکێشا، سێرەی لە سەری گوڵنار گرت، دەستی لەرزی، هەناسەی سوار بوو، دەست و پێ شل بوون، هێندەی نەمابوو بەربێتەوە. سێرەی گرتەوە ئەوجارە لە سەری مێردەکەی، لەو دەمە لە سەرەخۆ سوورڕا، سەرکەوت، هاویشتی، بە قەد گوللەیەک دەنگی هات. هەڵێ، خۆیشی لە بیری نیە چۆن دەرگاکەی کلیل دایەوە و چۆن گەیشتەوە ماڵ و چۆوە سەر جێگاکە. لە سەر بانەوە گوێی لە غەلبە غەلبە، سەری هەڵبڕی لە ماڵی گوڵنارە، دڵی کوتەکوتیەتی، وێناچێ ئەو شەوە خەوتبێ.

بە بیری دێتەوە، گوڵنار دێتە ماڵیان، لە هەڵێکدا بەردەکەی بۆ هەڵدات و دەڵێ:

هاوار، چیدی منداڵ مەبە! واز لە هاوار بهێنە.

ئا، لەو رستەیەوە هاوار بیریکەوتەوە کە مێردەکەی گوڵناریش ناوی هاوارە. ئیدی هاواری ئەویندار وازی لە هاواری ژندار هێنا، هەر هێندە نا، لە رێی هاواری ژندارەوە کە زۆر خۆی دەهێنایە پێش و لە دوورەوە سلاوی لە هاواری ئەویندار دەکرد، ئەو دوو هاوارە بوونە ناسیار، دوو سێ جارێ چووە ماڵیشیان. جاری دواییان لە مانگێکی بارانـــاوی بـــوو، هەر ئەو مـــانگە بـــوو کە ئێـــران لە

شاهانشاییەوە بووە ئیسلامی, بەوە بە بیری دێتەوە ڕۆژی دواتر بە شەلە شەل دەچووە گۆڕستان و لەوێ کێشە کەوتبوو نێوان دوو قورئانخوێنەکە ئەو دووە نە بێ یەکتر هەڵیان دەکرد نە پێکەوەش، جەبار دەیگوت:

شیعە کەی موسڵمانن، کۆماری ئیسلامی چی! هەر شاهانشاهیە.

حەمەد دەیگوت:

وا مەڵێ، کێ باش بێت ئەوە باشە.

شەوی پێشتر هاوار و دوو سێ دراوسێی دی لە ماڵی گوڵنار دۆمینەیان دەکرد، هەردوو هاوار بەرانبەر یەکتر دانیشتبوون، گوڵناریش دەهات و دەچوو، هاوار جار جارە تیچاوێکی دەدایێ، لە بیریەتی لە سەر دەرگا سینی لە دەستی گوڵنار دەکەوێت، هەرچی پەرداخ و پیاڵەیە دەشکێن، هاواری مێرد دەڵێ:

چ نیە هەمووی بە قوربانی خۆت بێت.

شەو درەنگە بەڵام دۆمینە درێژە دەکێشێ، هاواری ئەویندار دەچێت دەست بە ئاو بگەیەنێت، لە هاتنەوە لە سەر دەرگا، شووشە بە پێیدا رادەچێت، خوێن فیچقە دەکات، هاواری مێرد خۆی لە گوڵنار توورە دەکات:

شووشـــە دەشـکێت، بـۆچی خڕێنـاکەیتەوە؟ زوو بـۆی ببەستەوە.

هـاواری ئەویـنـدار لە تووڕەبـوونەکەی هـاواری مێـرد تووڕە دەبێ، چۆن دەبێت خۆ لە گوڵنار تووڕە بکات، زۆر خەفەت دەخوات، بەڵام دەسەڵات چیە. گوڵنـار هەر پەکوو پەکوویەتی و دەڵێ:

دەستم بشکێ، نەمزانی.

هاواری ئەویندار دەڵێ:

چ نیە، نە.

گوڵنار پەڕۆکێک دێنێ، دەرمانێک دێنێ، دەست دەخاتە سـەر برینەکە، دەگەڕێ نەبادا وردە شووشـەی تێدامابێت. هـاوار حەزدەکات ئەو گەڕانە بەردەوام بێت و پەنجەکـانی لە بـــرینەکە نەبـــنەوە. گەڕا و نەیـــدیتەوە، پێیـــدادەکات و دەیپێچێ، گوڵنار دەستی بە خـوێن دەبـێ، هـاوار کرێمستی بن داربی بیردەکەوێتەوە، رەنگی خوێن چەنـد لە کرێمسـتی دەچـێ، هەر سـووریێک بە لێـو و پەنـجەی گوڵنـارەوە بـێ، ئەوە کرێمستی بن داربییەکەیە، کرێمستی منداڵی. لە سـاتی تیمارکردن چاوی دەکەوێتە سەر سینەی گوڵنار، پێدەچوو کـونی دوگـمەیەک گەورە بووبێت، لە خـۆوە تـرازا، هـاوار راچڵەکـی، باشـبوو گوڵنـار زوو هەسـتی پێکـرد، دەسـتی خستە سەری و دایخستەوە.

***

هاوار وەک خەون دێتەوە بیری، گوڵنار چاو بە گریانە، دەڵێن هاواری مێردی لە ترومبێل وەرگەڕایە، پتر بە لای مردنە کەمتر بە لای مان. نازانێ چۆن بچێتە لای و چ بڵێ، دەچێت لە سەر بانەوە پووشکاخەز هەڵدەدات و نامەیەکی بۆ دەنێرێ، نامەکە لە گۆرانییەکەوە وەردەگرێ:

سا بەس بۆ رەقیب شین و فریاد کە

جارێکیش دۆستی کۆنە یاد کە

پووشکاخەزەکە بە سەری ماڵی گوڵنارەوەیە، هاوار لە بیری نیە لە کوێ نیشتەوە، گوڵنار دیتی، نەیدیت؟ بەڵام لە بیریەتی مێردەکەی گوڵنار بە شەلە شەل گەڕایەوە. هاوار ئەوەشی لە بیرە ماڵی گوڵنار بە مێرد و دایک و براوە لە پڕ بزر دەبن، دەبیستێ براکەی کەسێکی کوشتووە، ئیدی بە هۆی دوژمنایەتییەوە، هەر گەڕەک نا شاریشیان بەجێهێشتووە.

هاوار لەو ساڵانە لێرەو لەوێ رستەیەک، گرتەیەکی بیردەکەوێتەوە. ئەها هەمەدانی لەمێژ نیە لە چیا هاتۆتەوە، تازەش لەگەڵ تۆڵەستێن پێکهاتوونەتەوە، لە تەنیشت یەکتر لە بن داربییەکە دانیشتوون و گوێی لێیە دەڵێ:

ئای! تۆ پێیەکت لە سەفین بەجێهێشت و منیش چاوێکم لە هەکاری دانا.

لە بیریەتی، شەوێک خاڵە مۆسکۆییەکەی دێت، دایک ئامێزی پێدا دەکات و باب ماچی دەکات، خاڵ دەڵێت:

چار نەما دەبێت بچمە چیا.

باب گریان قورگی دەگرێت:

منیش پێم مابا، بە چیا دەکەوتمەوە

لە بیریەتی تۆڵەستێن جێی پیری گەڕیدەی گرتۆتەوە، رادیۆی بە گوێوەیە، ئێوارانیش بە دزیەوە گوێ لە سروود و هەواڵە قاچاخەکان دەگرێت.

دێتەوە بیری لە ماوەی چەند مانگێک زۆربەی گەنج و جوامێری گەڕەک بوونە سەرباز، ناوە ناوە دارەبازەیەک دەهاتەوە لێی نووسرابوو:

شەهیدی قادسیە.

لە بیریەتی لە گەڕەک یەک خانووی قوڕ مابوو، ئەویش ماڵی تۆڵەستێن.

گوڵێ و چەقۆکە هەر زیندوون، رەنگبێ هەر لە سەروبەندی بزربوونی گوڵنار بووبێ، عەسرانێک هەواڵ هات گوڵێ شووی کرد و بردیان، کەس باوەڕی بەو هەواڵە نەکرد، هەموو دەیانگوت:

نێرە هەیتەو مێرد!

سبەی زوو هەواڵ هات، شەو گوڵی هاتۆتەوە ماڵ، گوێی لە ژنە دەڵێن:

هەر دەبوو وابێت، هەمیشە لە ناو کوڕان بوو، کەسی بە پیاو نەدەزانی، داخوا کێ بێ بنی کردووە!

رۆژی دواتر بە هەموو گەڕەکدا بڵاوبۆوە، زاوا بریندارە و گوڵێش براوە بۆ پۆلیسخانە. دوای حەفتەیەک گوڵێ هاتەوە، لە جاران سەربڵندتر بوو، بە زاری خۆی سەرهاتەکەی بۆ پۆلیس و بۆ خەڵک ئەوها گێرابۆوە:

بە نابەدڵی رازی بووم، بابم زۆر تکای کرد مێرد بکەم. ئێ، شەو زاوا هات، ویستی دەست لە کەمەرم بئاڵێنێ، یەکەم شت کە بەر دەستی کەوت چەقۆ بوو، سەری سوڕما:

+ئەوە چیە! چەقۆ! بۆچی؟

-هیچ نیە، من هەمیشە چەقۆم لایە.

تا هێزی تێدا بوو، زللەیەکی لە بن گوێم دا. سەرم سووڕا، چاوم تاریک بوو. منیش نەمکردە نامەردی، من لە تەمەنم ملکەچیم نەنواندووە ناشینوێنم، چەقۆم لێراکێشا، دوو چەقۆی مەردانەم خێواندێ و بوخچەکەم کە جلکی ئاسایی تێدا بوو، هەڵگرت و هەڵاتم. لە کۆڵانێ لە پەنایەک، هەر لە بای غارێ، کراسە درێژەکەم بە سەر جلکی بووکێنیدا هەڵکێشا و هاتمەوە ماڵێ.

دەیانگوت:

بابی زاوا کابرایەکی تێگەیشتووە، زوو گوڵێی لە زیندانێ دەرهێنا و هیچ لە هیچ.

سەرۆکیش هی لەبیرچوونەوە نیە، لەگەڵ بوێری هاورێی لە یاریگای گەورە دەهاتنەوە، دەبینن هەردوو بەری جادە، سەربانەکان هەر هەمووی چەکدارە و چەک سوارە، بوێر دەڵێ:

من بزانم سەرۆک دێت.

هاوار دەڵێ:

چۆن بگەمە جێیەکی بڵند؟

بوێر:

خۆت کەر مەکە، ئەوە گووی گەمە نیە.

وا دیارە خۆی کەر دەکات و گەمەکە دەکات، لەو بەری یاریگا، چەند ماڵێک دوور لە جادە، لە دەرگایەک دەدات، ژنیک دەرگا دەکاتەوە:

چیتان دەوێ کورم؟

هاوار زۆر بە رێز و سەنگینییەوە:

پلە، کۆترێکم لە سەر بانتانە، ئەگەر ڕێبدەی بیهێنمەوە دەستەکانت ماچ دەکەم.

ژنە ڕێیاندەدات، هاوار نایەلێت بوێر لەگەڵی بچێت. سەربانەکە گونجاو نیە، دەچێتە سەربانەکەی تەنیشت کە درەختێکی بڵندی پڕ چەند لقێکی بە سەردا شۆڕکردۆتەوە. خۆی دەگەیێنێتە ناو درەختەکە، هەندێک وردە لک و پۆ دەشکێنێتەوە، کەلێنێک دەکاتەوە. ئێستا جادەی جوان لێ دیارە، چاوەڕێی هاتنی سەرۆک دەکات. ئەگەر لە سەر ترۆمبێلەکە بە پێوە ڕاوەستابێ، دەست ڕاوەشێنێ، وەک چۆن لە تەلەفزیۆن نیشاندەدرێ، زۆر باش دەبێ. هەرچەندە دوورە بەڵام نیشان دەپێکێ. لەپڕ هات، کاروانی ترومبیلان هات، کۆمەڵێک ترومبێل لە چاوی هاوارەوە وەک یەکن یەک ڕەنگ و یەک جۆر، هەموو جامیان داخراوە، ئەوە خراپ بوو. ئیدی بە تەمای خودا، جامی یەکێ لە ترومبێلە زەبەلاحەکانی کردە نیشانە، بەردێکی تیژی هاویشتێ و ئەگەر گوێی نەزرینگابێتەوە، دەنگێکی گەورەی لێهات. خێرا هاتە خوارێ و لە ڕێیێ بوێر دەیگوت:

ئەوڕۆ سەرۆک لە هەوڵێکی کوشتن ڕزگاری بوو.

هاوار لە بیریەتی خوشک و برا کە جانتایان بە شانەوە بوو، لە ڕێی قوتابخانە زۆر لە منداڵانی داربی دەچوون.

لە بیریەتی دیداری برادەری باسی پەیوەندی خۆی و کچێک دەکات، کە چۆن ناوە ناوە ژوان دەبەستن، دەچنە باوەشی یەکتر و راموسان دەکەن. ئەوە هاوار هاندەدات کە پەیوەندی لەگەڵ کچێک ببەستێ، رەنگبێ پتر لە رقی گوڵناریش بووبێ. کچێ ماڵیان لەوسەری کۆڵانە لەمێژ نیە هاتوون، لە تەمەنی خۆی شتێک گچکەترە، زۆر شیرین و نازدارە، روو روون دەڵێی لە بەیانەوە هاتووە، ناویشی بەیانە. کاتێ دەچێت بۆ قوتابخانە لە دواوە کەمێک لە گوڵنار دەکات، هاوار دوور نیە بۆی لێدرابێت. زۆر کەرەت لە کاتی هاتنەوە لە قوتابخانە هاوار لە دەو کەندێ لە بن دیواری ماڵی شەلە، رادەوەستێ و لێیدەروانێ، بەڵام بەیان جارێک چیە سەر بڵند ناکات، لە ژێرەوەش تیچاوێکی ناداتێ. هاوار بڕیاردەدات بە تەماشاکردن رانەوەستێ، هەڵێک کە نزیکدەبێتەوە، ئازایەتی دەیگرێ و ماچێکی توندی بە دەنگی بۆ دەهاوێت، کەچی بەیان بێ ئەوەی خۆی تێکبدات، تفێکی گەورەی باگۆی دەداتەوە. هاوار تفێک لە خۆی دەکات و هەرگیز لە سەر رێ راناوەستێ، لە دوورەوە بیبینێ خۆی دەشارێتەوە، بە خۆی دەڵێت:

ئەستەمە کچێک هەبێ منی بوێ.

لە بیری ناچێتەوە، شەلەی شامینۆکفرۆش دەمانچەی لە نێکێیە و هەرەشە لە بابی دەکات:

دیارە تۆ لە (ئەمن) ناترسیت!

باب گۆچانەکەی هەڵدەشەقێنێ دەڵێ:

لە خوێڕی وەک تۆ دەترسم!

ئیدی لە گەڕەک باردەکەن، بەڵام نایەتەوە بیری بۆچی خەناوکەکەی لە بن عەرد دەرنەهێنا، دڵی نەهات، یان لە بیریچوو!

ئەوەی مەگەر مەرگ لە چاوی بسڕێتەوە، شەوی دیار پەنجەرەکەیە، هاوار لە بوێری بیست، شیرین بەهارە، جاروبار دەچێتە ماڵەکەی پشت ماڵی بوێر و گۆرانی دەڵێت، هاوار لێی دەبێتە مەراق. درەنگانی ئێوارەیەک لەو دوورەوە بوێر بە هەڵەداوان دێت، پێکەوە دەچنە ماڵی بوێر کە تەنها دایکی لە ماڵە، لە حەوشەی پشتەوە گوێیان لە دەنگی شیرین بەهارەیە، بوێر دەڵێ:

لە شیرین بەهارە بۆتەوە.

هاوار دەڵێ:

ئەوها نابێت، جێگەیەک ببینینەوە لێمان دیاربێت.

دارتووێک لە حەوشەی گۆرانیەکانە، لق و پۆی درێژبۆتەوە بۆ ماڵی پشت و تەنیشتیش، بوێر تێدەگات هاوار دەیەوێت بگاتە ناو دارتووەکە دەڵێت:

لە ناو ئەو درەختەوە پەنجەرەکە دیارە.

دەتگوت پشیلەن سەر دیوار و دیوار رۆشتن، سمۆرە ئاسا سەر لق و سەر لق رۆیشتن، گەیشتن، لە ناو دارتووەکە، وەرزی توو بوو، دەتگوت دوو کۆترن هەڵنیشتوون. لەوێوە لە کەلێنی گەڵاکانەوە پەنجەرە بە دەرکەوت، لە پەنجەرەوە، شیرین بەهارە بەرانبەریان دانیشتووە، جەمەدانیەکەی لە سەر چۆکیەتی، کڵاوەکەی لە سەرە، بالیفێکی گەورە لە پشتیەوە نیوەی دیارە، لە بن چاویلکەوە چاوە گەشەکانی دەبینری. چوار پێنج پیاو بە دەوری خوانێکەوە بازنەیان بەستووە، پر سەری شووشە، پەرداخ، میوە، ماست، تەپلەی جگەرەیە. بوێر بە گوێیدا دەچرپێنێ:

ئەوانە عارەق دەخۆنەوە.

عارەقخۆر لە گوێی هاوار خۆش نەهات، کەس بە باشە باسی عەرەقخۆری نەدەکرد، خۆ هەردوو قورئانخوێنکەش عەرەقخۆریان بە دۆزەخی ناو دەبرد. گوێی لێیە شیرین بەهارە گۆرانی دەچرێت، چرینێک کەس وای نەچریوە. دەبینێ ناوە ناوەش فرێک لە پەرداخەکەی پێشی دەدات کە لەو دیوی پەنجەرەوە رەنگی دەڵێی شیرە، دەبینێ، پەرداخەکەی هەڵدەگرێ و بە کەرەتێ نیوەی پتر فرێدەکات، بە توندی دایدەنێتەوە، کووزە لیمۆیەک هەڵدەگرێ و ناسک ناسک دەیمژێ. لەو ساتە کورەکانی ناو دارتوو توو دەخەنە زاریانەوە. دەچریکێنێ:

ساقیا وا بادەوە وا بادەوە

روو لە لای من کە بە جامێ بادەوە

لەو ساتە، پیاوەکان چەپلەیان لێدا و یەکیان هەستایەوە و ماچێکی کڵاوەکەی شیرن بەهارەی کرد. هاوار و بوێر لە بیریان چوو، بۆ دزی هاتوون، ئەوانیش چەپڵەیان لێدا و فیکەیان کێشا، باش بوو لە ژووری گۆرانیەوە کەس گوێی لێیان نەبوو، هاوار حەزیدەکرد ئەویش لە سەر خوانەکە بێت، بچێت ماچێکی شیرین بەهارە بکات، ئەوەی بۆ هەمیشە سەر دارتووەکەی گۆرانی _دواتر ناوی لەو دارە نا، دارتووی گۆرانی_ و ژووری گۆرانی لە یادەوەریی هاوار بە زیندووی هێشتۆتەوە، ئەو دێرەیە کە ئەو شەوە شیرین بەهارە بە شێوەیەکی گۆت، ناگوترێتەوە، کەس نایڵێتەوە. پەرداخەکە لە دەستی چەپی بڵند راگرتبوو، وەک بڵێی نیشانی کورەکانی سەر دارتووەکەی دەدا، دەستی راستی بە ئاسمانی سەر خوانەکەدا دەلەراندەوە:

ترازا بەندی سوخمەی ئاڵی گوڵداری بە ئاهی من

کەچی دەستی لە سەر دانا، لە سەیری باخی بەی کردین

هاوار لەگەڵ ئەوە هێندەی نەمابوو، لە سەر دارتووەکە خۆ فڕێداتە خوارێ، رەنگبێ بوێر هەستی بەوە کردبێ، چوونکێ توند دەستی گرت و گوتی:

با بڕۆین درەنگە.

گوێی پێنەدا، هاوار گەیشتەوە ماڵی گوڵنار ئەو ساتەی برینەکەی بۆ تیمار دەکرد و بە ئاهی ئەو دوگمەی کراسەکەی کرایەوە، کەچی دایخستەوە و نەیهێشت بەهێییەکانی ببینێ.

ئای! ئەوە چی دەبینێت! گوڵنار چی دەکات لەو ژوورە، ژنی کام لەم پیاوانەیە؟ هەوە، چاو هەڵەناکات، ئەوە گوڵنارە، هاوار لە ناسینەوەی گوڵنار هەڵەناکات، ئەگەر لە سەری ئەو سەری درێژترین جادە بیبینێ دەیناسێتەوە. هەر جلکێک بپۆشێت، دەیناسێتەوە، قژی بە هەر شێوەیەک ببەستێت دەیناسێتەوە، کەس وەک هاوار گوڵنار ناناسێتەوە. هەوە خۆ هەمان ئەو کراسەی لەبەرە کە شەوەکە برینەکەی بۆ تیمارکرد و ترازا دوگمە. ئەها لە تەنیشت شیرین بەهارە راوەستاوە، کەمێک داچەمی و شتێکی دایە دەستی. ئەها سینەی دەڵێی سینیی مێوەیە، هەوە گوڵنارە. ئەها لە پشت سەری شیرین بەهارە پشتی بە دیوارەکە دا، راوەستاوە، دەمێکە بێ جوولەیە، دەڵێی بۆتە وێنە و بە دیوارەکەوە هەڵواسراوە، وێنەیەکی گەورە یەک بە دیوارەکە، سەیرە بۆ ناجوولێت! ئەوە چی روودەدات، گوڵنار بووە وێنە بە دیوارەوە، لەوانەیە هەر لە سەرەتاوە وێنەیەک بووبێت بە دیوارەوە، بەڵام لە چاوی هاوارەوە گیانی تێکەڕابێت، ئا خۆی نیە، وێنەکەیەتی، باشە وێنەی گوڵنار چی دەکات لەو ژوورە؟ وێنەیەکی وا

گەورەش، ئەو وێـــنەیە لەو ســـاتە گیـــراوە کە بـــرینەکەی هـاواری تیمـاردەکرد، ئەهـا دەسـتێکی لە سـەر بەرکۆژەی تـرازاوە، دەسـتەکەیدی تـا سـەر مەچەکـی دیـارە، دەبێـت پەنجەکـانی لە سـەر بـرینەکە بێـت. ئەو کەسـەی وێـنەکەی گرتـــووە، لە دواوە راوەســـتاوە و حەزینەکـــردووە هـــاوار دەربچێـت. هــاوار دەبێــت بە دەنــگ ( گوڵنــار، گوڵنــار) ی کردبێ، چوونکێ بوێر بە هێواشی گوتی:

گوڵنار کێیە؟ تۆ چیتە!

بەرگەی دەنــگ و رەنگــی ژووری گــۆرانیی نەگــرت، پێدەچێ بووڕابێتەوە، لە زرمەی خۆی بە ئاگاهاتەوە. لە بن پەنــجەرەکە دەســتی لە نــاو دەســتی پیــاوێکە، پیــاوێکیش بەرانبەری راوەستاوە، بوێریش لە تەنیشتی. لە پەنـجەرەوە تەماشای ژووریی کرد، لەو سـاتە دیتی گوڵنـاری وێنە، لە شێوەی تەنکە تەمێ خزی و لە پەنجەرەکەوە هاتە دەرێ و بە نـاو گەڵای دارتـووەکەدا هەڵکشـا. هـاوار واقـی وڕمـا، درەنگ هاتەوە سـەرەخۆ و تێگەیشـت کەوتوونەتە دەسـتی عەرەقخۆرەکان، ترسا، ئاخر زۆری بیستبوو عەرەقخۆر کە سـەرخۆش دەبێـت، دەسـت دەوەشـێنێ و چ ئـیش خـراپە دەیکات و لە هیچ ناپرینگێتەوە، پیاوەکە دەڵێ:

چیتان دەکرد لەو سەر دارە؟ بۆ توو دزین هاتبوون؟

هاوار قسەی بۆ نەهات، بوێر دەڵێ:

نا، بۆ گۆرانی.

پیاوەکە پێدەکەنێ:

گۆرانی شیرن بەهارە دەدزن! مەیدزن، خۆی دەتانداتێ، دە وەرن بچین دانیشین.

هاوار لە پەنجەرەوە چاوێک بە ژوورەکەدا دەخشێنێ، گوڵنار لەوێ نەمابوو، دەبینێ شیرین بەهارە لە گۆرانی گوتن نەپساوەتەوە:

ساقی دەروێشە جامێ شەراو با بێ

پڕکە پیاڵە ماچ لە گۆشەی چاو بێ

ئەو کچە جوانە بۆ لێمان تۆراو بێ...

هاوار گومانی هەیە، لەگینە پیاوە عەرەقخۆرەکە نیازی خراپ بێ، لێ حەزیکرد بە قسەی بکات، لەو ساتە بوێر دەڵێ:

نا، دەڕۆینەوە.

سەرخۆشەکە دەڵێ:

دە راوەستن سەر و بیرەتان بۆ بهێنم.

پیاوەکە چووە ژوورێ، ئەویدی هەر لەوێ راوەستاوە و خەریکە جۆرێک سەمادەکات. هاوار و بوێر لە سەر

ئەوەن خـۆ هەڵـدەنە سـەر دیـوارەکە و راکەن، پیـاوەکە هـاتەوە، دوو بیـرە و دوو کیسـە فسـتقی لە دەسـتە، دەیانداتێ، لە دەرگاوە بەڕێیاندەکات و دەڵێ:

ئەو جارە ئەگەر بۆ گۆرانی هاتن لە دەرگاوە وەرن، خۆ کۆتر نین لە سەر دارەکە بنیشنەوە.

درەنگە، بیرەیان خستە گیرفانی شەرواڵەوە و چوونەوە. لە چاوەکەی بوێر دانیشتن، دایک هەندێ مێوەی بۆ هێنان و چوو خەوت. هاوار هێشتا گۆرانییەکە بەرینەداوە، چاوی هەر لە سەر سوخمەی ئاڵە، لێوی کردۆتەوە بۆ ماچێک لە گۆشەی چاو. بیرەیەک هەڵدەپچڕن، ناوێرن تامی بکەن، بۆ لای لێویان دەبەن و دایدەنێنەوە. هاوار کە بە گۆرانییەکان مەستبووە، بوێری دەیگرێ، بیرەکە دەخاتە سەر لێویەوە و دوو سێ قومی لێدەدات، تاڵە، ویستی بیهێنێتەوە، خۆی گرت و نەیهێناوە. دوو سێ دنکە فستقی خستە دەمیەوە و ئاسایی بۆوە. بوێریش چاوی لێدەکات، بە هەردووکیان بیرەیەک تەواودەکەن، بوێر دەڵێتە هاوار:

ئەرێ گوڵنار کێیە؟

هاوار ئاهێک هەڵدەکێشێ:

تەمێکە، تەم.

ڕەنگە پرسیاری لە تەمەکە کردبێت، بەڵام هاوار هەستا و نەیبیست، لە ڕێیی هەستیدەکرد سەرخۆشە، بە بێ دەنگی چووە سەر جێگاکەی خۆی.

هاوار دواتر لە ناو برادەران دەیگوت:

شەوێک شیرن بەهارە بۆ من گۆرانیی گوت.

هاوار لەو شەوەشەوە بڕیاریدا بادە بخواتەوە، ئەگەر ژەهری ماریش بێت دەیخواتەوە، بە کووزە لێمۆوە دەیخواتەوە.

هاوار ئەو کۆتایی ساڵەشی لەبیرە کە کارتی کەوتوویی وەرگرتەوە، بەڵام هێندە پێی تێکنەچوو، چوونکێ گوڵنار پێشەوەی دنیا قووتیبدات، ساڵێکی لەدەستچووبوو، لە بیریەتی بە کەوتووییش بابی دیاریی بۆ کڕی.

ئەو چەند ساڵە لە قوتابخانە تەنها مامۆستای گێڕانەوەی لە یادەوەریدا زیندووە و هەمیشە قسەدەکات، ئەو مامۆستایە چیرۆک و سەرهاتی هێند جوان دەگێڕایەوە، بۆیە بە مامۆستای گێڕانەوە ناوی رۆیشت. دوورنیە لە ڕێی دیدارەوە مامۆستای گێڕانەوە شتێکی لە سەرهاتی هاوار بیستبێ، بۆیە زۆر گرنگیی پێدەدات، لە پشووەکان گازیدەکات و لە گۆڕەپانەکە قسەی بۆ دەکات. مامۆستای گێڕانەوە هانیدەدات بۆ خوێندنەوەی چیرۆک، هاوار دەخوێنێتەوە. مامۆستا هانیدەدات بۆ نووسین،

نووســـینەوەی رۆژانەی خـــۆی، هـــاوار چەنـــد لاپەڕەیەک دەنووســـێتەوە، پیشـــانی مامۆســـتای گێـــڕانەوەی دەدات، مامۆستا بە دڵی دەبێت و لە دڵەوە دەستخۆشی لێدەکات، تێبینیەکی دەداتێ:

تـۆ زۆر وشـــەی (مـن)ت بەکارهێنـاوە، دەکرێـت کەمـی بکەیـتەوە، دەکرێـت هەر نەیهێڵـی و لە جیـاتی مـن، (ئەو) دابنێ، یان ناوێک باناوەکەش ناوی خۆت بێت دابنێ، رەنگە ســـەرهاتەکە خۆشـــتر بێـت، ئاگـاداربە، هەر شـتێک زۆر بیڵێیتەوە لێی بێزار دەبیت.

هـاوار دواتر بە قسـەی مامۆسـتای گێڕانەوە دەکات، لە نووسینەوەی بەشێک لە سەرهاتی خۆی هەموو (من)ەکان فڕێدەدات و لە شوێنی (هـاوار) و (کوڕی داربـی) دادەنێت، بەڵام لە درێـــژەی ســـــەرهات لەو جێـــیەوە کە هەواڵـــی گەشـــمردەبوونی مامۆســـتاکەی دەبیســـتێت، بە خـــۆی ناوەستێ، هەناسەی سوار دەبێت و دەبنەوە من.

ئیـدی لێـرەوە هـاوار مـنم، کـوڕی داربـی مـنم هەر لێرەوەش هەواڵ هات ماڵی شەلەی شامینۆکفرۆش باریان کـــردووە، گەڕایـــنەوە مـــاڵی خۆمـــان و بە داربیـــیەکە شـادبوومەوە. سـەرەتا چ خۆشـبوو، دەتگـوت بە گوڵنـار گەیشـتووم، بەڵام بەرە بەرە دووری گوڵنـار، یـادی گوڵنـار دەبوونە پۆلووی ئاگر و چزەیان لە دڵمەوە دەهێنا.

## ٢

لەو سەری کۆڵانەی دەگەیشتەوە سەر دەرگای سەرەوەی مزگەفتی حاجی لەقلەقەکە، راوەستاوم، سەرم هەڵبڕیوە و چاوم لە سەر هێلانەی حاجی لەقلەقەکەیە کە بە ئاسمانەوە راوەستاوە. باش نایەتەوە یادم لە سەر هێلانەکەی بوو یان نا. خەیاڵ بردمیەوە بۆ ئەو رۆژەی کە لەگەڵ گوڵنار تەماشاماندەکرد، پیری گەڕیدەش هەڵێک لە وەڵامی پرسیاری من:

حاجی لەقلەق بۆچی حاجییە؟

پیری گەڕیدە بە پێکەنینەوە:

ساڵی جارێ دەچێتە حەجێ.

پیری گەڕیدە لە بارەی حاجی لەقلەقەوە قسەی بۆ خاڵە مۆسکۆیی دەکرد:

ئەو حاجی لەقلەقە ئەو سەر و ئەم سەری دنیا دەکات، لەو لایەوە دەگاتە وڵاتی حەجێ، لەو لایەشەوە دەگاتە رووسیا.

خاڵە مۆسکۆیی بە پێکەنینەوە گوتی:

چەند خۆشبوو منیش وەک حاجی لەقلەق بام، چەندان جار مۆسکۆم دەدیت.

لەو قسەیەی خاڵەوە من و گوڵنار پێکەوە دەمانگوت:

خودا بمانکە حاجی لەقلەق، با بفڕین و مۆسکۆ ببینین.

ئاخر خاڵە مۆسکۆییم، بە شێوەیەک باسی مۆسکۆی دەکرد، قورئانخوێنەکان وا باسی بەهەشتیان نەدەکرد.

ئەگەر دەنگە تیژەکە نەبا، لەبیرم نەمابوو بۆچی چووبوومە ئەو سەرە کۆڵانە. نێوان من و دەنگەکە هەر شەش حەفت شەقاوی ئەمنە لۆقنەکە دەبوو. پشتی لە منە، وێنەیەکی گەورەی سەرۆکی دڕاند و بە دەنگی بڵند دووبارەی کردەوە:

بڕووخێ دیکتاتۆر.

لە سەری کۆڵانەوە سەد دەنگ بڕووخێی کوڕەکەیان گۆتەوە، ئەو کوڕەی دەنگی بە من نائاشنا نەبوو، بەڵام نەمناسیەوە. ئەو کوڕەی لە دواوە لە کەسێک دەچوو، نەهاتەوە بیرم کێیە. راکە راک و تەقوتۆقە، کوڕە کەوت، دەماودەم کەوت. خوێنم دیت، ئەو خوێنەم پێشتر دیتووە، هەستێکی وام بۆ درووست بوو کە خوێنەکە ئاشنایە. قسەیەکی پیری گەڕیدەم بیردێتەوە:

ئەگەر کەسێک خوێنناس بێت، خوێن دەناسێتەوە، خوێنەکان هەموو وەک یەک نین.

هی ئەوە نەبوو بچمە سەری، تفەنگەکان روویان لەوێ بوو. خوێن منی کەمێ لە خەیاڵی گوڵنار دوورخستەوە، تا ئەو ساتە لە ناو خۆپیشاندانەکە سەرە داوی خەیاڵێک دەگەیشتەوە گوڵنار.

رۆژی دواتر خۆپیشاندان لە دەرگای قوتابخانەوە سەریکرد. سەری گەیشتە سەری ئەو جادەیەی ئەگەر پێچبکەیتەوە قوتابخانەکەی گوڵنار دیارە. لەوێ لە هەموو لایەکەوە چەکدار پەلاماریاندا، بووە تەق و تۆق و زرموهۆڕ، بەرد هاویشتن. من سێ چوار دارلاستیقم هاویشت، هیچیان بەلاش نەچوون. پەرتەمان لێکرد و هەریەکە بە لایەکدا هەڵات. ئەو لە دەرگایەک چووە ژوورەوە، ئەویدی بە سەر دیوارێکدا ئاو دیو بوو. یووسفم دی لەو سەرەوە سوورِایەوە. من خۆم بە حەوشەیەکدا کرد، ژنێک کە ئەگەر لەبەر جلکەکەی نەبا دەمگوت دایکمە، چەند لە دایکم دەچوو، تاکە ژنێکە لە تەمەنم دیتبێتم کتومت لە دایکم بچێت، بابم بیبینێ جیاوازیان پێناکات، جلکێکی هێند رەشی پۆشیبوو ترساندمی. ژنە بە چاو و دەست سەر دار تووە پرەکەی پیشاندام، کەوتبووە قوژبنی حەوشەکەوە. نەختێ دوودڵ بووم، کاتی دوودڵی نیە، بە قسەمکرد. لە هەڵگەڕاندا یارمەتی دام، پێی بڵند کردم.

باوەشم بە لقێکی ئەستووردا کرد و خۆم کردە بەشێک لە درەخت.

دوو سێ چەکدار بە ژوور کەوتن. دڵم توند لێدەدات، دەترسم ترپەی دڵ جوولە بخاتە لقەکەوە و ئاشکرابم. گوێم لێیە بە عەرەبی جوێن دەدەن، سەر بان و بن بانیان کرد. لە کەلێنی پەلکانەوە دیتم چەکدارێکیان پاڵێکی توندی بە ژنەکەوە نا و کەوت. دەمویست دەست بۆ دارلاستیق ببەم، باشبوو پەژیوانبوومەوە، رۆیشتن. دوای کەمێ ژنەکە بە راستی هەر دەڵێی دایکمە، سەرێکی بە دەرێ داگرت، هاتە بن دارتووەکە و بە دەنگێکی دایکانە:

کوڕم، تا من نەڵێم هەر لەوێ بمێنەوە، هێشتا لە کۆڵانن.

لەو دارتووەوە، گەیشتمەوە ئەو دارتووەی کە دەیڕوانیە سەر گۆرانی، ئەو گۆرانییەی بردمیەوە دیار سینەی ترازاوی گوڵنار. بوێرم بیرکەوتەوە، دەمێک بوو نەمدیتبوو. ئەو دارتووە پڕەی لە خەیاڵێکی پڕ بەریدابنەوە ناو دەستی سەرخۆشان، بەڵام ئێستا لەو دارتووەوە نابێت خۆم بدەمە دەست خەیاڵ، بەربمەوە دەکەومە ناو دەوی پیاوکوژان. چاوەڕێ دەکەم ژنە رەشپۆشەکە هەواڵی خۆش بێنێت، هەواڵی چۆلبوونی کۆڵان لە چەکداران، دەبێت ئەو ژنە کێی مردبێت وا رەشپۆشە؟

لە دەرگا درا، لێمەوە دیار نیە کێیە، گەورەیە، منداڵە، چەکدارە، بێ چەکە، ئۆخەیش:

پله پەرژین، داکم گۆتی دوو نانمان بداتێ.

ژنە رەشپۆشەکە کە دیارە ناوی پەرژینە:

باشە، وەرە، چەکدارەکان لە کۆلان ماون؟

منداڵەکە:

رۆیشتن.

ئۆخەیش، رۆیشتن و ئەوجارەش دەرباز بووم. داوای لێبووردنم لە ژنەکە کرد کە بە هۆی منەوە پاڵێکی خوارد، بەلام ژنە گوتی:

نا، بە هۆی جلکەکەمەوە بوو، ئەمنەکە پرسی بۆ رەشپۆشی، منیش گوتم کێ هەیە رەشپۆش نەبێ.

لێم پرسی:

دەتوانم بزانم بۆ رەشپۆشی؟

گریاو گوتی:

لە کۆستێک پترە، دواییان ئەو کورەی دوێنێ لە بازاڕ خوێنی رژا، کورم نەبوو، بەلام وەک کورەکەم خۆشمدەویست.

پرسیم:

ناوی چی بوو؟

ئاهێکی هەڵکێشا:

بوێر...

بوێر؟ ئۆی، گوتم ئەو دەنگە ئاشنایە، ئەو سیمایە ئاشنایە، گریام، بە کوڵ گریام، ژنەکە نەبا هەر دەگریام.

لە ڕێیێ گوڵێم دیت، زانیم لە خۆپیشاندان دێتەوە. دوێنێش لە لای مزگەفتی حاجی لەقلەقەکە دوور بە دووری دیتم. ئەو کچە لە هیچ ناگەڕێتەوە، خۆپیشاندان نیە بەشداری تێدا نەکات، نازانم چۆن ناگیرێت، لێم نزیککەوتەوە:

دەست خۆش، نیشانەت ڕاستە، بەڵام ئاگات لە خۆت بێت، نەگیرێی.

بە شەرمەوە گوتم:

تۆش لەوێ بوویت؟

بزەیەکی کرد و گوتی:

شتێکت بۆ بگێڕمەوە بەس بە کەس نەڵێی، لەو ڕۆژانە چوومە سەرێ، وەریاننەگرتم، گوتیان:

باش نیە کچێک بێ مێرد یان برایەک، کەسێک ببێتە پێشمەرگە.

تێر قسەم کردن و هاتمەوە.

گــوڵێم پتــر خۆشویســـت، دەمگــوت چ دەبــوو ئەگەر گوڵناریش وەک گوڵێ بوێر با، چ دەبوو ئەگەر من کچێکی بوێرم خۆشویستبا؟ ئای گوڵنار چیت بە سەر من هێنا، بە چـــاو ســـوورکردنەوەیەک دوو مێـــردت کـــرد. نرخـــی پووشکەیەکت بۆ من دانەنا، پووشکەیەک لەو پووشکانەی لە پووشکاخەزەکەم دەخست و پێکەوە دەمانناردە ئاسمان. ئای گوڵنار، خۆزی بە گوڵێ دەچوویت، نا، هەڵە لە خۆمە لە گوڵنـار نیـە. قسـەی دیـدار بـوو، دەبـوو مـن خـۆم بـۆی ئاشکرا کردبا، دەبوو پێیبڵێم تۆم خۆش دەوێ پڕ بە دنیا، هەڵەی من بوو، رستەیەکی ناسکم بۆی نەگوت، گلەییم لێی نیە، خۆم بە خۆمم کرد.

خوێنەکەی بوێر لە گوڵناری پساندمەوە، ئای هـاورێی پۆل، هـاورێی نـاو دارتـووی گۆرانی، لە پێش چاوی خـۆم کەوتی، فوارەی خوێنی سەر شانتم دیت و نەمناسیتەوە، چ خوێنێـک بـوو ئەو خــوێنە، دەبــوو بیناســمەوە، خــوێنی برادەری منداڵیم بناسمەوە، ئەو جارەی مامۆستا مستێکی لە ناو زاری دا و خوێن فیچقەی کرد، هەر ئەو خوێنە بـوو کە بە دیــار مزگەفتــی حــاجی لەقــلەقەکەوە رژا، مــن لە خوێنەکەیەوە هەستمکرد ئاشنایە.

بابم و داکم زانیان چوومەتە ناو خۆپیشاندانەوە، دایکم گریا، خوشک و برا و گیڤارا دەوریان دام، بابم دەڵێت:

ئاگاداری خۆت بە، لە بەلاش دەڕۆیت.

پیاوی هەمەدانییە هەکارییەکەش لە ماڵمانە، گوێمان داوەتە رادیۆ، ناوی بوێری خوێندەوە، گریان قورگمی گرت، بە گریانەوە گوتم:

ئەو کورە زۆر برادەرم بوو، لە سەرەتایی لە تەنیشت یەکتر دادەنیشتین.

دایکم لە ئامێزی گرتم، گریان هەموو گریان بە تۆڵەستێن و هەمەدانی و دایک و خوشک و براو گیڤاراوە، هەموو گریان. لە ناو فرمێسکەوە تەماشای دایکم دەکەم، چەند لەو ژنە دەچێت کە منی لە ناو دارتووەکە شاردەوە و هەواڵی مەرگی هاورێکەمی دامێ. خودایە ئەو دوو ژنە لە سیما، لە گریان، لە گێڕانەوە بۆچی هێندە بە یەک دەچن، بۆچی هێندە لێک نزیکن؟ تەنها لە جلک لێکدی دوورن، خودایە با هەر لێکدی دوور بن و دایکم بە رەشپۆشی نەبینم، بە دیتنی ژنی رەشپۆش دنیا لە پێش چاوم تاریک دادێت و هیچ نابینم. بە دایکم نەڵێم ژنێک هەیە لە تۆ دەچێت، دڵم دەتەقێ، گوتم، بەڵام ئەو لە سەرەتا بە هەندی وەنەگرت و گوتی:

لە دنیایێ زۆر کەس هەیە بە یەکتر دەچن.

گوتم:

بەڵام لە دنیایێ دوو کەسم نەدیتووە هێندە بە یەکتر بچن.

دایکم تەواوێک داما، پرسیاری ژنەکەی کرد، لە کوێت دیت؟ تەمەنی چەندە؟ ناوی چیە؟

سەرهاتی دارتووەکە و ژنە رەشپۆشەکەم بۆی گێرایەوە، لەو ساتەی گوتم ناوی پەرژینە و رەنگە شتێک لە تۆ بە تەمەنتر بێ، راچڵەکی وەک ئەوەی کارەبا گرتبێتی، بەڵام دەیویست خۆی ئاسایی نیشانبدات. هەستمکرد شتێک لە گۆڕێیە، زۆر هەوڵم لەگەڵی دا، خۆی کردە بەرد و هیچم لێی هەڵنەکڕاند. دوای چەند رۆژێک پرسیاری ماڵی پەرژینی کرد، ناونیشانەکەم بۆی هەڵدا، ئیدی بابەتەکەی داخست و چەندی سەری قسەم دەبردەوە سەری، ئەو نەدەهاتەوە سەری، قسەی بە لایەکیدی دەبرد، وازم لێیهێنا، بەڵام زۆر جاریش دوور بە دووری بە دوویدا دەچووم و خۆم لێدەگرت، بزانم رێی ناچێتەوە کۆڵانی ماڵی پەرژین، جارێک لەو جارانە رێی بەوێ کەوت.

لە سەری کۆڵان خۆم خستبووە پەنای درەختێک، دیتم دایکم دەرگاکەی لادا و چووە ژووری، وەک چۆن دەچیە ماڵی خۆت ئەوها. ئەو چوونە ژوورەوە پێناچێت هی جاری یەکەم بێت، رەنگبێ لە دەرگای دابێ، بەڵام دوور بوو، گوێم لە دەنگی دەرگا نەبوو. هەر راوەستام نەهاتە دەرێ، زۆری برد، هەر ژنێک منداڵێک بەوێدا تێدەپەڕین، یان لە دەرگایەکەوە سەریان دەردێنا، هەستمدەکرد بە چاو پێمدەڵێ:

ئەگەر خوێڕیاتی نەبێت بۆ لێرە وەستاوی!

ڕەنگە واش نەبووبێت، من بە هەڵە چاوەکانم خوێندبێتەوە. ڕۆیشتم بە پێش دەرگای ماڵی پەرژین، بە بن سێبەری دارتووەکەدا ڕۆیشتم، دەرگای حەوشە نیوە کراوە بوو، لە حەوشە کەسم نەدیت، ئیدی ڕۆیشتم نەگەڕامەوە. خۆم پێنەگیرا، ڕۆژی دواتر بە شەرمەوە پێیمگوت:

دایە، ماڵی پەرژینت دیتەوە؟

دایکم بە پێکەنینەوە ماڵێک تۆ ناونیشانی هەڵبدەیت، ئاسان دەبیندرێتەوە.

گوتم:

زۆر لە تۆ دەچوو، وایە؟

دایکم:

وایە، بەڵام من لەو دەچم، چوونکی سێ ساڵ لە من گەورەترە، بەڵام چ پرسیاری دیم لێ مەکە، دوایی سەرهاتێکی تاڵت بۆ دەگێڕمەوە.

بە قسەم کرد، دەرگای پرسیارم داخست، بەڵام ڕۆژ دوای ڕۆژ تامەزرۆییم بۆ سەرهاتی تاڵ پتر دەبوو. ئەوەی دایکم ناوی نا سەرهاتی تاڵ، لای من سات دوای سات شیرینتر دەبوو، خوا خوام بوو خولەکێک زووتر بیبستم و

تامی بکەم. دەبێ ئەو پەرژینە کێ بێ، شیرین و پەرژین چی یەکترن؟ دەزانم خوشک نین، دایکم خوشکێکی هەبووە وەک بیستوومە هێشتا دایکم شووی نەکردووە ئەو مردووە، ئەدی؟ دەهاتە سەرم بچمە لای پلکە پەرژین و لێ بپرسم:

ئەرێ تۆ چی شیرینی دایکمی؟

نەدەچووم، بە قسەی دایکم کرد و لەو بارەیەوە پرسیارم نەکرد.

بەهار زۆری رۆیشتبوو، کەمی مابوو، هەر ئەو ماوەیە بوو کە بابم و هەمەدانی پیس تێکگیران، شەڕی شاخیان هێنابووە بن داربی، لێک هەستانە سەر پێ، تۆڵەستێن دەڵێتە هەمەدانی:

تۆ کە ئەوها دەڵێی بۆچی خۆت بە چاوێکەوە ناچیە شەڕیان؟

هەمەدانی دەڵێت:

نا، تۆ بە لاقێکەوە برۆ.

تۆڵەستێن دەڵێت:

شاخ بە چاوێکەوە دەکرێت، بەڵام بە لاقێکەوە ناکرێت.

ئەو قسەیەی بابم منی هێنایە گریان، ویستم پەلاماری هەمەدانی بدەم، بابم نەیهێشت و گوتی:

ئەوە شەڕی خِۆمانە، تۆ خۆت تێوەمەگلێنە.

ئا لەو سەروەختە هەواڵی مەرگی خاڵە مۆسکۆییم هات، ئەویش لەگەڵ مەرگە قەندیلییەکان بوو، بەڵام هەواڵەکە درەنگتر گەیشت. ئەو ڕۆژە بوو من لێی دەترسام، باشبوو تاقیکردنەوەم کردبوو، دەنا دەمامەوە و نەدەگەیشتمە کۆلیژ. دایکم گریا هێند گریا بە گەڕەکێک ژن هێندە نەگریاون، نەدەبوو لە کۆڵانیش بگری، بابم دەیگوت:

هێواش بگری، هێواش بگری، ئەمن پێبزانن دەمانگرن.

دایکم دەگریا و جوێنی دەدا، جوێنی بە هەمەدانییەکەش دەدا. جلکە ڕەشەکەی پۆشی، ئەو جلکەی پەرژین پۆشیبووی، ئێستا دایکم و پەرژین ژنێکن، کەس لێکیان ناکاتەوە.

ئەوەتا لە تەنیشت یەک دانیشتوون، پرچیان کردۆتەوە، سەر رووومەتەکانیان خوێنیان لێدەچۆڕێ، هەردووکیان (براڕۆ)یانە. باشە پەرژین بۆچی براڕۆ دەکات، نا، هەر ئەو نیە، دوو سێ ژنی دیش براڕۆیانە، ئەوی دی بابەڕۆیەتی، ئەوی دی ڕۆڵەڕۆیەتی، لە پرسە هەر کەسە بۆ کەسی خۆی دەگری. ئەو دوو ژنە کتومت یەکن، وەک یەک شین دەکەن، ئەو دوو ژنە ژنێکن، کامیان دایکمە، نایناسمەوە،

من نایناسمەوە، دەبێت بابم بێ و بۆم بناسێتەوە، بە بابم دەڵێم:

بابە، ئەو ژنە کێیە وەک دایکم دەگری؟

نەمزانی لەگەڵ کامیانمە، بابم دەڵێت:

دایکت پێی نەناساندوویت؟

گوتم:

نا

بابم لە سەری نەڕۆیشت و قسەی بە لایەکی دیدا برد و نەهاتەوە سەر پەرژین، تێنەگەیشتم، ئێستاش هی ئەوە نیە، لە دایکم بپرسم، لە پلە پەرژین بپرسم.

شەویک دایکم منی هەڵپێچا کە بچینە ماڵی پەرژین، هەر کاتێک دڵی زۆر توند با، دەبوو لە ماڵ دەربچێت. پێمخۆش بوو، هێشتا لە ماڵ دەرنەچووبووین، گوتم:

ئەوشەو هەر پرسیارێک بکەم، وەڵامم دەدەیتەوە؟

گوتی:

بپرسە.

لە ڕێیێ، مەرجی نەگێڕانەوەی بۆ کەس بە سەرم سەپاند و ئەوهای گێڕایەوە:

پەرژین سێ ساڵ لە من گەورەترە، هێشتا شووم نەکردبوو، دوو سێ جار کوڕێک هاتە داخوازیی پەرژین، بابم چووە سەر کەلی شەیتان و نەیدایێ. پەرژین لەگەڵ کوڕە سەری خۆیان هەڵگرت، ئامۆزاکانم هاتن شیر و تیریان دەسوو، بابم تەڵاقی خوارد کە پەرژین بکوژێت، بە خاڵتی گوت:

کوڕم، هانێ دەمانچەم بۆ کڕیویت، نەیکوژیت، کوڕی من نیت.

خاڵت بە ئامۆزاکانی گوت:

ئێوە بڕۆنەوە ماڵێ، با هەر من دەستم سوور بێت.

خاڵت دەمانچەی لە بەر پشتێن ناو دەرچوو. من و دایکم لە سەر ئاو و ئاگرین، بابیشم دەرگای لە سەر خۆی داخستووە، نایەوێت کەس ببینێ، ناوە ناوە دیوار بە بەر مست و پێلەقە دەدات. دوو حەفتەیەکی پێچوو، خاڵت پەیدابۆوە، بابم کە زانی پەرژین لە سەر سنوور کوژراوە و لاشەکەشی لە چۆلەوانی خراوەتە بن خۆڵ، ئاسایی بۆوە، بەڵام من ودایکم کەوتین، رقی دنیامان لە خاڵت هەستا، نانمان نەدەدایێ، جلکمان نەدەشووشت، ئەویش هیچ قسەی نەدەکرد. چەند حەفتەیەک بە سەر کوژرانی پەرژین تێنەپەڕی، بابم ترومبێل لێیدا و مرد، دایکم بۆی گریا، بەڵام من تنۆکە فرمێسکێکم بۆ هەڵنەوەراند. دوای هەڵگیرانی پرسە، خاڵت گوتی:

شتێکتان پێدەڵێم، بەڵام هەر کەسێک لە زاری ئێوەوە بیبیستێ، ئێوە نا، خۆم دەکوژم.

بەنابەدڵی گفتمان دا کە نهێنیەکە دەپارێزین.

خاڵت گوتی:

پەرژین ماوە و نەکوژراوە.

من لەرزیم، دایکم لە هۆش خۆی چوو، ئاومان پێداکرد و هاتەوە هۆش. خاڵت پەرژین و کورەکەی دیتبۆوە، پێیگوتبوون:

دوور بڕۆن، چەندی دەکرێ دوور بڕۆن، لە زێی گەورە بپەڕنەوە و برۆنە ئەوپەری سنوور، ئیدی ئێوە مردوون، دەبێت وا بکەن، دەنا بابیشم نەتانکوژێت، ئامۆزاکانم راناوەستن، خواخوای ڕووداوێکی ئەوهان، گوێ بەقسەی من نادەن.

من و دایکم سالانی زوو دوو سێ جار پەرژینمان دیت، خاڵیشت دیتبووی.

دایکم دایە پرمەی گریان و گوتی:

کورم ئەگەر خاڵت لە ژیان مابا، ئەو سەرهاتەم نەدەگێڕایەوە.

ئەو شــەوە لە مــاڵی پەرژیــن مــن بەرانــبەر دارتــووی خۆشاردنەوە لە نێوان دوو ژنی رەشپۆش دانیشتبووم، نا لە نێوان دوو کەرتی ژنێک دانیشتبووم، کەرتێک شیرینی دایک، کەرتێکِ پەرژینی پلک. هەر دەبێت بە ناوەکانیان بیانناســـمەوە، هەر دەبـــێ لە بانگکردنـــدا بیانناســـمەوە، کێ(دایە)ی منی وەڵامدایەوە، ئەوە شیرینە. دوو کەرتە ژن دوای ساڵانێک دابڕان، دوای کەرتبوون، بە جلکی رەشەوە لە فرمێسکدا یەکتریان گرتەوە. قسەیان لە برایەک دەکرد کە بە قەد حەفت برا سۆزی برایانەی هەبووە، برایەک لە چیاکـــان لە شـــەڕی براکـــان خـــوێنی رژاوە و رەنـــگە بە گۆڕەکەشی نەکەونەوە. ئەو شەوە من پلکێکم دیتەوە، کچ و کـوڕێکی گەنجـی هەبـوو، لە چـاوی کـچەکەوە گوڵنـارم دیـــت، چەنـــد لە چـــاوی گوڵنـــار دەچـــوو، لە قســـەی کوڕەکەشەوە هاوڕێ کوژراوەکەم ناسیەوە، برادەری بوو، بە دیاریەوە بووە کە گوللەکەی بەرکەوتووە.

زۆری نەبرد هەواڵێک هات کەس باوەڕی نەکرد:

پیاوی مۆسکۆیی نەمردووە، بەڵام بریندارە.

شەوێک پیاوێک هات، دیاربوو لە هێلی پیاوی مۆسکۆیی بووە، هەواڵەکەی بەراست گەڕاند. ئای ئەو پیاوە دەناسم، بە دەنگی ناسیمەوە، ئەوە مامۆستا کۆچەرە، کاتی خۆی ساڵێک وانەی پێمگوتووە، سیمای هەندێک گۆڕاوە، دیارە

ئەو من ناناسێتەوە، گوتم نەوەک پێیخۆش نەبێت، خۆمی پێناناسێنمەوە، مامۆستا کۆچەر گوتی:

لە مردن دەرچووە، بەڵام ئەندامێکی لەدەستداوە.

دایکم خەنی بوو:

بەس نەمردبێ، قەیناکە.

بابم لێی دووبارە دەکردەوە کە چ ئەندامێکی لەدەستداوە، پێ؟ دەست؟ چاو؟ هەرچی دەگوت، مامۆستا کۆچەر بە نەخێر وەڵامی دەدایەوە، لە هەستاندا بابمی تێ کردەوە و سرتەیەکی کرد، دەوری بابمان دا، باب رووی لە دایکمە:

چەندمان پێگوت، ژن بهێنە، با منداڵت ببێت، ئیدی منداڵی نابێت.

دایکم قیژەیەکی لێوە هات، بەڵام یەکسەر هێوربۆوە و گوتی:

قەینا، بەس زیندوو بێت.

هەر لەو شەوەشەوە ناوی لە مامۆستاکەم نا (فریشتەی شەوەکە)، شیرین رەشی فرێدا، کراسە جوانەکەی لەبەر کردەوە، بەڵام پەرژین هەر بە رەشپۆشی مایەوە، مێردەکەی بەر لە ساڵێک مردبوو، من جیاوازیی

جلکـــم پێخـــۆش بـــوو، چـــوونکی لە دوورەوە لێکـــدیم جیادەکردنەوە.

ئەو رۆژانە هەواڵی ناخۆش لێکیان گرتبۆوە، بە دوای یەکتردا دەهاتن، ناخۆشترینیان مەرگی مامۆستای گێڕانەوە بوو، ئەوەی فێری خوێندنەوە وسەرهات گێڕانەوەی کردم، ئەوەی پێمیدەگوت:

وا مەکە کەسێکت زۆر زۆر خۆشبوێت، دەنا دەکەویتە داوێکەوە دەربازبوونت نیە.

بەڵام کـار لە کـار تـرازا بـوو، مـن کەوتبـوومە داوی گوڵنارەوە. نەمزانیبوو مامۆستا بە چیا کەوتووە، درەنگ هەواڵـی مەرگـی بڵاوبـۆوە. ئەو سـاڵە جەنـگ کۆلانێـک کوژراوی بۆ گەڕەک ناردەوە، سیامەند ئەوەی بە پارەی بنە دارگوێزەکان خانووێک و ترومبێلیان کڕی، بێ سـەر هاتەوە، دایکی بە سێ خاڵەکەی سەر قوڵنجی ناسیەوە. ئەو رۆژانە پڕ مەرگ بـوون، لە هەر سـێ ژن دوو ژن رەشـی پۆشـی، ژن دەتگـوت قەلەرەشـکەن بە رێـی گۆڕسـتانەوە. گەڕەک لە سـنووری خـۆی راوەسـتا و گۆڕسـتان نـاو چێورمەکـانی پڕدەبـۆوە و وەک جـارانی گەڕەک رۆژ بە رۆژ بە هەر چـوار لادا دەکشـا. قورئانخوێنەکـان چەنـدی زۆردەبوون هێشتا پێڕانەدەگەیشتن. حەمەدی قورئانخوێن لە سەر گۆڕێکەوە بۆ سـەر گۆڕێک، بازاڕی گەرمە، بەڵام جەباری قورئانخوێن منەتی بە گۆڕ و مردوو نەماوە، زۆر

جار له رادیۆ و تەلەفزیۆن قسە دەکات، حەمەد جارێک گوتی:

له جەبار نزیک نەبیەوە، بە خودای بە یەک تەلەفۆن دەتوانێت بیست قورئانخوێن بخاتە بەندیخانەوە.

ئەو رۆژانە هێند تووش بوون، زۆر کەسیان تووشی شێتبوون کرد. دیدار لە رۆژی دووەمی پرسەکەی دایکی بە کۆڵان و جادە کەوت. پارچە ئاسنێک لە ئاسمانەوە هات، گوتیان خومەینی هەڵیداوە، کەوتە حەوشەی ماڵی دیدارەوە، دایکی نانی دەکرد، دەستێکی بە سێرەوە بەجێما، پێیەکی لەگەڵ خوانەکە رۆیشت، هەر پارچەیەکیان لە جێیەک هێنایەوە و لە تووورەگەیەکی سپیان کرد. دیدارە شێت یەکەم شێتی گەڕەک بوو، بەڵام هەر چەند حەفتەیەک بە تاقانە شێت مایەوە. کوڕێکی حەسارەکەی خانزدیش لە جەنگەوە بە شێتی هاتەوە. منیش رەنگە لە سەر رۆخی شێتبوون بووبم، هەموو ئەوانە کەمێک لە خەیاڵی گوڵناریان دوور دەخستمەوە، بەڵام هەرگوڵناریش لەوانەی دوور خستمەوە.

❊❊❊

نیو خولەکێ بەر لە هاتنی مامۆستا، بەیاتی باشی کرد، سەرم هەڵبڕی لە چرکەیەک کەمتر لایەکی روویم دیت. من لە ریزەکانی دواوە دانیشتووم، ئەو لە ریزی پێشەوە. ئەو دەنگە دەناسمەوە، دەنگی دایکم نەناسمەوە ئەوە

دەناسمەوە. تۆ بلێی لە دنیایێ دوو دەنگ هەبێ هێندە لێک بچن، بیستن توانای جیاکردنەوەی نەبێت؟ دوو رەنگم دیتووە، وەک دایکم و پلکم، بەڵام دوو دەنگم نەبیستووە.

هەوە دەنگی گوڵنارە، لا روومەتی هەوە، من روومەتی گوڵنار نەناسمەوە! لە کەلێنی قوتابیەکانەوە دەبینم، پرچی بە سەر شانیدا پەخشانە. هەوە، ئەوە پرچی پەرییە، پرچی ئایشەوفاتمەیە! چ بیانوویەک ببینمەوە بگەمە لای تەختەرەشەکە، لای دەرگاکە، تا رووی ببینم. رووی ببینم و نەبینم ئەوە گوڵنارە، دەنگی ئەوە، پرچی هەوە، لە ناو ئاسمانێک پرچ ئاسمانێک پەلکە زێڕینە من هی گوڵنار دەناسمەوە. بە بەژنیش گوڵنارە، چ بەژن هەیە لە بەژنی گوڵنار بچێت!

ئەو وانەیە زۆر دوور و درێژە نابڕێتەوە، لە دەچلە و فرەهات درێژترە. مامۆستا مێژووی نێوان ئەو دوو زنیەی دەگێڕایەوە، منیش لە پرچی ئەو کچەوە، لە بەیانی باشی ئەو کچەوە کە هەر دەبێت گوڵنار بێت، پچڕ پچڕ مێژووی خۆم و گوڵنارم دەگێڕایەوە، وانە درێژ دەبێتەوە، وەک مێژوو درێژە و بێ کۆتایە.

ئۆخەیش پشووە، دەمویست بە سەر مێز و کورسیەکاندا بازبدەم، زوو بگەمە دەرگا، لە سەر دەرگا پرچیم دیت چووە دەرێ، رێ نیە زوو بیگەمێ، پۆل پڕە، چی بەسەرهات! وێدەچێ چووبێتە یانەکە، گەڕام،

نەمدیتەوە، تۆ بڵێی لە گۆڕەپانەکە پیاسە نەکات؟ لەوێ نیە، ئای! گوڵنار لە کوێی! وا چاکە بچمەوە پۆل. لە جێی مامۆستا دانیشتووم، ئێستا دێتە ژوورەوە و دەیبینم، ئای! وانە دەستپێکردەوە، گوڵنار نەهاتەوە، نەمزانی وانە چۆن کۆتایی هات، لە کێ بپرسم ئەو کچەی لە وانەی یەکەم هات و نەهاتەوە، کێ دەیناسی؟ بۆچی نەهاتەوە، لە پۆل کەس برادەرم نیە، جارێ کەس ناناسم، جوانیش نیە، لە کچێکی تازە هاتوو، بزربوو بپرسم. پشووەکانی ئەو رۆژەم لە گەڕان بە دوای گوڵنار بردە سەر. دەمگوت، رەنگە لە بەشێکیتر لە پۆلێکیتر بێت، بە هەڵە هاتبێتە پۆلەکەی ئێمەوە، گەڕام، وانەیەکیش نەچوومە ژوورەوە، گەڕام، هێند گەڕام سەرم سووڕا، لە تەوابوونیش لە پێش دەرگا راوەستام، چاوم بە هەموو لایەکدا دەگێڕا، گوڵنارم، نەدیتەوە.

ئەو شەوە خەو نەچووە چاوم، باشە گوڵنار چۆن گەیشتە کۆلێژ، تۆ بڵێی لە رۆژی بارکردنیانەوە، چووبێتەوە قوتابخانە، هەر دەبێت وا بێت. ئاکام گەیشتمە ئەوەی دیتم خەون بووە، بە دووری مەبینە لە ناو پۆلێ خەوم لێکەوتبێ، ئای لەو خەونە!

سبەی گێژ و وێژ گەیشتمە ناو پۆل، لە جێی مامۆستا روو لە دەرگا دانیشتم، خەو دەمباتەوە، پۆل چەند قوتابییەکی تێدایە، دوو کچ بە سرتە قسە دەکەن، بە ئاستەم گوێم لێیە:

چاو چاو، دەڵێی سەرخۆشە.

ویستم بڵێم تەمەنێکە سەرخۆشم، نەمگوت، چاوم لە دەرگایە، ئێ ئەوە خودایە گوڵنار بێتەوە.

ئای! گوڵنار! بە دەنگێکی وەک دەنگی دوێنێ:

بەیانیتان باش.

لە ریزی پشت پێشەوە دانیشت، نازانم کەوتمە چ بارێکەوە، چاوم لە سەریەتی، بۆچی سەر هەڵنابڕێ! سەری هەڵبڕی، تەماشای کردم و سەری داخستەوە، ئای! دیارە نامناسێتەوە. گوڵنار نەگۆڕاوە، وەک ئەو رۆژەیە کە بۆ دواجار دیتم. با خۆم بچمە لای، شەرممکرد، چووم لە ریزی پشتە وی دانیشتم، لایەکی رووی جوان لە من دیارە، نیوە ئاورێکی دایەوە، هەستدەکات کەوتۆتە ناو نیگامەوە. لێوی سوورسوورکردبوو، دەتگوت کرێمستی خواردووە، هەستدەکەم چاوی پۆلم لە سەرە، بە مامۆستا و قوتابییەوە، چاوم لە سەر گوڵنار هەڵگرت، بەڵام رووی ئەوم بایی هێندە لە چاوم گلدابۆوە کە بە خەیاڵ نیشانی چاوی خۆم بدەمەوە. گوێم لە ناوی گوڵنار بوو، مامۆستا ناوی قوتابیانی دەخوێندەوە، لە خۆوە وا ناڵێم نە خەونە و نە خەیاڵ، راستییە و گوڵنار هاوپۆلمە، پشووە، ئەوجارە وەک جاری پێشوو ناکەم، لە دووی نابمەوە، بزری ناکەم.

لە یانەکە بە تاقی تەنێ لە سەر مێزێکە، چوومە بەرانبەری سلاوم لێکرد، سلاو وەرگرتنەوەکەی، نە هی یار بوو، نە هی نەیار، نەهی ناسیار بوو، نە هی نەناسیار، وەرگرتنەوەیەک تەنها لە هی گوڵناری یانەکە دەچوو. چاوەڕێم فەرمووم لێبکات، نەیکرد، کەمێک راوەستام، رووی وەرگێڕا و چی نەگوت، شکامەوە، شکانەوەیەک کەس وا نەشکاوەتەوە، ویستم بڵێم:

گوڵنار، دەڵێی نامناسیتەوە؟

زمانم بەسترا، چووم لە مێزێکی دوور لەو دانیشتم، تیچاوێکم بە شێوەیەک لە سەریەتی، نەمبینێت. لە وانەی دواتر جێی خۆم گۆڕی، دوورتر کەوتمەوە، پرچی لێمەوە دیار بوو، بەڵام وەها بە شەرمدا نەچوومە چاوم هەڵبێ و تێری تەماشای پرچە ئایشەوفاتمەکەی بکەم. وەها بە شەرمدا چوومە، رۆژانی دواتریش مەگەر دوور بە دووری دەنا رووی تەماشاکردنیم نەبوو.

حەفتە هاتوو چوو، گوڵنار بە شێوەیەکی ئاسایی، وەک کچ و کوڕەکانی دی بەیانی باشی دەکرد، چاکوچۆنی دەکرد، بەڵام من بە شەرمەوە وەڵامیم دەدایەوە. خودایە، گوڵنار بۆ وایە! تۆ بڵێی نەمناسێتەوە، یان منداڵیی لە بیرچووبێتەوە، یان دوای شووکردنی؛ من لە چاویەوە وەک هەر کەسێکی ئاسایی، ئاسایی بم، بۆچی هەواڵێک لە دایک، باوک، گەڕەک ناپرسێ؟ تێناگەم، تۆ بڵێی رووداوێکی

وای بە سەرهاتبێت کە رابردوو لای وی هێندە بێ بەها بووبێت، هی ئەوە نەبێت قسەیەکی لێوە بکەیت. گوڵنار، ئای، گوڵنار، باشە، تۆ بڵێی ئەو گوڵنارە گوڵنارێکی دی نەبێت، وەک چۆن شیرین و پەرژین لەبەرگیراوەی یەکتر بوون، گوڵنار و گوڵناریش بە هەمان شێوە. نا، ناکرێ، لە دنیایێ یەک گوڵنار هەیە بەو شێوەیە. ئاساییە دایکم لە پلکم بچێ و ئەو دوو ژنە لێکدی جیا نەکەمەوە، بەڵام گوڵنار نا، گوڵنار لە هیچ گوڵنار و ژنێک ناچێ. ئەو کچە گوڵنارە بە بەژن، بە رۆیشتن، بە پرچی پەلکەزێڕینەیی، لێو و دەم و چاو و برۆ، بە لووت کە جوانترین لووتی دنیایە، بە دەنگ، بە بزە، تەنها پێکەنین ماوە، گوڵناری ئێستا پێناکەنێت، ئەویش دڵنیام کارەساتی گەورەی بەسەرهاتووە، بۆیە پێناکەنێت، تا ئێستا گوێم لە پێکەنینەکەی نەبووە، بەڵام کە بزە دەکات، هەمان ئەو بزەیە کە لە بن داربی، لە بن دارخورما، لە سەر منارە و قەڵات، لە رێی قوتابخانە، لە هەموو ئەو ساتانەی بزەی دەهاتێ.

گوڵنار چەتۆ شابارام.

رەنگبێ حەفتەی دووەمی ساڵی خوێندن بووبێ، مامۆستای مێژووی دەچلە و فرەهات کە پیاوێک بوو لە خوارووی زێیەکانەوە هاتبوو، بەڵام شارەزایی لە چیاکانیش هەبوو، ناوی سیانی گوڵناری خوێندەوە، دیاربوو واتای گوڵنار و شابارامەکەی دەزانی، بەڵام بە

عەرەبــی پرســیاری لە واتــای (چەتــۆ) کە کــرد، گوڵنــار نەیزانی، هەر یەکە و شتێکی گوت، یەکێ پێیوابوو، چەتۆ لە (چەتە)وە هاتووە، من بۆ بەرگری لە گوڵنار و بابی ،گوتم:

نەخێـر، چەتــۆ واتە ئــازا، واتە چــاونەترس، واتە ئەگەر سەرۆکێک بڕیاری کەرگرتن بدات، پێیدەڵێ تۆ بەڕێوەبەری کەری.

بووە پێکەنینێک، کۆلیژ هەژا، گوڵنـار ئاوڕیدایەوە، بەڵام منی نەدیت، چەندی مامۆستا لە مێزی دا، لە تەختەرەشـی دا پێکەنــین نەبــڕایەوە، ئەگەر راگــری کــۆلیژ بە ژوور نەکەوتبا پێکەنین نەدەپسـایەوە، راگر بە عەرەبی لە هـۆی پێکەنینەکەی پرسی، مامۆستای مێژوو بە پێکەنینەوە گوتی:

بە (چەتۆ) کە وشەیەکی کوردییە، ئەگەر بکرێتە عەرەبی پێکەنین هەڵناگرێت، بۆیە بۆت ناکەینە عەرەبی.

ئەرێ چەتۆ و شابارامە؟

گەڕامەوە لای کارتەکان، مـن تەنهـا لە سـەرکارتەکان نـاوی بـاب و بـاپیری گوڵنـارم دەدی، تـا پـۆلی دووەمـی ناوەندیشـمان بـڕی، هەمـوو کارتەکـانی گوڵنـارم دیتـووە. ئێستا لە پۆلی یەکەمی کۆلیژ لە دواوەی گوڵنار دانیشتووم، هەمـوو کارتەکـان دەهێـنمەوە پـێش چـاوی خـۆم، سـەیرە، تەنهـا نـاوی گوڵنـار دەبیـنم، نـاوێکە بە خەتێکی درشـت و روون نووسراوە، هەرچی ناوی باب و باپیرە، دەڵێی دڵۆپە

ئاویـــان گرتـــۆتەوە، رەشـــبوونەتەوە، لە یـــادەوەریم رەشـبوونەتەوە، نە چەتـۆ دیـارە، نە شـابارام، نە هـیچ، سـەیرە، بەڵام هەر دەبێـت ئەو نـاوانە بـوون. ئـاخر ئەو گوڵنـارەی لە پـۆل دانیشـتووە، هەر گوڵنـارەکەی منـداڵییە، گوڵنارە کرێمستیەکەیە، دەمویست بۆ دڵنیابوونەوە لە دایکم بپرسم، کە باب و باپیری گوڵنـار ناویان چی بوو، شـەرم زارمـی بەسـت، دەمویسـت بە دایکـم بڵـێم گوڵنـار ئێسـتا لە کـۆلیژ هـاوپۆلمە، شـەرم نەیهێشـت. لە بـارەی گوڵنـارەوە وەهـا بە شـەرمداکەوتبووم، نەمـدەتوانی لای سـاوایەکیش، لای درەختێکـیش باسـی بـکەم، بەڵام پێویسـت بە پـرس ناکـات، ئەگەر چەتـۆ و شـابارامیش بـاب و بـاپیری نەبـن، خۆی هەر گوڵنارە، رەنگە بە هۆی رووداوێکەوە ناوەکانی گۆڕیبێ.

دەبـــوو بە دوای گوڵنـــاردا بچـــم و بـــزانم لە کـــوێ نیشتەجێیە، جێی شەوانی کوێیە. چەند جارێ تا نزیک بازار بە دوایدا چووم، بەڵام شـەرم و ئاوڕدانەوە نەیانهێشت بە جێیەکەی بکەوم. گوڵنـار لە چوونەوە، نـاوە نـاوە ئاوڕێکی دەدایەوە، دوو سـێ جـار منـی دیـت کە بە دوایەوەم، تەریقـدەبوومەوە، جارێـک کـوێرێکی پیـرم بە دیـوار دادا، گۆچانەکەی پەڕی بە سینگی کچێک کەوت، هـاواری پیر و کچە تێکەڵبوون، کوێرە سەد تووکی لێ کردم، بەڵام کچەکە چـی نەگـوت. جارێـک خـۆم بە ژنێکـی عەبـا بەسـەردا دا و سـەد جـوێنی پێـدام. جارێـک خـۆم لە منـداڵێک دا سـینی

پاقلاوەی لە سەر بوو، سینی کەوتە چلکاوەوە، پارەم لا نەبوو بۆی ببژێرم، هێنامەوە ماڵ، پارەکم دایێ. هەموو ئەو رووداوانە بە دواوەی گوڵنارەوە بوو، بەڵام ئەو هیچیانی نەدی، ئاوڕی لەو سەرهاتانە نەدەدایەوە کە بە دواوەی وی بە سەر مندا دەهات.

رۆژێک نەچوومە کۆلیژ، لە کاتی بەربوون بە جلکی کرێکارییەوە گەیشتمە نزیک کۆلیژ، کلاوێکم لە سەرە، دەموچاوم سێبەرە و جوان دیار نیە، رۆیشتنیشم گۆڕیوە. هات، گوڵنار هات و رەتبوو، دوور بە دووری بە دوای کەوتم، چەند جارێک ئاوڕی دایەوە، با بداتەوە، نامناسێتەوە. ئەو رۆیشت و من بە دواوەی، گەیشتە دەرگای ئەو بەشە ناوەخۆییەی دەرگای بەو رێگایەی قەلاتەوە بوو، ئەو رێگایەی تەنها منداڵان بە خشخشۆکە پێیدا دەهاتنەوە خوارەوە. ئەو رێگایە جارێک من و گوڵنار خشخشۆکەمان لێی کردووە. گوڵنار بە پەیژەکەدا، سەرکەوت، گوڵنار ئێستا رەنگە لە پەنجەرەیەکەوە تەماشای رێگای منداڵیی قەلات بکات، رێگای خشخشۆکە، کە تۆڵەستێن ئەودەمەی خاوەن دوو پێ بوو، هێشتا پێیەکی لە سەفین بەجێنەهێشتبوو، ئێمەی بەو رێیە ئاشناکرد.

لە نزیک هێلانەی فریشتان، من زوو ئەو ناوەم لەو بەشەناوخۆییە نا، چایخانەیەک هەیە، ناوی شەوانە، هەمووی داروبارە، لەو دەمەو عەسرانەوە من ئاشنای ئەو

چایخـانە بـووم، لە وەرزی گەرمـا، لە وەرزی فێنکـی هەر چەند کورسەیەک لە بن درەختێک دانراون، من پتر لە بن داربـیەک دادەنیشـتم کە چەنـد پەنجەرەیەکـی هـێلانەی فریشتانی لێوە دیاربوو، یان لە ئاست ئەو پەنـجەرەیەی کە دەڕوانێتە چەند پەنجەرەیەک، ئێواران تا درەنگانی شـەو لە شەوان دەمامەوە، ناوە ناوەش سەرێکم بە دەرێدا بە پێش هـێلانەی فریشـتاندا دادەگـرت، ئـێ، ئەوە خـودایە گوڵنـار ببینم، هەر لەو شەوانەش شیعری (خشخشۆکە)م نووسی.

حەفتەی دووەمی خوێندنە، هێشتا گوڵنار نامناسـێتەوە، یـان نایەوێـت بمناسـێتەوە. پـۆل لە یـانەکەدا دانیشـتنێکی یەکترناسینی ڕێکخست، کورسی ڕیزکرا، دەمویست گوڵنار دانیشـێت، تـا بچمە بەرانـبەری. دەسـتی کچێکی لە دەسـتا بـوو، هەر دەهـات و دەچـوو، دانەدەنیشـت، دەتگـوت نیـازی منی خوێندۆتەوە و حەزناکات بکەوێتە بەرانبەرمەوە. ئیدی مـــن بە نیگەرانیـــیەوە لە لای پەنـــجەرەوە کە هێشـــتا پڕنەبووبۆوە دانیشتم. دیتم هات هات، کچەکەی لەگەڵی لە بەرانبەرم دانیشت و خۆیشی لە تەنیشتی، ئۆخەیش! گوڵنار وا لە پێشمە، گوڵنار چەند ناسک کێک و کۆلا دەخوات، لەو سەرەوە لە ڕیزی گوڵنارەوە خۆناساندن دەسـتیپێکرد، هەر کەس هەڵدەسـتاوە، نـاوی خـۆی و ئەو جێیەی دەگـوت کە لێیەوە هاتووە.

-من ئازاد لە ناو گڕی بابەگوڕگوڕەوە هاتووم.

- لەیلێ لە خانەقینی لەیلێوە.

- چاوجوان لە بن منارەی چۆلییەوە.

- سەگڤان لە نزیک پردی دەلالەوە.

- هیوا لە شارەزووری نالیەوە.

- گوڵنار لە دەرەوەی شارم.

-فەوزی لە گۆگجەلی.

- من هاوار لە بن داربی منداڵییەوە، کەوتۆتە پشت کۆلیژەکەمان هەر دە خولەکێکە بە پێیان.

بەو خۆناساندنەی من بووە پێکەنین و چەپڵە ڕێزان، گوڵناریش چەپڵەی لێدا بەڵام پێنەکەنی، لەو ساتە بە سەر شەرمدا زاڵ بووم، چاوم خستە سەر گوڵنار، بۆوەی بزانم بە ناوهێنانی داربی سیمای چ گۆڕانێکی بە سەردا دێت، هیچ، وەک ئەوەی هەر نەیبیستبێت. چ بکەم، باشە! ئەو کچە بۆ وا دەکات! دێت، دەڕوات، وەک کچەکانی دی چاکوچۆنیەکی ئاساییم لەگەڵ دەکات.

گەیشتینە بەفرەکەش، گوڵنار نەبۆوە گوڵنار، نەبۆوە گوڵناری گەڕەکی داربی، بە گوڵناری کۆلیژ مایەوە. لە پەنجەرەوە دەبینین بەفر دادەکات، دەڵێی پارچە پەڕۆیە دەکەوێت، چ زوو عەردی سپی کرد.، پۆل ئۆقرەی لێبڕا بێ پرسی مامۆستا دەرپەڕین. ئێستا هەموو لە گۆڕاپانەکە لە

بن بەفرین، هەڵپەڕینە، سەمایە، شەڕەبەفرە، من لە دوای گوڵنار دەگەڕێم. دیتمەوە، پرچی بۆ بەفر کردۆتەوە، ئەو بەفرە چ بەفرێکە بە سەر پرچی گوڵنارەوە! پرچی گوڵنار بەفری چەند جوان کردووە، ئێستا لە چاوی منەوە دوو جۆر بەفر هەیە، بەفرێک بە قژ و لەشی گوڵنارەوە، بەفرێک بە دەرەوەی گوڵنار بە دنیاوە، خودایە تێکەڵی بەفری گوڵنارم بکە. لێی نزیکدەبمەوە، لە هەموو لایەکەوە تۆپەڵە بەفرم پێدەکەوێت، بەڵام چاوم هەر لە گوڵنارە، دەی کچی بەفر لە تۆوە هاتوو، بە دەستە ناسکەکانت بەفرم تێگرە، ئەها بۆ هەموو لایەک داهاوێژی، تەنها بۆ من نەبێت، تۆ بڵێی نەمبینێت! ئۆی، گوڵناری ناو بەفر چەند لە گوڵناری ناوی بەفری نزیک داربییەکە دەچێت، هیچ گەورە نەبووە، هەر منداڵەکەی جارانە، ئەودەمیش دڵی نەدەهات توند بەفرم لێدا! رەنگە بەفر لێکردبێتەوە بەڵام شەڕەبەفر درێژەی هەیە. گوڵنار، بەفرم تێگرە، دەمێکە بەفری نەرمی دەستی نەرمی تۆم بەرنەکەوتووە، تێمگرە، شتێکم تێگرە، بەردیش لە دەستی تۆوە بەفرە، تێمگرە، دێتە بیرم لە ناوەراستی گۆڕەپانەکە راوەستاوم، روو لە گوڵنار، تۆپەڵە بەفرێکی گەورەم لە دەستە و توند و توندتری دەکەم، پێش راوەشاندن لەگینە زۆری بردبێت، کورە گۆگجەلی دیارە چاوی لێبووە، دواتر بۆی گێڕامەوە، دەیگوت:

تۆ راوەستابوویت، لە گشت لاوە بەفرت بۆ دەهات، تۆ نیشانەیەک بوویت، کەس نیە بە بەفر نەیشکاندبیت، هەزار

تۆپەلە بەفرت گرتۆتەوە، بەڵام سەیربوو، خۆت تێکنەدەدا، چاوت لەو دوو کچەی نزیک پەنجەرە بڕیبوو، تۆپەڵە بەفر بە ناو چاوت دەکەوت، کەچی چاوت دانەدەخست. تۆ جگە لە دەستەکانت کە نەرم نەرم تۆپەڵە بەفرێکیان توند دەکرد، هیچ جێیەکەت جوولەی نەدەکرد، سپی سپی، دەتگوت پەیکەرێکی لە بەفر، دەتگوت شێرە بەفرینەیت و بە دەستی کچ و کوڕان درووستکراوی، تۆ کەسێکی سەیری، چۆن توانیت هێندە بەرگە بگری، چۆن نەکەوتی، ئەوە چ هێزێک بووی رایگرتی! دواییش...

گوتم:

هێزی گوڵنار، گۆگجەلی، هێزی گوڵنار!

گۆگجەلی بە پێکەنینەوە:

چ زوو ئەو گوڵنارە بووە ئەو هێزە؟ باشە ئەو تۆپەڵە بەفرەت بۆ بەو شێوەیە لێدا؟

گوتم:

زۆر چاوەڕێم کرد ئەو لێمدا، لێینەدام.

دێتەبیرم، لێی نزیککەوتمەوە، تا هێزم تێدا بوو لە سەر سینەی گوڵنارم دا و بە لادا هات و و هاواریکرد:

وای! کاکە چ دوژمنایەتیەکم لەگەڵت هەیە؟ تۆڵەی ئەو خەڵکەت لە من کردەوە.

زمانم تێکئالا، لەرزیم، وەک جارانی پێشوو لەرزیم، ویستم داوای لێبووردنی لێبکەم، زمان بەسترا و نەکرایەوە. نەچوومەوە پۆل، بێ کتێب گەڕامەوە ماڵ، لە ڕێیێ، لە کۆڵانێ لە پڕ تۆپەلە بەفرێک بە بن گوێم کەوت، سەرم هەڵبڕی گوڵێ بوو، بە نابەدڵی بەفرێکم بۆی هاویشتەوە. لە کۆلانی ماڵی گوڵێ شەڕە بەفرێکە مەگەر لە کۆلیژ شەڕی وا بووبێت. دوو ڕۆژ نەچوومەوە کۆلیژ، سەری سێیەی لە سیلەی خانووی خۆیان تووشی گوڵێ بووم، نازانم چۆن شەرمم نەکرد، ڕاست و ڕەوان گوتم:

گوڵێ، دەزانی ئێستا گوڵنار لە کۆلیژ لەگەڵمە!

گوڵێ پێکەنینێک گرتی بەرینەدا، تەواوێک ڕاوەستام پێکەنین نەپسایەوە، بەجێمهێشت.

+ ڕاوەستە.

- چیە؟

+ تۆ دەڵێی تێکچوویت!

- لۆ؟

+ هێشتا! گوڵنار چی...

قسەی گوڵێم بە ئاسایی وەرگرت، ئاخر من وا لەوەیە گومان لە گوڵنار بکەم، ئەو چۆن باوەڕدەکات.

کوڕە گۆگجەلی کتێب و دەفتەرەکانمی هەڵگرتبوو، لەو ڕۆژەوە هاوڕێیەتیمـان چـووە قۆنـاغی گیـانی. سـلاوێکم لە گوڵنار کرد، ویستم داوای لێبووردنی لێبەکەم، تێگەیشت، نەیهێشت قسە بکەم، گوتی:

تۆ برای ئازیزی منی.

ئەو ڕستەیەی گوڵنار منی وێرانکرد، وێرانبوونێک جگە لە خۆم کەس نەیدیت، جگە لە خۆم کەس گوێی لە دەنگی دارمـانم نەبـوو، ڕەنگبـێ کـوڕی گـۆگجەلی شـتێکی لـێ بیستبێ، دەپرسێ:

+ دەبینم باش بۆگوڵنار لێدراوی.

- وازی لێبێنە.

+ پێیبڵێ، ئەگەر شەرم دەکەیت من بۆت پێیدەڵێم.

- نا، نا، شتی وا نەکەیت.

+ باشترە زوو پێیبڵێی، نەوەک بگیرێت.

-وازی لێبینە.

چـۆن وازی لێبێـنم، گوڵنـار نەک دوو، حەفـت مێـردیش بکات، ناتوانم وازی لێبێنم، وازهێنان لە گوڵنار وازهێنـانە لە خـۆم، جـگە لەو کەس نـابینم، ئەویـش بەس مـن نابینێـت، لەبیریکردووم، نامناسێتەوە، تۆ بڵێی من سـەرچێخ چووبم

و ئەو گوڵنارە گوڵنارەکەی بن داربی، گوڵناری کریمستی نەبێت!

باشترە پەنا بۆ گوڵێ ببەم، بێت و بیبینێت و بزانێت چی بەسەرهاتووە، ماڵی گوڵێ لە ماڵی خۆیان دووکانێکیان کردۆتەوە، زۆر جار گوڵێ لە سەری دادەنیشێت، لەوێ دیتم، توورە دیارە، ویستم بڵێم، ئەو گوتی:

+ شتێک هەیە بە چەقۆ ناکرێت، بڕنۆکەت ماوە؟

- بێ بڕنۆ دەبم!

دەستی بۆ ماڵەکەی بەرانباریان، ژووری سەرێ درێژ کرد:

ئەو پەنجەرەیە دەبینی؟

دیتم، تێگەیاندم کە پیاوێک دەڵێی بەو پەنجەرەیەوە نووساوە، هەمیشە لەوێیە وازی لێناهێنێت، بێزاریکردووە، ناوێرێ بێتە سەر دووکان، چەند جار پێیگوتووە پیاو بێت و وازی لێبێنێت بەلاشە. ئیدی دەیەوێت بە شێوەیەک تەمبێی بکات، کەس تێنەگات. لەو قسانە بووین پەنجەرەکە کرایەوە، هەرێم دا گوڵێ کە دارلاستیق دێنم و لە دار پرتەقاڵی حەوشەیانەوە چاری پەنجەرەکە دەکەم. دەمەو عەسرانە، دایکی گوڵێ منی دیت چوومە سەر دار پرتەقاڵەکە، نەیزانی کێشە چیە، بەڵام قسەی نەکرد، منی بە کوڕی خۆی و لە جێی برای گوڵێ دانابوو، بابی گوڵێ

دەمێکە پەکی کەوتووە و گوێیەکانی لە دەستداوە نەیدیتم. پەنجەرە روو لە رۆژە، نێوچەوانی پیاوەکە جوان دیارە. شووشـەیەکی خـڕ لەو شووشـانەی بـابم تەزبێحـی لـێ دروستدەکات، خستمە دار لاستیقەوە، دارلاستیق نوێیە، لاسـتیقەکەی ئەسـتوورە، ئەگەر تەواو رایکێشـی لە نێرەکەری بدەیت دەترێ. تەواوم راکێشا، گوێم لە هاواری پیاوەکە بوو، دیتم بە قادرمەکەدا هاتە خوارێ، دەستی بە سەریەوە بوو، خوێنم دیت.

ئەرێ بۆچی گوڵێم نەبردەو کۆلیژ و گوڵنارم پیشاننەدا، تا پێبکەوم خۆنەناسکردنی لە پای چی؟

کچێ هەبوو، پەرێزی ناو بوو، چاکوچۆنیمان لە نێواندا هەبوو، تا بڵێی بەڕێز و زیرەک بوو، خوێنەرێ بوو تاکی نەبوو، هەمیشە کتێبێکی بە سینگییەوە بوو. دیاربوو منی لە شەڕەبەفرەکەی ئەو رۆژە دیبوو، گازیکردم و گوتی:

+ ویدەچێ تۆ ئەو کچەت زۆر خۆشبوێ.

- من! کام کچ؟

+ ئەوەی تۆپەڵە بەفرەکت لە سینگی دا.

- نا، هیچم لەگەڵی نیە.

+ مـن دەڵـێم شـتێ هەیە، ئەگەرنـا ئەو بەفـرەت بەو شێوەیە لێ نەدەدا.

- ئەگەر خۆشمبویَ چۆن وا لێی دەدەم!

+ پێموایە کاتیَ کەسیَ کەسێکی زۆر خۆشدەویَ و ئەو کەسە رووی ناداتیَ، کەسەکە کاری وای لیَ دەوەشێتەوە.

- نا، من لەو جۆرە کەسانە نیم.

+ با وا بیَ، دەڵێم ئەگەر دڵت پێوەیەتی، خۆم لێی نزیکدەکەمەوە و...

- سوپاس، هیچ شتیَ لە گۆڕیَ نیە.

***

ئەو رۆژەی مامۆستاییَ کە پێنەدەچوو چ بڕوانامەیەکی هەبیَ، وانەی( حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی) دەگوتەوە بە زمانی بەدوویی گوتی:

هەر کەسیَ بەرگی سوپای میللی نەپۆشێت، با بچێتەوە ماڵیَ.

گوڵنار بەر لە هەمووان جانتای بە شان دادا، هەموو بە دوایەوە چوونە دەریَ، تەنها سیَ چوار قوتابی لە پۆل مانەوە، ئیدی گومانم نەما گوڵنار گوڵنارەکەی خۆمە، ئەو گوڵنارەیە کە ساڵی کەرگیران بابی بە دەستی ئەو حیزبە کوژرا کە ئێستا ئەو مامۆستایە مێژووەکەی دەگێڕێتەوە، من لە هەلێک ویستم بڵێم:

مامۆستا، بۆچی بابەتی کەرگیرانەکەمان بۆ ناگێڕیتەوە؟

بەڵام کـوڕی گـۆگجەلی زوو لە نیـازم تێگەیـی، لە تەنیشت یەکتر دانیشتبووین، دەستی خستە سەر زارم و نەیهێشت بیڵێم، گوتی:

کەرە، نەیڵێیت، مردنی بە دواوەیە.

لەو ڕۆژەوە گومـان نەمـا، کە گوڵنـاری کۆلێژ گوڵنـاری بن داربیەکەیە، هەر بۆیە ئامادە نیە جلکی حیزبێک بپۆشێت کە بابی کوشتووە.

پۆلمان بۆ سێ چوار قوتابی جێهێشت، چووینەوە ماڵ، من خەمی لە دەستچوونی خوێندنم نیە، خەمی من خەمی گوڵنارە، ڕۆیشت و نەمزانی بۆ کوێ چوو. چەند شەرمن و گێژ بووم، وەنەبوو لە کەسێ بپرسم کە ماڵی گوڵنار لە کوێیە؟ من بۆچی وا بە شـەرمدا کەوتبووم، هەر شتێک پەیوەندی بە گوڵنارەوە هەبا، نەدەبوو بپرسم، لە کەسم نەدەپرسی.

ئای، گوڵنار ئەوجارەش هەڵفڕی، وەک چۆلەکە، وەک ئەو کـۆترانەی وەک ئەو پووشـکاخەزانەی هەڵمـدەدان و نەدەهاتنەوە، بزربوویت. وێنەی کرێمستی توایەوە. چەند گەمژە بووم، نە بە قسەی دیدارم کرد نە بەقسەی کوڕی گۆگجەلی، شاردمەوە، خۆشەویستیم بۆت شاردەوە، بەڵام بۆ شاردمەوە! خۆت نەتدەزانی؟

نابێت نەیزانیت! ئای گوڵنار، جاری پێشوو مێرد، کێشەی خێڵەکی لە منی دابڕی، بەڵام ئەوجارە حکومەت، لە کوێ بتبینمەوە گوڵنار؟ لەو ڕۆژەوەی دەرکراین، حەفتەی سێ چوار ڕۆژ کرێکاریم دەکرد، دوو سێ ڕۆژ، دەگەڕام، لە شارۆچکە و گوندەکانی دەوروبەری شار دەگەڕام، ئێ ئەوە خودایە لە جادەیەک لە سەرە کۆڵانێک لە پێش دەرگایەک گوڵنار ببینم، گوڵنار لە کوێی؟ هەلوەدای دوو چاوی جوانی تۆم، لەبەر خۆمەوە ئەو گۆرانیەم دەگوتەوە.

جارێک لە گوندێکی بن زوورگەکان، ئەو گوندەی سەردەمانێک لە کارێزەکانی دەوروبەریەوە جۆگەیەک ئاوی دەبەخشیە شار، جۆگە پێشەوەی سەر بە شاردا بکات سەرێکی لە دار خورماکە دەدا. لەوێ لەو گوندە سێبەری گوڵنارم دیت، شەوی پێشتر خەونم دیت، لەو خەونە گوڵنارم دیت لە لای دارخورماکە بە ڕۆخ جۆگەی بێ ئاو سەرەو هەوراز دەرۆیشت، رۆیشت و من بە دوایەوە، پرسیم:

دەچیتە کوێ؟

ئاوڕیدایەوە:

سەرچاوە، کارێزەکان...

دوا ڕۆژەکانی هاوینە، سواری شرە پیکابێک بووم، دەچووە گوندی کارێزەکان. چێشتانێکی درەنگ لە سیلەی

خانوویکەوە، دیتم، سێبەری گوڵنارم دیت. من گوڵنار لە سێبەرەکەشیەوە دەناسمەوە، هەوبوو، تیژ تێپەڕی، سێبەرەکەیم دیت، تا سەرم هەڵبڕی سووڕایەوە، تا سووڕامەوە قەمەرەکە دەرپەڕی. هەوبوو، گوڵنار بوو، لە سێبەرەکەیەوە بەژنیم ناسیەوە، پرچیم ناسیەوە، لەنجەولاریم ناسیەوە، لە کێ پرسم، ئەو ژنەی سواری قەمەرە بوو کێ بوو؟ ناوی گوڵنار بوو، وا نیە؟ ئای شەرم! شەرم نەیهێشت لە ژنێک لە منداڵێک بپرسم، گوڵنار چی دەکرد لێرە، گوڵنار بەرەو کوێ ڕۆیشت؟ دێتەوە؟

هاتمەوە، لە کۆڵانی پشتەوەی هێلانەی فریشتان دیدارم دیت، کۆمەڵێک منداڵ بە شێتە شێتە و چەپڵەلێدان دەوریان دابوو، ئەویش هەر دەیگوت:

غاردە تۆپ هات، غاردە...

تا منداڵەکانم لێ دوورخستەوە منیش وەک ویم لێهات، منداڵەکان بە منیشیان دەگوت:

شێتە شێتە، ئیشم بە دەرپێتە.

دەستی دیدارم گرت و گوتم:

هاورێکەم، هەر تۆ بە نێوان من و گوڵنارت دەزانی، چاکبەوە، پێویستم بە یارمەتیتە.

دیدار تەماشای نەکردم، گوێی لێم، نەگرت، هەڵات و گوتی:

غاردە، تۆپ هات...

وەرزی خوێندن هاتەوە، قسە هەیە وەردەگیرێینەوە، وەرگیراینەوە. ئۆخەیش گوڵنارم دیتەوە، رێک لە سێبەرەکەی دەچێت. گوڵنار و سێبەرەکەی کتومت یەکن، سێبەری کەس وەک گوڵنار لە خۆی ناچێت، کێ بە سێبەر کەسێک دەناسێتەوە؟ من سێبەری خۆم ناناسمەوە، هەر من نا، کوڕی گۆگجەلیش بە سێبەر گوڵنار دەناسێتەوە. چەند جار لە پەناوە لە سێبەری کچانمان دەڕوانی، تەنها گوڵنارمان دەناسیەوە، سەرەتا گۆگجەلی بە سەرسوورمانەوە دەیگوت:

سەیرە، تۆ چۆن گوڵنار دەناسیەوە؟

دواتر بە سەرسوورمانی پترەوە:

نهێنیەک لەو کچەدا هەیە، منیش سێبەرەکەی دەناسمەوە!

گوڵنار وەک ساڵی پێشووە، جیاوازیەکەی لەوەیە لە پارەوە دەمناسێت، هەر ئەوەشە خەریکە شێتم دەکات. ئەو کچە تووشی نەخۆشی لەبیرچوونەوە بووە، لە بارەی منەوە پێش پار هیچی لەبیرنیە. ئەگەر لەبیری با، شتیکی هەر دەگوت، هیچ نەبا، لە تۆڵەستێنی بابمی دەپرسی، خۆ

ئەوەی زۆر خۆشدەویست. من هەر ئەورۆ ئەورۆم بوو، هەموو رۆژێک دەمگوت، ئەها ئێستا خۆمی بەبیردێنمەوە، هەموو شتی بە روودا دەدەمەوە، هەمووی دەگێڕمەوە، لە کرێمستی بن داربییەکەوە تا بەرکۆژە ترازان و تیمارکردنەکە، کەچی کاتێ دەمدیتەوە، زارم دەبەسترا، دەلەرزیم، وای لێهات کە تەنیا دەبوو، نەمدەوێرا لێی نزیکبکەومەوە، وەک بڵێی بۆ ژوان بچم و چاوی دنیام لە سەر بێت. لە دوورەوەش قسەیەکی لەو بابەتە بهاتایە سەر زارم، بە پڕەپڕ قووتمدەدایەوە، نەک دەربچێت و کەسێک بیبیستێت. ئیدی گەیشتمە ئەو باوەڕەی روو بە روو تەن بە تەن ناتوانم رستەیەکیش لە رابردوومان بە گوێی گوڵناردا هەڵبدەم، هەر دەبێت لابەلایی شتێکی بەبیربهێنمەوە.

لە دانیشتنەکانی یانە کە جارجارە وا رێکدەکەوت من و گوڵنار بکەوینە سەرمێزێکەوە، چەند رستەیەکم لە رابردوو دەگوتەوە، ئێ دنیایە گوڵنار منی بیرکەوێتەوە، دەمێ قسە دەهاتە سەر چاوەڕوانی دەمگوت:

داربییەک لە پێش دەرگامانە، بە منداڵی لە سێبەرەکەی گەمەمان دەکرد، هەوکەش لە چاوەڕوانیی هاوڕێی منداڵیم لە سێبەرەکەی دادەنیشم.

لە ساتی گێڕانەوەی داربی تیچاوێکم لە سەر گوڵنار بوو، کەمێک دادەما، وەک بڵێی شتێکی بیرکەوێتەوە، بەڵام

لە پڕ قسەیەکی بۆ هاوڕێکەی تەنیشتی دەکرد و هەر گوێی لە من نەبوو.

قسە دەهاتە سەر شەڕە گەڕەک، دەمگوت:

کوڕێک بە منداڵی سەرمی شکاند بە گەورەیی تۆڵەی خۆم لێکردەوە.

گوڵنار بزەیەکی دەهاتێ، وەک بڵێی شەرم تیتکی بەرەو خواری راکێشێ، سەری دادەخست، بەڵام زوو سەری بەرزدەکردەوە و پەرچەمی هەڵدەدایەوە و هیچ.

قسە دەهاتە سەر سەرکەوتنە جێی بەرز، دەمگوت:

لە بن منارە بزرمکرد، لە سەر سەرێ دیتمەوە.

گوڵنار وەک بڵێی گوێی لە منارەش نەبووە، لەگەڵ ئەوەی تەنیشتی بابەتی وانەی دەکردەوە.

بەلاشە، گوڵنار وەها نەچۆتە چۆلەوانیی لەبیرچوونەوە بە چەند رستەیەکی من بێتەوە ئاوەدانیی بیرهاتنەوە، هیچی بیرناکەوێتەوە.

ئەوساڵیش هەر لە هێلانەی فریشتان نیشتەوە، ئەو هێلانەیەی بە دیار خشخشۆکەی منداڵییەوەیە، بەڵام وەک پار بە پێیان ناچێتەوە، تاکسیەک دێ، گوڵنار و دوو کچی دی هەڵدەگرێ. چەند رقم لەو تاکسیە دەبێتەوە، هەر ئەو رقلێبوونەوەیەیە ئێستاش ژمارەکەیم لە یادە، چ ژمارەیەکی

شـوومه، تاكسـيى ژمـاره شـووم له لەنـجەولارى گولّنـارى كـردم، له قـژى ئايشـەوفاتمەيى كـردم، دەزانـى كه دوور به دوورى به دواييەوه بووم، چۆن خەيالّ دەبووم، هەرچەندە هەنـــدێ كەڕەت خەيـــالّبوونى دواى گولّنـــار رووداوى ناخۆشـــى به ســـەرمدا دێنـــا، بەلاّم چێـــژى گولّناريـــان پێنەدەهێنـــــامەوه. مـــــن كه به دواييەوه دەڕۆيشـــــتم، هەستمدەكرد ئەو كچه فريشتەيه و رێى بەهەشتم پيشـان دەدات، يـــان هەر خـــۆى بەهەشـــتێكى گەڕۆكه، دەبێـــت به دواوەى بـــم، ئەو تاكســـيه له كـــوێ هـــات! خـــۆزگه مـــن شـوفێرەكه دەبـووم، چەنـد جارێـك مـن زووتـر تاكسـيەكم دەگرت و دەچوومه لاى شەوان، له سـووچێكەوه دەمديت، گولّنـــار له تاكســـى دادەبەزێ، بەپەله دەچێـــته هـــێلانەى فريشـــتانەوه. نەمـــدەزانى چـــى دەكەم، له كـــۆليژ له ديتنـــى گولّنار تێر نەدەبووم، يان هەستمدەكرد گولّنـارى دەرەوەى كۆليژ گولّنـارێكه رەنگه نزيكتر بێتەوه له گولّنـارى داربـى، گولّنارى جاران. تاكسى بۆ من بەلاّ بوو، وام به سـەر هات، ئەگەر له چـــوونەوه به دواى گولّنـــارەوه نەبـــم، وەك ئەوه وايه ئەو رۆژه نەمـديتبێ. رۆژ به رۆژ له تاكسـى به رقـدا دەچووم، دەمگوت، نازانم چيم دەگوت، نايەتەوه بيرم چيم دەكرد، بۆچى وام دەكرد؟ گولّنار منى بردبۆوه دۆخى ئەو سالاّنەى كه له نيوه ئاگايى شەو و رۆژم دەكردەوه، دەبوو چارەيەك لەو تاكسييه بكەم.

ڕۆژێک دوا وانە نەچوومە ژوورەوە، پێش چوونەوە بە چارەگێک، چوومە دەرێ، خۆم گەیاندە تاکسی، شوفێرەکە لەولاوە سەرگەرمی قسان بوو، نەترسام لە ئاشکرابوون، بە پێدزە، بە خۆ گنخاندن بە شتەوە، هەر چوار تایەم فسکردەوە. ڕۆیشتم لە جادەکە پەڕیمەوە، لە دەو بەستە گەورەکە راوەستام، ئەو بەستەی کاتی خۆی کەرەکان لێیەوە ئازووقەیان بۆ بەچیاکەوتووان دەبرد، ئەو کەرانەی بوونە هۆی کوشتنی بابی گوڵنار. ئۆخەیش وا بە خۆ و دوو دەستەخوشکەکەیەوە بە پێیان کەوتنە رێ، ترسام لە رێ تاکسی راگرن. دیارە راناگرن، بڕۆ گوڵنارەکەم، دوور بە دووری وا بە دواتەوەم، ئەوهات لێدەکەم تاکسی!

گوڵنار چ گوڵنار، دەڵێی شۆڕەبییە بە جادەدا دەڕوات، پرچی داوەتە دەست با، وەک دڵی من پەریشان و بڵاوە. جگە لە گوڵنار هیچ نابینم، نە کچ نە بنیادەم، نە ترومبێل و جادە، هیچ هیچ، کەس کەس، گوڵنار و بەس. خودایە، ئەو کچە چی لە من دەکات، ئەنجام چیم بەسەردێنێ و بۆ کوێم دەبات! دوور بە دووری بە قژی گوڵنارەوە بەستراوم و رامدەکێشێ، ئەگەر خشە و جیڕە و زرمە نەبا، لە قژی گوڵنار نەدەبوومەوە. چاو دەکەمەوە، بۆچی چاوم داخستبوو! سێ ترومبێل وەک بڵێی چوونەتە ناو یەکتر، شوفێرەکان لێک دابەزین، لە دەستی یەکیان دەڕنافیسێکم دیت، نیو گەز درێژ دەبوو، پەلاماری یەکتریان دا، من وەک

بلێی حەپەساوم، سەیر بوو، وازیان لە یەکتر هێنا، هەر سێکیان پڕیاندا من، دەرنافیس لە دەست دەڵێ:

تۆ، کوێری، گێژی، کەری، وا دێیتە ناو جادە.

چ تێنەگەیشتم، مستێکی توندم بە شان کەوت، دەستم بڵند کرد، دەستێکی توند مەچەکەمی گرت، لەو ساتە دەنگێک:

بەری دەن، دەنا کەرت کەرتتان دەکەم.

ئەو دەنگە ئاشنایە، ئاوڕدەدەمەوە گوڵێ چەقۆیەکی گەورەی بە دەستەوەیەوە، بە چاوێک تەماشادەکات، چەقۆکێشترین چەقۆکێش تەماشای بکات، ترس دایدەگرێت. شوفێرەکان سەرسام بوون، وەک بڵێی هەرگیز نەیاندیتبێت ژنێک چەقۆی بە دەستەوە بێت و هەڕەشە بکات، بەریاندام، لەو لاوە گوێم لە دەنگێکە:

خۆتان لەوە مەدەن، ئەوە گوڵێ چەقۆکێشە.

شوفێرەکان نازانم نە ترسان، نە شەرمیان بە خۆ بوو لەگەڵ ژن شەڕ بکەن، وازیان هێنا، من و گوڵێ تا نزیک ماڵیان پێکەوە هاتینەوە، گوڵێ گوتی:

دەڵێی ئێستا دارلاستیق هەڵناگرێت، هەڵیگرە بە کەڵکت دێت.

لە ڕێیی دەمویست بە گوڵی بڵێم، بە دوای گوڵنارەوە بووم، بۆیە وام بەسەرهات، چەندی کردم و کۆشام، وشەیەکم بە زاردا نەهات. شەو بەو خەیاڵەوە نووستم کە گوڵنار ئاگای لەوێ ڕووداوە بووبێت و سبەی شتێک بڵێ. سبەی هات و چی نەگوت، ئای گوڵنار!

زۆر پێنجشەمووان چاودێریم دەکرد، بزانم ناچێتەوە ماڵ، زۆر لە قوتابیان ئەوانەی لە جێی دوور نەهاتبوون، سەردانی ماڵەوەیان دەکرد، کەچی گوڵنار ئەوەشی نەبوو.، نازانم، نەمدەدیت بچێتەوە، نەمدەدیت بچێتە هیچ کام لە گەراجەکان. عەسرانی پێنجشەمەیەک لەگەڵ کچێک لە هێلانەی فریشتان هاتنەوە خوارەوە، جانتای گەشتیان لە شان بوو، سواری تاکسی بوون، نەمکردە نامەردی تاکسی دوای ئەوانم راگرت، پێیمگوت، بۆ گەراجی گەورە، نەشمدەزانی گوڵنار دەچێتە ئەوێ یان نا.

ئۆخەیش لەوێ دیتمەوە، خۆم پیشانینەدا، چاودێری دەکەم، سواری کۆستەرێک بوون، سواربووم، بە تەنیشتیدا هەڵکشامە پشتەوە، نەیدیتم. بۆ کوێ دەچیت لەگەڵتم گوڵنار. ترومبێل ڕێی باشووری گرت، لە بازگە یەک یەک داوای پێناسەیان کرد، منیان دابەزاند. وا تێبگەم گوڵنار نەیدیتم یان نەیناسیمەوە، ترومبێل ڕۆیشت و منیان هێشتەوە. گومانیان لە ناسنامەکەم هەبوو، درەنگ ئازادیان کردم، بەرێی خۆمدا گەڕامەوە. تەمبێ نەبووم، زۆر

پێنجشەمەیڤدی چوومەوە گەراجەکە، حەیف گوڵنارم لەوی نەدیتەوە.

پەنام بۆ تەختەڕەش برد، بەڵکوو لە ڕێی تەختەرەشەوە رابردوو بەبیری گوڵنار بهێنمەوە. لە پشووەکان دوور لە چاوان، بە ڕەنگی سپی، وەک دڵی جارانی گوڵنار سپی، زۆر شتم دەنووسی:

**بە سەر داربی دیداردا**

**بەفرێکی ئەستوور کەوت**

**چی سپیترە لە وەرزی منداڵی؟**

**مەگەر ئەو سینەیەی لە هەڵەی بەرکۆژەیێ**

**بۆ چاو تترووکانێ دەرکەوت.**

چاوم لە سەر گوڵنارە، دەیخوێنێتەوە، بەڵام هیچ، پرووشەی یادەوەری بە سیمایەوە دیار نیە، پەنجەیەک لە ناگاییەوە بۆ بەرۆکی نابات.

لە سەر تەختەرەش بە خەتی سپی وێنەی سپێتیی چاوی گوڵنار دەنووسم:

**دوو منداڵ**

**بە پوروشکاخەزێکی سپی مینا ڕەنگی ساماڵ**

**نامەیەکی تینوو دەنێرنە ئاسمان**

**پووشکاخەز دەبێتە پەلە هەورێ**

**ئەوان بە ناو پرووشەدا دەچنەوە ماڵ...**

چاوم لە گوڵنارە دەیخوێنێتەوە، بەڵام، هیچ، سەرێکی بۆ پووشکاخەزی یادەوەری هەڵنەبڕی، من هەستمپێنەکرد.

لە سەر تەختەڕەش بە خەتی سوور دەنووسم:

**پەنجەکانت دەناسمەوە**

**خوێنی ئێوارەیەکی منی گرتووە**

**لێوەکانت دەناسمەوە**

**کرێمستی سووری منداڵیی بردووە**

**بە چی دەمناسیەوە، کچی داربی؟**

**من کرێمستی و خوێن و سووراوم لێ تێکەڵاوبووە.**

دەبینم گوڵنار لە ساتی خوێندنەوە لێوی سووری دەجوولێنێ، بەڵام هیچی پێوە دیار نیە، دەڵێی لە تەمەنی نە کرمێستی خواردووە، نە برینی پێی کەسێکی تیمارکردووە.

بە خەتی زەرد لە سەر تەختەتەرەش دەنووسم:

**لە سەر بانی تریفەیی**

**بە کراسی زەردەوە ڕاکشاوە،**

**بەردێکی هێندەی سەرە پەنجەیەک، مانگ دەشلەقێنێ**

**پێخەف لە بان تووڕە دەبێ**

**ئەو شەوە چ شەوێک بوو لە بێهودەیی!**

گوڵنار دەیخوێنێتەوە، بەڵام هیچ، نەک هەر دارلاستیقی من، ڕەنگبێ هاواری مێردیشی لەبیرچووبێتەوە.

لە سەر تەختەڕەش بە چەند ڕەنگێک دەنووسم:

**لە دەو بەستی پێش ماڵێ**

**لە پاش بارانێک بە سەر منداڵی**

**بە تەنیشت خۆمەوە بوویتە پەلکەزێڕینە**

**لە بیرتە؟**

**یان دابڕان بەستێک بوو، هەستا و یادەوەری ڕاماڵی!**

بە دەم خوێندنەوەوە پەرچەمی پەلکەزێڕینەیی هەڵدەداتەوە، بەڵام دیارە یادەوەریی بە بەستێدا چووە.

جگە لە گۆگجەلی کەس نەیدەزانی ئەو شتانەی سەر تەختەڕەش من دەیاننووسم، هەر ئەویش دەیزانی بۆ گوڵناریان دەنووسم. سەری سووڕما بوو لەوەی لە دێرەکاندا منداڵیی بیردەهێنمەوە، ئاخر ئەو چ بزانێت کە من

له منداڵیەوە سەراسیمەی گوڵنارم. رۆژێک هەرساڵی یەکەم بوو گوتی:

یەک نەزانێت، دەڵێت حەفت ساڵە ئەویندارى ئەو کچەی.

لە بەر خۆمەوە گوتم:

حەفت بخە سەر حەفتەکە و هێشتاش...

لە پشـــووێک لە ســـەر تەختـــەرەش ئەو دوو دێـــرەم نووسی:

**بە ریشی بۆزەوە سوجدەی دەبەم من بۆ جەمالی تۆ**

**ئەدی بۆچی دەیانگوت دار کە پیر بوو تازە دانایە**

**بزەت نایێتە سەر لێو، بەزەت نایە بە حاڵمدا**

**ئەگەرچی زۆر لەمێژ ساڵە لە دووت دەخشێم وەکوو سایە**

مامۆستا خوێندیەوە، پرسی:

کێ ئەو شیعرەی هێمنی نووسیوە؟

کەس وەڵامینەدایەوە، گوتی:

لەبەر خـــاتری ئەو دوو دێـــرە لە بـــابەتی خۆمـــان دووردەکەوینەوە و لە رەوانبێژی نزیکدەبینەوە، هەر لەو

وانەیەشەوە ناوی بووە مامۆستای ڕەوانبێژی، مامۆستای ڕەوانبێژی دەیگوت:

ئەو کەسانەی ناخوێننەوە، نازانم چۆن ژیان دەگوزەرێنن!

مامۆستا شیعر دەکاتە وێنە، خەریکە وێنەی کچێک دەکێشێ لە یەکەم هێڵەوە هەستدەکەم لە گوڵنار دەچێ. ئەوەتا گوڵنار هێندە لێم دوور نیە، لەپێشم دانیشتووە لایەکی رووی لێم دیارە. لە ئاوێنەوەیێ تەوای رووی دیار کەوت، وێنەکەی سەر تەختەڕەشەکەش لە ئاوڕدانەوەیێ گیراوە. جیاوازی لە بزەیە، ئاوڕدانەوەی وێنەکە بزە لە سەر لێویەتی. مامۆستای ڕەوانبێژی رێک وێنەی گوڵناری کێشا، جوانییەک لە سیمای وێنەکەدایە، تەنها لە گوڵناردا هەیە. لە بەرانبەر گوڵنار وێنەی پیاوێک دەکێشێ، کتومت منم، بەڵام بە پیری. سەر و ریشی بۆزە، کەمێک بە لای گوڵناردا چەماوەتەوە، وەک بڵێی لە کڕنووشە. لە پشت منەوە، وێنەی درەختێک لە لقەکانیەوە دیارە، چۆتە تەمەنەوە. قەدی درەخت زۆر لە بەژنی من دەچێت، منی سەر تەختەڕەش نا. مامۆستای ڕەوانبێژی دەپرسێ:

کێ دەتوانێت، درەختی پیر بچەمێنێتەوە؟

کەس وەڵامی نەدایەوە، ئەو جارەش پرسیەوە:

قوتابییەک گوتی:

مامۆستا، کەس...

هەندێک بە بێدەنگی مانەوە، هەندێک بە ( کەس ناتوانێت) دەنگیان بەرزکردەوە، دەستمهەڵبڕی:

+ ها، تۆ دەتوانیت؟

- ئەوەی دەتوانێت بیچەمێنێتەوە، تەنها شیعرە.

+ دەم خۆش، شیعر ئەستەم باردێنێ، شیعر پەرجوو دەنوێنێ، ئەوەیە ڕەوانبێژی، ئەویندارى پیر بە دارى پیر دەچووێنێت، یان بە پێچەوانەوە.

گوڵنار ئاوڕی لێم دایەوە، وەک وێنەکە ویستم هەستم کڕنووشی بۆ ببەم، تا وێنەی سەر تەختەطەشەکە نمایش بکەم، شەرم بەستمیەوە.

مامۆستای ڕەوانبێژی وا وێنەی من و گوڵنار دەسڕێتەوە، هێندەی نەمابوو، هاوا بکەم، خۆم گرت. مامۆستا هاتە سەر دێرەکەی دی، گوتی:

من کەمێک لێی دەدوێم، دوایش کێ دەتوانێت بە وێنە بیکێشێ، با بیکێشێت. لەو دێرەدا (بزە) و(بەزە) کە هاوئاوازەن و لە ڕەوانبێژی دەچنە ڕەگەزدۆزییەوە، ئێ هەموو بزەیەک لە بەزەییەوە نایە، بەڵام لێرەدا بزە بێ بەزە نارسکێت. لێرە جوولەی لێو بە جوولەی دڵەوە بەندە.

تـۆ بیهێـنە بەرچـاوی خـۆت، کوڕێـک سـاڵانێکی زۆرە سەراسـیمەی کچـێکە، بە دوایەوەیە، بە تەنیشـتیەوەیە، چاودێ کوڕە تێکەڵی سێبەری کچە بووە و لێکدی جیا نابنەوە، بەڵام کچە بزەیەکی بۆ ناکات، چوونکێ بەرانبەرە وی بەزەیەکی لە دڵدا نیە.

مامۆسـتای ڕەوانبێـژی چـووە دووی، گـۆگجەلی کە لە تەنیشـتمەوە دانیشـتبوو، هانمـدا کە وێـنەکە بکێشـێت، ئەو کوڕە وێنەکێشێکی کارامە بوو، مامۆستا لێبۆوە، گۆگجەلی هەستا، کێشای، وێنەی گوڵناری کێشـا، سـێبەرەکەی کێشـا، ئەو سێبەری لە گوندی کارێزەکان دیتم، کێشای. گۆگجەلی چ وێنەکێشـێکی دەسـترەنگینە، بە سـەر خـوارکردنەوە تەماشـای سـێبەرەکە بـکە لە شـێوەی کوڕێـک خـۆی دەردەخـات، ئەو کـوڕە ڕێـک مـنم، مـن تێکەڵـی سـێبەری گوڵنـارم. دواتـر داوام لە گـۆگجەلی کـرد، وێـنەکەم بـۆ بکێشـێتەوە، کێشـایەوە، نەمـوێرا لە ژوورەکەم هەڵیواسـم، دایکم گوڵناری دەناسیەوە، وێنەکەم لایە و لە دووی گوڵنار دەخشێم وەک سایە.

حەفـتە دێ، مانـگ دەڕوا، سـاڵ دەسـووڕێتەوە، گوڵنـار نامناسێتەوە و نامناسێتەوە. لە هۆلی گەلیش نەیناسیمەوە، وا ڕێککەوت بکەوینە تەنیشت یەکەوە، بەر لە دەسپێکردنی شانۆگەرییەکە زاخم کرد لێی بپرسم:

+ تۆ هەرگیز چوویتە سینەما؟

- بەڵێ چوومە.

+ جاری یەکەمت لە بیرە چۆن بوو؟

- نا، نازانم. -

هێندەی نەمابوو بەبیری بهێنمەوە، شەرم زاری بەستم. چۆن بەبیرت نایەتەوە گوڵنار! ئەدی تۆڵەستێن نەیبردین، لە تەنیشت یەکەوە دانەنیشتبووین؟ گوڵەبەرۆژەمان دەقرتاند و چەپڵەمان بۆ پاڵەوانەکە لێدەدا، چۆن دەبێت ئەو رۆژەت لە یاد چووبێت!

گوڵنار بە دارلاستیقیش نەیناسیمەوە. لە پەنجەرەی پۆلەوە دەبینم لەگەڵ کوڕێک پیاسە دەکات، ماوەیەکە گوڵنار پتر هەر بە تەنێ پیاسە دەکات، بەڵام چەند جارێکە لەگەڵ ئەو کوڕەدا دەیبینم، هەر ئەوەش وای کرد، دارلاستیق بکاتە ناو کۆلیژ. پۆل چۆڵە، گۆگجەلیم لە سەر دەرگا کردە سەیار، نەشیدەزانی چ دەکەم، لە پارچە کاخەزێکی گچکە نووسیم:

وا باشە تەنیایی ئەو کچە تێکنەدەیت.

لە بەردێکم ئالاند، لە پەنای پەردەی پەنجەرەوە سێرەم لێی گرت، برنۆ هەڵە بکات دار لاستیکی من هەڵەناکات. ئەوە قسەی گوڵێ بوو، ناوی لە دارلاستیقەکەشم نابوو برنۆ. سێرەم لە زگی گرتبوو، بە بەرچاوی خۆمەوە بەردە نامەییەکەی هەڵگرتەوە، خوێندییەوە. گوڵنار ویستی

کاخەزەکە ببینێ، نەیدایێ. تەنها بەردەکەی دایە دەستی. گوتم ئۆخەیەش، گوڵنار دەمناسێتەوە، ئای کچی لەبیرچوونەوە! بە دارلاستیقیش نەیناسیمەوە، دنیا تووشی چ بەرەواژییەک بووە، گوڵنار بەردی من نەناسێتەوە!

چیدی کوڕەم لەگەڵ گوڵنار نەدی پیاسەکات.

هەر دەبێت بمناسێتەوە، نامەی بۆ دەنووسم، ئەوپەڕی ئازایەتیم نواند، بە خەتێک کە لە خەتی من نەچێت، نووسیم:

کیژێ، تۆ داتناوە کەنگینێ بمناسیتەوە! من چیدی بەرگەم نەما، وەڵام بدەوە گوڵنارەکەم. نامەکە هەر هێندە بوو، ئەوەشم نووسیبوو:

ئەگەر بە نامە وەڵامت دامەوە، بیخە دەندووکی کۆترەکەوە.

لە پشووێکدا دوور لە چاوان خستمە جانتاکەیەوە. ئەوە یەکەم جارم بوو جانتای کچێک بکەمەوە، لە کردنەوەدا چوکلێتێکم بەر چاو کەوت، دزیم، یەکەم دزیم لە جانتاکەی گوڵنارەوە بوو. چ چوکلێتێکی بە تام بوو، زۆر جار دەمگوت تامی چوکلێتەکەی وایە داخوا تامی لێوی چۆن بێت؟ بە چاوی خۆم نەمدیت نامەکە بخوێنێتەوە، بەڵام هەر دەبێت خوێندبێتیەوە. ئیدی چاوەڕێم وەڵام بگاتە دەندووکی کۆترەکە. ئەو دەندووکە کەوتۆتە تەنکێشی خوارووی

تەختەڕەشـــەکە بەلای کورســـی ومێـــزی مامۆســـتاوە. دەنـدووکی کـۆتر هەڵکـۆڵینێکی بە قەد سـەری کـۆترێکە لە تەخـتەڕەش، هەر رێـک سـەری کـۆترە. ئەوە دەسـتکردی گـۆگجەلییە، چـاوم لێبـوو، بە قەڵەمبـڕ ئەو نەخشـەی نەخشـاند. هەمـوو پۆل ناویـان لەو نەخشـە نـا دەنـدووکی کۆتر. مامۆستای رەوانبێژی جارێک گوتی:

بەس بـــزانم، کـــێ ئەو دەنـــدووکەی خســـتۆتە تەختەڕەشەوە، خەلاتی دەکەم.

گۆگجەلی خۆی ئاشکرا نەکرد. ئیدی من رۆژانە، هەر هەلێک هەڵکەوێ، نووکە پێنووسـێک، سـەرە پەنجەیەک بە دەندووکی کۆترەکەدا دەکەم، وەلام نابینمەوە. لە بنەوەش تەماشای چاوی گوڵنار دەکەم، هیچ، نە بایە نە باران. زۆر لێی پەست بووم، بیرم بە لای دارلاستیقدا رۆیشتەوە، زۆر نیشانەم گرت و پێکام، ئێستا نۆرەی گوڵنار خۆیەتی. ئەو منی هەنجن هەنجن کرد، بە چی سێرەی لە من نەگرت! سێرەیەکی لێنەگرم، دڵم داناکەوێ.

رۆژانە دارلاستیق هەڵـدەگرم، وەرزی بـارینە، بـاران لێیکردۆتەوە، ئەگەر دڵت خۆش بێت، ئەگەر یار بتناسێتەوە، هی ئەوەیە لەو هەوایە پیاسە بکەیت. تەنها پۆلی ئێمە لە دەرەوەیە. گوڵنار لەگەڵ کچێک لە پیاسـەیە، نزیکن، لە بەر دەممن، لەوانەیە ئەو دڵی خۆش بێت. لە پشت یانەکە چەند بـنە درەختێـک هەیە، پەنـایەکی باشـە، بەردێـک و کەرتە

چوکلێتێـک لە گیرفــانمە. چوکلێــت ئەو چــۆکلیتەیە کە لە جانتــاکەی گوڵنــار دزیــم. دەمویســت بەردەکە بــخەمە دارلاستیقەوە، دڵم لەرزی، چوکلێتەکەم لە جێی دانا. ویستم دارلاستیق تەواو راکێشم، دڵـم لەرزی. هێندەم راکێشا کە چـوکلێتەکەی بگـاتێ، گەیشـتێ. بە نەرمـی لە سـەر سـینگی کەوتەوە، چاوی بە دەوری خۆیدا گێڕا، هەڵیگرتەوە. گوێم لێیە هاوڕێکەی دەڵێ:

چیە! چوکلێتت بۆ داوێن!

چاوم لێیە کردیەوە، حەیف نە خواردی نە خوێندییەوە. رەنگبێ نەیزانیبێ شـتێکی لـێ نووسـراوە، تێیهەڵدا. چووم هەڵمگرتەوە، خۆم بۆ خۆمم خوێندەوە:

پار چوکلێتێکم لێت دزی، ها کەرتێکت بدەمەوە.

هەر ئەو رۆژە دەمویست گوڵنار بە گوڵێ پیشـانبدەم و چـارەیەکم لێبکـات، ئەوجـارە گاڵتەشـم پێبکـات هەر دەبێت ببینێت، بەڵام گوڵێ دیسان لە بیری بردمەوە:

+ تۆ دەزانیت ترومبێل بازۆی؟

– لە جێی چۆل...

+ منیش ئیشم بە جێی چۆلە، بەڵام دەتوانی ترومبێلێک بۆ ماوەی کاتژمێرێک پەیدابکەیت؟

– ئاسانە.

ئاسان بوو، هاوڕێم هەبوو، هەیانبوو. کاتێ تێیگەیاندم ترۆمبێلی بۆ چییە، نە گوڵنارم لەبیرما، نە هیچ، زراوم چوو. بەڵام بە سەر خۆم نەهێنا و هەرێم پێدا کە کارەکەی بۆ جێبەجێ بکەم. منِ نەمدەتوانی لە قسەی گوڵێ دەربچم، هێندەم رێز لەو کچە چەقۆکێشە دەگرت، هێندە رێزی دایکمم نەدەگرت. خوام خوام بوو ئیشێکی بە من بێت، لە بیرمە ئەوەشم گوت:

+ ئەو پووخەیە بۆ من لێگەڕێ، بایی دارلاستیقێکە.

شەوی پێش دەستبەکاربوون، بە گوڵێم گوت:

ئەو کارە مەترسیدارە، من پەیوەندیم لەگەڵ ریکخستنی شار هەیە، ئەو کارە بۆ ئەوان لێگەڕێ.

گوڵێ ملینەدا، حەزیکرد کارەکە بە دەستی خۆی بکات. لەوە ئاگادارمکردەوە کە رەنگە پاسەوانێکی هەبێ و لە دوورەوە چاوی لە سەر بێت و بزانێت کە دێتە ماڵی ئێوە. گوڵێ دڵنیای کردمەوە کە ورد و درشتی مژارەکەی لە بەر چاو گرتووە و بە نهێنی دەمێنێتەوە، سبەینێکەی زوو گوڵێ هات و گوتی:

وەرە کارەکە تەواوبکە.

حەپەسام، باوەڕمنەکرد، ئێ، چووم ترۆمبێلم هێنا، گونیەکی خاوێنمان بارکرد، یەک پەلەی پێوە نەبوو، هەر هێندەی فەردە پیازێک گرانە. دەستێکم لە سەر سووکانە،

دەستێکم لە سەر دڵم، ئاوڕدەدەمەوە، وا دەزانم هەرچی چەکداری شارە بە دوامەوەن. لە چۆلەوانیەکەی سەرەوەی بەستی گەورە لە ناو دەغل فڕێمدا. چەندان شەو خەونم بە ناو فەردەوە دەدیت، دواتر بە گوڵێم دەگوت:

چۆنت کوشت؟

گوتی:

بردمە ژوورەکەی خۆم، پێش ئەوەی دەستی بە دەستم بکەوێت، چەقۆم لە قوڕگی راکرد، کەوتە لرخە لرخ، دەستی بۆ دەمانچە برد، پێڕانەگەیشت، بە چەقۆیەکی دی خستم، دایکمم تێگەیاندبوو، پێکەوە_ بە پێکەنینەوە_ تیمارمانکرد، نەتدیت گونیەکە پەلە خوێنێکی پێوە نەبوو.

چۆن دەستت تێچوو بیکوژیت؟

گوڵی گوتی:

چۆن دەستم تێناچێت! بەدوویێک، زۆرم لێبکات ئەگەر لەگەڵی نەخەوم، بە گرتنم بدا، چۆن دەستم ناچێتە کوشتنی؟!

پووخە لە بیابانەوە هاتبوو، ماڵی لە پشت کۆلیژە، خانوویێک بوو حەوشەکەی بە قەد دە خانووی ئێمە دەبوو. هەمووی گوڵ و گوڵزارە، ناوی نازانم کێ خەلەف بوو، بەڵام خەڵکی ئەو ناوە لە نێوان خۆیان بە بەدووە پووخەکە

ناویـان دەهێنـا. پـووخە هەرچـی ویسـتبای بـۆی دەچـووە سەر. شەوێک بە سەریان دادا، بەرنەکەوت. ئەو پووخەیە کە دەتگوت بزنە لەڕە کەس نەبوو لێی نەترسێ. من لەوە تێنەگەیشتم گوڵێ چۆن باوەڕی پێیهێنا کە بە تەنێ و بێ ترۆمبێل بێتە ماڵیان.

گوڵنار نەبا، پووخەی ناو گونیەم لەبیرنەدەچۆوە. گوڵنار منـی خسـتبووە گێـژاوێکەوە هەرچـی ڕوویـدەدا، زوو تێدەپەڕی و وێنە و دەنگەکانی هێندە لە چاو و هزری من نەدەمانەوە. ئەو ساڵانە خەمی گوڵنار نەبا، کێشەی گوڵنار نەبا، کارەساتی گوڵنار نەبا، من لە ئاست ئەو هەموو خەم و کێشە و کارەساتانە چۆن خۆم ڕادەگرت. زۆر هاوڕێ و ناسیار ئاوەوئاو چوون، کەس نەیدیتنەوە، نیشانەیەکیان بەجێنەهێشت. پێشان ئەو ئەودەمانەی کە هێشتا گوڵنار لە گەڕەک هەڵنەفرِیبوو، ژنە ڕەشپۆشەکانی گەڕەک هێندەی پەنجەی دەستێک نەبوون، ئێستا گەڕەک دەڵێی ڕەشۆڵەی بە سەردا باریوە. ڕێی گۆڕستان ڕەشدەچێتەوە، ئێستا دارەبازە دارەبازە، پێشان ئەو دەمانەی گوڵنار هێشتا پێیەکی هەر لە سێبەری داربییەکە بوو، مزگەفتەکەی نزیک گۆڕستان دارەبازەیەکی هەبوو، لەو گۆڕە کەوتبوو، کێ ئیشی پێدەکەوت، جگە لە خانزاد و پیری گەڕیدە، ئێستا دوازدە دارەبازەی هەیە و هیچیان بە مزگەفت ناکەونەوە. ئەو هەموو تەرمە لە کوێوە دێن، پێشان ئەو دەمانەی گوڵناریش پارەی قورئانخوێنی دەهێنا، گۆڕستان

قورئـانخوێنێكی سـەر و زیاد بـوو، ئەوە نەبـوو جەبـار بـی ئیش دەمـاوە، ئێسـتا كـڵاو لە سـەرە قورئـان بە دەستەكان ناژمێردرێن، كەچی دەبێت نۆرەیـان بۆ بگریت. گۆڕسـتان، گۆڕسـتان، نـاو چێورمەكـان پڕبـوونەوە، گۆڕسـتان گەورە دەبێـــت، بە هەر چـــوار لادا دەكشـــێت، زەوی و زاری نەهێشـت، گەیشـتە گەڕەك. شـارەوانی فریانەكەوتبـا، گـۆڕ دەهـاتە كۆڵانێ. دیـواری بە دەوری گۆڕسـتاندا قیتكردەوە. پێشـان بە چەنـد گەڕەكێ گۆرسـتانێكی گچكەیـان هەبـوو، ئێسـتا هەر گەڕەكێـك چەنـد گۆڕسـتانی هەیە، تۆڵەسـتێن دەیگوت:

گۆڕستانەكانی ئێستا دەستكەوتی شەڕن.

شیرن دەیگوت:

ئەو كوژراوانەی لە كەند و لەندان بوونە خۆراكی قەل و دالاشان، لە چەند گۆڕستان جێیان دەبێتەوە؟

لەو ساڵانە بوو فریشتەی شـەوەكە ئەردو و ئاسمان بە گژیـدا چـوون و خـۆی رادەسـتیان نەكـرد، شـەوێك لەو گەڕەكەی كە هێنـــدە دوور نەبـــوو لە قوتابخـــانەكەی گوڵنارەوە، گوڵناری دوای مێردی یەكەم، وا بزانم هەر لەو كۆڵانە بـوو كە دارلاستیقێكم گـرتە سـەرۆك، بـووە ئـاگر باران لە هەموو لایەكەوە تەقە و ئاگر، كۆپتەر هەستا، شار بووە پارچەیەك ئاگر، هەواڵ بە دوای یەكدا كۆڵان كۆڵان، سـەربان سـەربان، دەهـات دەڕۆیـی، هەواڵـی جیـاواز

زنجیرەی بەستبوو، جیاوازیەکە پتر لە ژمارەدا بوو، هەواڵ:

هەزار پێشمەرگە هاتوونەتە ناو شار.

هەواڵ:

دوو هەزار پێشمەرگە پترە، هەر دیتتان شار ئازاد بوو.

هەواڵ:

خوێن لە جادە دەڕوات.

ئەو شەوە پێدەچوو شار دڵی لە ناو دەستی بێ، تۆڵەستێن ئێمەی دەکردەوە ژووریٚ و خۆیشی بە پێیەکەوە، دەهات و دەچوو یان لە سەر بان یان لە پێش دەرگا بوو. رۆژی دواتر ژمارەکە روونبۆوە، یەک پێشمەرگە، شەڕی حوکمەتێکی کردووە، دوا فیشەکی بە خۆیەوە ناوە، دایکم کە زانی ئەو پێشمەرگەیە (فریشتەی شەوەکە)یە شەش مانگ خۆی لە خەم هەڵکێشا، وەک پەرژینی خوشکی لێهاتەوە، لێکم جیانەدەکردنەوە.

هاوین هاتەوە، ئای هاوین، چ زوو دێیتەوە، هاوینی ئەو ساڵانەی کۆلیژ بۆ من وێرانی بوو، بە من با نەهاتبا، پشوو نەهاتبا. دوا رۆژ رێگ لە دوا هەناسە دەچوو، چ سەرەمەرگێکە دابڕان لە گوڵنار! لە هاویندا شار چ چۆلەوانییەکە، چ کەلاوەیەکە، لە پۆل چۆلتر، لە کەلاوەی

نزیک دارخورماکە کەلاوەتر. شار بێ گوڵنار بیابانێکە جگە لە تۆز وخۆڵ چ دیار نیە. هەناسەم دەگیرێ، چاو دادەخەم، بە دەوری خــۆم گێــژ دەخــۆم. ئەو هــاوینەش پــارچە کاخەزێک بووم بە دەم گێژەلووکەوە، نەمدەزانی لە کوێ دەبزووم و لە کوێ دەگیرسێمەوە.

لەو هاوینە لە هەلێک گوڵنارم دیت، لە کن مام زۆراب بە یادی گوڵنار پەرداخێک هەنارم خواردەوە، هەر بە یادی وی لە کۆڵانی قەنەفرەوە سەرم بە قەیسەری داگرت، چەند ژنێکی گەڕەگ ئەو ناوەیان لەو کۆڵانە نابوو، چوونکێ کە ســەرت پێــدا دادەگــرت بــۆنی قەنەفــر دەڕژایە لــووتتەوە، خانزادیش گوتبووی:

لەو کـــۆڵانەوە بچیـــتە ژوورەوە ئەگەر هەمـــووی قەیسەریش بکەیت تا نەیتە دەرێ قەنەفل بەرت نادا.

بە خەیــاڵی گوڵنــار لە کــۆڵانی قەنەفــرەوە لە کــۆڵانی خــانزادەوە، دەچــمە ژوورێ، چەنــد خۆشــە رێــی خەیــاڵ بگاتەوە راستی، ئەو جارە گەیشتێ.

لە سێکوانەکە لە پێش فرۆشگایەک گوڵنار لە تەنیشــتەوە دەبیــنم، کراســێکی ســووری لەبەرە، پرچــی کــردۆتەوە، بە سەر شان ملی هاتۆتە خوارێ، وەک بلێی چاو بەرەژێری بــم، رووم نــایە رووەو روو بــۆی بچــم. لە پشــتەوە لێــی نزیکبــوومەوە، نەگەیشــتمێ رۆیشــت. قەیســەری ســەرڕێژە، شــان بە شــان دەکەوێــت. بە دوای گوڵنــارەوەم، خێــرا

دەڕوات، ڕێ نیە، نایگەمێ، دەڵێی پێشە وی چۆلە، یان خەڵک دەزانن بەپەلەیە و ڕێی بۆ دەکەنەوە. نابێت بزری بکەم، قەیسەری هەزار کۆلانە بزربێت نایبینمەوە. بزر نابێت لە دوورەوە پرچی دیارە، پرچێکە لە هی کەس ناچێت، ڕەنگی بە لای زەردیەوەیە، بەڵام زەردێک لە پرچی کەسدا نەمدیتووە. دەڵێی بای دێ، پرچی گوڵنار سەما دەکات، من تەنها پرچی وی دەبینم، باوەشێک پرچی بە قەیسەری وەرکردووە، دەڵێی ڕوو لە کونە با دەڕوات، پرچ پەخش و پەرێشانە، پەرتوبڵاوە، داوداوە، بە دوای پرچم و نایگەمێ. شان شان، شانم پێدەکەوێ و هەر دەڕۆم، پرچ تا دێ پەرتوبڵاوتر دەبێ، زۆرتر دەبێ، ئای! چ دەبینم، یەک بە کۆلانی قەیسەری پرچ لە پێشمەوەیە، دەڕۆم و نایگەمێ، ناوەستم تا نەگەمێ ناوەستم، تا دەستم نەخەمە پرچی گوڵنار ناوەستم، پرچی هێندە لێم دوور نیە، کەمێکیتر دەست درێژبکەم، پەنجەم دەیگاتێ، چاوم چ نابینێ، بە پرچی گوڵنارەوەیە.

زللەیەک وەستاندمی، ئاگری لە چاوم کردەوە، چاو دەکەمەوە پێش زێڕنەگەرێکە، دەنگێک:

چما، ئەوە تۆی!

سەرهەڵدەبڕم، گوڵێیە، نازانم بە چ شێوەیەک گوتم:

ئەوە تۆ لە منت دا؟

گوڵێ گوتی:

ئێره جێی نیه، با بڕۆین.

بووه دەنگ دەنگ و هەرا، گوێم لێیه:

دەک دەستەکانت خۆش.

چ تێنەگەیشتم، تا لە قەیسەری هاتینە دەرێ، بیرم لە زللەی گوڵێ دەکردەوە، پرچ و گوڵنارم بیرچۆتەوە، لێم چەند بارە کردەوە:

بە من بڵێ ئەو زللەیەت بۆ لە من دا؟

گوڵێ لە چاوییەوە دیاربوو، سەری لە پرسیارەکەم سوورماوە، نەیدەویست وەڵام بداتەوە، دوا جار گوتی:

لەبیرخۆت ببەوە، جێگاکە مەیلەو تاریک بوو، من تا زللەکەم لێنەدایت نەمناسیتەوە، دیارە تۆش ئەگەر بتناسیبامەوە، دەستت بۆ سینگم نەدەهێنا.

بەو وەڵامەی شێت و هار بووم، ئاخر من دەست بۆ سینگی کچێک ببەم، لە کوێش لە ناو قەیسەری! دیاربوو گوڵێ تێگەیشت من ئاسایی نیم، تا گەیشتینە گەراجی پاسەکان، قسەی بۆم کرد، دڵی دامەوە. شەرمەزاری وەها دایگرتبووم، نازانم چی دەگوت. بە یەکەوە سواری پاس بووین، لە نزیک ماڵی مە دابەزیین. نەدەبوو بەو شێوەیە لە گوڵێ جیا ببمەوە، چۆن دڵنیای بکەمەوە ئەو دەستەی لە

ناو قەیسەری گەیشتە سەر سینگی وی، دەستی من نەبووە، سوێند کەڵکی نیە، کەسێک شتی وا بکات، سوێندیش دەخوات، چ بکەم!

هاتم، وردو درشتی پرچ و گوڵنارم بۆی گێڕایەوە. دیتم گوڵی گریا، هێندەی نەمابوو باوەشم پێدا بکات، بە شێوەیێ تەماشای ناو لەپی دەستی راستی خۆی دەکات، وەک بڵێی نەفرەتی لێدەکات، گوتی:

گوڵنارت لە کوێ بۆ ببینمەوە!

ویستم پێیبڵێم گوڵنار ئێستا هاوپۆلمە، ئای لەو هێڕایەتیەی کردم، گێڕامەوە، نەمگوت.

چ رۆژێکی ئەفسوونیە یەکەم رۆژی چوونەوە کۆلێژ، هاتەوە، ئەوساڵ وازی لێناهێنم، بە هەر رێگەیەک بێت رابردووی بیردێنمەوە. لە بن درەختی سەر دەرگای لای پرسگەکە دیتم، سلاوێکم لێیکرد زۆر بە گەرمی وەلامی دایەوە. ویستم دەستی تەوقەی بۆ درێژ بکەم، کیشامەوە، شەرم، ئای! شەرم. گوڵنار چ ناسک و جوانە، هەر دەڵێی گوڵناری سالانی زووە، هی بن داربی، ورد تەماشام دەکات، لە چاوی دیارە، پێدەچێت شتێکی بیرکەوتبێتەوە. کوڕە گۆگجەلی بەسەردا هات، تەوقەی لەگەڵ گوڵناریش کرد، خۆزگە دەستی وی دەستی من دەبوو، باشە من بۆچی تەوقەم لەگەڵ گوڵنار نەکرد؟ خۆ زۆر ئاسایی بوو، لەگەڵ کوڕەکانی دیش تەوقەی کرد، تەوقە نەکردنی بن

درەختی پێش دەرگای لە دڵم بووە گڕێ، گرێیەک مەگەر بە پەنجەکانی گوڵنار بکرێتەوە.

ئەوساڵ لە هێلانەی فریشتانیش نەنیشتەوە، جێی گۆڕی، دەمدیت دەچووە ماڵێک، ئەویشم چوو، ئەو ناوە چەند ماڵە ئەمنێکی لێیە، پێیدا بڕۆیت، بگەڕێیتەوە تووشی بەڵایەک دەبیت، گوڵنار جێ نەما، ئەو خانووەت دیتەوە!

ڕۆژ دێت و دەڕوا ئەوساڵیش دەڵێی دووبارەی پارە، گوڵنار لە نیگای لە سیمای تاڵێک، پێنتێک رابردوو بەدیار ناکەوێت، بێجگە لە دوو نامە بێ ژمارەکە، هەشت نامەی یەک دوو خەتیم بە دزیەوە خستە جانتکایەوە، لە سەر نامەکان ژمارەم دەنووسی، هەر جارەی شتێک لە منداڵی لە رابردووم بیردەخستەوە:

١

**دوو منداڵ**

**لە خشخشۆکەی سەر قەڵاتێ لێکدی بزر بوون،**

**لە سەر منارە یەکتریان دیتەوە،**

**نەتدەناسین؟**

٢

کریمستی ئێستا

تامی کریمستیی بن داربی دەدا؟

٣

سەردانی دارخورماکەت نەکردەوە،

بەلام رەنگبێ لە بیرت بێ

لە ژماردنی کونەکان گەیشتینە کوێ!

٤

منداڵێک خۆی هەلکردووە،

وا دیارە بە هانای ماڵێکی ناو لافاوەوە دەچێ

دوای نیشتنەوە

بە مستێک وردە بەردی رەنگاو رەنگەوە دەگەڕێتەوە.

٥

ئەو جارە لەگەل تۆ چووم

سواری لەیلووک بووم،

بە پاڵی پیاوێ بەرزبۆوە،

بە من با هەر لە ئاسمان بم و نەنیشمەوە.

٦

منداڵێک بە دزیەوە گەورەبوو،

بە دزیەوە بە بووک چوو،

بەڵام دوایی گەڕایەوە بۆ منداڵی.

٧

مانگ

سەر بانێکی بە پێخەفەوە لە باوەش گرتووە،

لاسارێک بەردێ دەگرێتە پێخەف

مانگ بەردەبێتەوە.

٨

لەو ڕۆژەوەی تۆ بزربوویت، بزرم،

تۆم دیتەوە

بەڵام خۆم هەر بزرم،

بڵندترین پووشکاخەز منم، بمناسەوە.

نەیناسیمەوە، ئەو هەموو نامەیەم خستە جانتاکەیەوە، نەمدیت چاوێک بگێڕێ، نەمدیت جارێک لە پەناوە خۆی بگرێت و پێبکەوێت ئەوە کێیە نامە دەخاتە جانتاکەیەوە. گەیشتینە پۆلی سێیەم، نە گوڵنار ناسیمیەوە، نە من زاخم کرد راستوڕەوان خۆمی پێبناسێنمەوە. ئەو کچە بۆ وا لە من دەکات! هیچ چارەم نەما پەنام بۆ قورئان برد. گوتم، گوڵنار بە هیچ نەمناسێتەوە بە قورئان دەمناسێتەوە، لە نامەیەکدا قورئانم بیرهێناوە:

کیژێ، تۆ دەزانی چەند قەرداری! چەند ساڵە هەقی قورئانخوێنەکەت نەداوە، حەمەدی قورئانخوێن چاوەڕێیە؟

رۆژی دواتر بۆ وەڵام سەرم بە جانتاکەیدا گرت، وەڵامی چی ئەو کچە دەزانی وەڵام چیە. دوا جار بیرمکردەوە پەنا بۆ کەر ببەم، گوتم نامەیەک دەنووسم پڕی دەکەم لە کەر و هەرچی جوێنی پیسە بە کەری دەدەم. گوڵنار بە هیچ نەهێتە گۆ، لە جانتاکەی کەر بخوێنێتەوە، خۆی ناگرێ و باوکی بیردەکەوێتەوە شتێ دەڵێ و دەگری. چەندی کردم و کۆشام وشەی (کەر) نەهاتە سەر کاخەز.

چارە چیە! هاتەسەرم بچم لە پێشی راوەستم، هەردوو قۆڵی بگرم بە هەموو توانای خۆم رایوەشێنم و بڵێم:

ئەرێ تۆ بۆ نامناسیتەوە؟

چەندان جار بە خەیاڵ وام کرد، لە خەیاڵیش هەر بە بێدەنگی دەمایەوە. هەواڵێک دنیای بەرەواژ کردەوە، لە هەمووی کردم، لە گوڵنار، لە ماڵێ:

**پێری شەو... گیرا.**

ئەو کوڕە لە وڕێنەشدا ناوی منی بە سەر زاردا بێ، دەگیرێم. هەرچەندە چەندان جار هەریمان بە یەکتر داوە تووشی هەرچی بین، ناوی یەکتر نەڵێین، بەڵام ئەشکەنجە بەرد دەهێنێتە زمان. بە چی دڵنیابم ئەو پێلێنانێ؟ من ئێستاش نامەوێت ناوی بهێنم، بە دوای ویدا چەند کەسێکی دیش گیران، یەکیانم باش دەناسی، پتر ترسام. دەبوو شار جێبهێلم و بە چیا بکەوم، زۆر زۆرم لە خۆم کرد، راستوڕەوان خۆم بە گوڵنار بناسێنمەوە، نەمتوانی. شیعری (خشخشۆکە) کە بۆ گوڵنارم نووسیبوو، لە حەفت لاپەڕە نووسیمەوە، لە پەراوێزی شیعرەکەش نووسیم:

**گوڵنار،**

**لەو خشخشۆکەوە بگەڕێوە سەر قەڵات،**

**دەستی هاوار بگرە و بڕۆنەوە جێی خشخشۆکەی منداڵی.**

خشخشۆکەم دایە گۆگجەلی، پێیمگوت دوای حەفتەیەک لە رۆیشتنی من بیدە گوڵنار، ماڵاواییم لە گۆگجەلی کرد.

لە سەر ڕۆیشتن بووم، نەنەخان گەیشتە ئەو دنیا، لە ئاویلکەدانێ گوتی:

حەزدەکەم لە پیری گەڕیدە نزیک بم، توخدا لە تەنیشتە وی بمنێژن.

بەڵام سوڵتانی کچی راسپاردەکەی بەجێنەهێنا، گوتی:

دیارە ئێوە مەم و زینن!

بردیە گۆڕستانێکی دوور، هێند دوور حەفت گەڕەک نێوانیان بوو، من هێندەم لەدەستهات، لە دڵەوە بڵێم:

سوڵتانە شێت، دارلاستیقێ قەرداری.

ماڵاواییم لە ماڵێ کرد، خەناوکەکەی گوڵنارم بە نهێنی هێشتەوە، دایکم نامەیەکی بۆ براکەی نووسی، چوومە ماڵی گوڵێ، گوتم:

- خوشکێ، ئەگەر دەتەوێت بە چیا بکەوی، دەبمە برات و پێکەوە دەڕۆین.

+ براکەم، من لەوێ جێم نابێتەوە.

- لە ناو کۆمۆنیستەکانیش!

+ لەوێش.

گوڵێ چاوی پڕ گریان بوو، منیشی گریاند، دەستی ڕاستی پێشانمدا و گوتی:

ئەو دەستە یەک هەڵەی کردووە، ئەویش لە ناو قەیسەری.

پەلاماری دەستیم دا و ماچم کرد، دەستی کێشایەوە، دەستی چەپی خستە سەر شانم، گوتی:

ئەگەر بۆت دەردەچێت، دەمانچەت دەدەمێ.

بە سەر بە بەڵێ وەڵامم دایەوە، بە دوودەوێک کەوتە هەڵکەندنی بن درەختەکە، دەمانچەی دەرهێنا، گوتی:

ئەوە هی پیاوی ناو گونیەکە بوو.

بە دەمانچەوە لەگەڵ چاوساخێک گەیشتمە بنار.

شەڕی براکان ڕاوەستایە، بەڵام خوێنی براکان هێشتا هەر بە تاشەبەردەکانەوە دەتگوت خەنەتیلەیە، چاوساخ دەڵێ:

چ خوینێک وەک هی براکوژی نیە، هەر هێندە بەردی گرت، بە بەفر و بارانی دنیا ناچێتەوە.

چاوساخ هەستدەکات ماندووم و پێم لە دووم نایە، لامان دایە دەو چەمەکە. لەو بەرەوە ژنێک لە ناو گیاگۆڵ تەنها سەری دیار بوو، دەگریا. کەمێک لە سەرەوەی وی

چەند کێلێک دیارە، نزیکبووینەوە. ژنە گۆڕێکی لاچەپی لە باوەش گرتبوو، ئێرە پێناچێت گۆڕستان بێت، سێ چوار گۆڕ بە تەنیشت یەکەوە. ئەو گۆڕەی ژنەکە لە سەری دەگریا تەواوێک لەوانی دی دوور بوو، چاوساخ گوتی:

ئا، بەبیرم هاتەوە، ئەو چەند گۆڕە لە براکوژیی ئەو دواییە کوژران، بەڵام ئەو تاقە گۆڕە نازانم، با بپرسین.

ژنە گوتی:

خوشکمە، دە دوازدە ساڵە کوژراوە، بەڵام هەر وا دەزانم دوێنێیە. ساڵی جارێک لە بنی دنیاوە دێم، گۆڕەکەی دەپەستمەوە. خاتوون برینێکی تازەیە، خاتوون فیشەکی بۆ بەچیاکەوتووان دەگواستەوە، کەچی ئەوانیش لە ناو خۆیان تێکبەربوون و یەکتریان بڕییەوە.

ئێی خاتوونی بە فیشەک زگپڕ، گۆڕەکەتم دیتەوە. لە تەنیشت خوشکی خاتوون دانیشتم. چەند درەنگ گۆڕەکەتم دیتەوە، زووتر با، حەمەدی قورئانخوێنم دەهێنا سەرت. لە گۆڕی خاتوونەوە گەیشتمەوە ماڵێ، خاتوونم دیت بە زگی پڕەوە لە ژوورەکەی پیری گەڕیدە هاتە دەرێ، بەرماڵەکەم، هەڵدایەوە، لە بەرماڵەکەوە گوڵنار بە دیارکەوت، ئای گوڵنار خۆزگە لێرە بای، لە سەر گۆڕی خاتوون، بەڵام من نەناسێتەوە، خاتوون دەناسێتەوە؟ ماڵاوا خاتوون، درەنگمە.

زۆر سۆراخی مۆسکۆییم کرد، کەس نەیدەناسی. لەوی هەموو ناوی خۆیان گۆڕیبوو، ناوی تازەیان لە خۆیان نابوو، کەس بە ناوی کۆن کەسی گاسنەدەکرد. چەندی کردیان من ناوی خۆم نەگۆڕی، ئەوەش لەبەر گوڵنار بوو، دەزانی کاتی خۆی هاوار چەند لە سەر زاری خۆش دەهات، هەر دەبێت بەو ناوە بمێنمەوە. زۆر نیشانەی مۆسکۆییم هەڵدا، کەس نەیناسیەوە، بەڵام نیشانە ترسناکەکەم لای کەس باس نەدەکرد.

لە بن دوندێکم دەڵێی ئەسپە هەستاوەتە سەر پاشوو، چەند بنە دارێک بە سەر ملیەوە زۆر لە بژ دەچن. ئەو دوندە بە سەر هەموو دونداندا دەڕوانێت، دەڵێی ئێشکگری لە دنیا دەکات. دەبێ هەر ئەو دوندە بێت کە لە ماڵی ئێمە زۆر جار دەبووە سەرباس، هەوە دوندە ئەسپیەکەیە، ئەوەی پیری گەڕیدە دەیگوت:

ئەشقیاکان نەوە دوای نەوە سەردانی دوندە ئەسپیەکە دەکەن و سەر خەوێکی لە بن دەشکێنن.

تۆڵەستێن دەیگوت:

دوندێکە یەک دوو جار نازانم نە گوێم زرینگاوەتەوە نە وەک ئەسپ حیلاندوویەتی.

پیری گەڕیدە راستی گۆ، ئەوە منیش سەردانیم کرد. لێرەوە دنیا دیارە، گەڕامەوە ئەو رۆژانەی تۆڵەستێن لێرە

بوو. من به تەنیشت گوڵنارەوە بە پووشکاخەزدا نامەم بۆی دەنارد. لەهیکرِا دنیا وەرسوورِا.

*هاتمەوە، گوڵنارم دیتەوە، خواستم، شایییەکی حەفت شەو و رۆژیم گێرا، داکم سەرچۆپی گرتووە، خوشک و برا شاییەک دەکەن چاوی هەموو گەرەکیان لە سەرە. بابم بە پنییەک پێچێکی کرد. گیڤارا سەما دەکات. گوڵێ چووە دەستی دایکم. کچێکمان هەیە، کتومت گوڵنارە، زوو زوو کرێمستی بۆ دەکرم، پووشکاخەزی بۆ هەڵدەدەم. گوڵنار لە بەستەکە دەپەرِێتەوە، دەنگی تەقەیەک دێ، گوڵنار بەردەبێتەوە، نازانم نە بەری کەوت نە لە ترسا خۆی بە عەرد دادا.*

ئەگەر دەنگی فرۆکە نابا، دەگەیشتمە گوڵنار، دوندی ئەسپی چەند بە خەونە، رەنگ نیە ببۆرژێی خەون ئامادەیە. چەند فرۆکەیەک دوندی ئەسپی دادەبێژن، بەڵام ئەشکەفتە گچکەکان دەمانپارێزن، تۆڵەستێن دەیگوت:

ئەشکەفتی وای تێدایە هیچ چەکێک نایگرێتەوە.

بوو بە ساڵێک نامەی دایکم نەگەیشتۆتە براکەی هێشتا لە کۆڵەپشتەکەمە. نامەیەکم بۆ ماڵێ نووسی، باسی نەگەیشتنی نامەکەی دایکیشمم کرد. نامەیەکم بۆ گوڵێش نووسی، ناردم، وێناچێ گەیشتبن، وەڵام نەهاتەوە.

لە ترسی ئارەقە و تەڕبوون تێپم تێپێچاوە، تووشم بە تووشی خاڵە مۆسکۆییم نەدەبوو، زۆر لەوە دەترسام لێم بکەوێت و کەسێک بیکاتەوە، دایکم گوتی:

لە دەستی منەوە بۆ دەستی تۆ، لە دەستی تۆشەوە بۆ دەستی ئەوە، چ دەستی دی نەکات.

جاری وا دەمبیست دەستەیێ بە چیا کەوتوون لەو چیایەی بەرانبەرمانن، نزیک هەر لە بن دەستمان، بەڵام گەیشتن بەو چیایە چەندان شەو و رۆژی دەویست. رێی بەچیاکەوتووان وایە، تا دەگەیتە چیای بەرانبەرت، دەبێت سەد چیا و دۆڵی بۆ ببڕی. رێگات هێندە دووربخەیتەوە، وەک ئەوەی بە دەوری زەوی زەوی بسووڕێیتەوە. بۆیە پەڕینەوە بۆ چیای بەرانبەر لە دەست کەس نەدەهات، نامەکەی دایکمم لە گیرفانە و دەیپارێزم.

شەوان لە دوندی ئەسپیەوە گلۆپی شاران دەڵێی ئەستێرەی رژاون بەڵام نەکوژاونەتەوە و بریسکەیان دێ. بە دوای گلۆپەکانی قەڵاتدا دەگەڕێم، دیتمەوە، لە بنی دنیاوە گلۆپە قەڵاتیەکان دەبینرینەوە. گوڵنار زوو دەیناسینەوە، ئەو شەوەی لە گەشتی چیا دەگەڕاینەوە، لە ترومبێلەکەدا من و گوڵنار لە پشت تۆڵەستێنەوە بە تەنیشت یەکترەوە دانیشتبووین، لە بڵندایەک تۆڵەستێن ئاوڕی لێمان دایەوە:

بزانم گلۆپەکانی قەڵات دەناسنەوە!

من و گوڵنار لە جامەکەوە تێکەڵی گڵۆپەکانی شار بووین، ئەو زوو دیتیەوە، تا بە منی پیشاندا زۆری ویست. ئێستا گوڵنار لە کوێ بێنم، بۆم ببینێتەوە، تا لە ڕێی گڵۆپی قەڵاتەوە، بە گڵۆپەکانی گەڕەک بە هی نزیک کۆلیژ بکەومەوە. لە پاڵ دوندی ئەسپیەوە، لە تاریکایی چیاوە بە دوای ئەو گڵۆپەدا دەگەڕێم کە لە هۆدەی گوڵنار هەڵکراوە.

*دیتمەوە، گڵۆپەکەم دیتەوە. ئەها، پەردەی پەنجەرەکە لادراوە، هەوە گوڵنارە بە جلکی خەوەوە لە سەر پشت ڕاکشاوە. چەند لە ڕاکشانی بن دار خورماکە دەچێت، بەڵام بێ من. چەند لە ڕاکشانی سەربانی بەر تریفەی مانگەشەو دەچێت، بەڵام بێ مێردەکەی. چۆن بیگەمێ؟ دەستم گەیاندە دەرگا، کلیلە؟ هەڵێکی باشە با لە دەستی نەدەم، پێویستە بە نەرمی لە دەرگا بدەم. دەڵێی دەستم مردووە ناجووڵێ، هەر چۆن بوو جولاندم، لە دەرگام دا.*

نێوەچەوانم بە بەردێک کەوت، تومەز من لە سەرچیچکان خەوم لێکەوتووە.

برسێتی، تینوویتی، ماندوویتی، نەخەوتن، شەڕ و هەڵات هەڵات خەیاڵی گوڵناریان لە سەرم دەرنەدەکرد. لە شەڕێک بە هۆی گوڵنارەوە بریندار بووم، لە بن بەردێکم تەقە دەکەم و تەقەم لە سەرە، هەستدەکەم مردن نزیکبۆتەوە، دەمرم و گوڵنار نابینمەوە، لە بن بەردەکە لە مردنی خۆمەوە گوڵنار بە ڕێوەیە، هەستدەکەم بە

سەرمەوە راوەستایە. سەرهەڵدەبڕم هەوە، گوڵنارە کرێمستی بە دەستەوەیە، دەست درێژدەکەم، برووسکێک لە قۆڵم دەوەستێ، چ برووسکێک! خوێنم دیت، کەوتم. دێتەبیرم کەسێک هاتبووە بن پیلم، نازانم لە کوێ ئاگام لە خۆم برا، بەڵام کاتێ هۆشم هاتەوە بەر، چاوم کردەوە، پیاوێک بە سەرمەوەیە، لە دەستەکەی ئێمە نیە، بە نامۆی نابینم، وێنای دەکەم، ردێنی بستێک دەبوو، داوی سپی زۆر تێکەوتبوو، ئەو پیاوە کێیە، دیتوومە، گوتی:

دکتۆرەکە دەڵێ: برینەکەی سووکە، بەو زووانە چاکدەبێتەوە

گوتم:

دەڵێی تۆ دەناسم.

گوتی:

دوورنیە، بەڵام من ناتناسمەوە.

وێدەچێ هەو بێ، دەنگی ئەوە، بەڵام شێوەی گۆڕاوە، چاوی زۆر لە چاوی ئەو دەچێ، گوتم:

+ تۆ خوشکێکت نیە ناوی شیرین؟

- شیرین! تۆ هاواری شیرینی؟

باوەشــی پێمــدا کــرد، ماچبــارانی کــردم، پرســیاری کۆڵەپشتەکەم کرد، لە پشت سەرم بوو، نامەکەم دایێ، خوێندیەوە، گریا، منیشی گریاند. چەند حەزمدەکرد بزانم دایکم چی بۆ نوۆسیوە، نە ئەو گوتی و نە من پرسیم. خاڵە مۆسکۆییم شەلینێکی جوان دەشەلی، لە رووم نەهات، پرسیاری شەلینەکەی بکەم، لە بارەی نامەکەوە تەنها هێندەی گوت:

ئای! بەر لە ساڵ و نیوێک ئەو نامەیە نووسراوە.

گوتم:

زۆر ســۆراخم کــردی، بە هــۆی نــاو گــۆڕینتەوە، نەمدیتیەوە.

حەفتە هات و چوو، قۆڵی چەپم هەر پێچراوە، ئازاری زۆرەو نیشانەی چاکبوونەوەی پێوە دیار نیە، دکتۆرێک تازە لە هەندەران هاتبۆوە تەماشای قۆڵمی کرد، گوتی:

پێویستی بە نەشتەرگەری هەیە.

خاڵە مۆسکۆییم، دڵنیای کردمەوە کە خەمم نەبێت و چارەیەک دەبینێتەوە، دیتیەوە. بە دزیەوە منیان ناردەوە شار. بە ناسنامەیەکی تازەوە لەگەڵ ژن و پیاوێک چوومەوە ئەو خەستەخانەیەی کاتی خۆی تۆڵەستێنی لێ نەشتەرگەری کرا. پێش بردنم بۆ ژووری نەشتەرگەری ژنەکە چرپاندی بە گوێمدا:

بزانە، تا لەو خەستەخانە دەچیە دەرێ، من خوشکتم، ناوم نارنجە، ئەو پیاوەش (رۆستەم)ی مێردمە.

سەرم بۆی لەقاند، تێگەیشتم، چەند حەزمدەکرد دایکم و بابم و خوشک و برا و گیڤارا و گوڵێم لە سەر بان، نازانم بۆ لەوێ بیری گوڵنارم نەکرد.

گوێم لێیە:

باشە، باشە، هاتۆتەوە هۆش.

زۆر هەوڵمدا تا چاوم هەڵێنا، نارنج بە سەرمەوە بوو، بزەیەکی زۆر شیرینی بۆم کرد، لە بزەی دایکم دەچوو. زوو منیان لە خەستەخانە دەرهێنا، لە هۆدەیەکم کەس نابینم، ژنێکی بەساڵداچوو، بە ڕوویێکی خۆشەوە چەند جۆرە خواردنێکی لە پێشم دانا و گوتی:

کوڕم، ئەگەر پێویستت بە سەر ئاو بوو، کەوچکێک لە لەگەنەکە بدە.

بزەیەکی کرد و دەرگای لە دوای خۆی داخست. شەو درەنگ نارنج و رۆستەم پەیدابوونەوە. نارنج زۆر روو بە پێکەنین بوو، پێکەنینی لێ دەباری، دەستی بە قسەی خۆش کرد، رۆستەمیش هەر پێدەکەنی، نارنج بە پێکەنینەوە گوتی:

ئەرێ پێمانناڵێی گوڵنار کێیە؟

بە سەرسامیەوە گوتم:

گوڵنار!

نارنج بە پێکەنینێکی شیرنترەوە:

ئا، ئا، گوڵنار، لە کاتی بەنجەکە هەر گوڵنار گوڵنارت بوو، خێزانتە، یان دەزگیرانت.

گوتم:

هیچیان.

نارنج وەک بڵێی لە پرسیارەکەی پەژیوانبووبێتەوە، پێکەنینی نەما، داما. داوام لێکردن کە ئەگەر بکرێت، هەواڵێک بگەیەننەماڵمان و بیانبینم. بەڵام رۆستەم تێگەیاندم کە هەر ئەو شەو دەبێتە لە شار دەربچم، چوونکە زمان دراوە و شتێک ئاشکرابووە، ماڵە و ماڵ بە دوای برینداردا دەگەڕێن. زۆری نەبرد، دوو کەس هاتن، ناسیمنەوە، یەکیان فریای برای سیامەند بوو، ئەو کورەی بێ سەر لە جەنگ گەڕایەوە. ئەوی دی چیای بەری گەرمێنی، بەڵام ناوی خۆیان گۆڕیبوو. پێش رۆیشتنم، داوام لە نارنج کرد نامەیەک بگەیەنێتە شیرنی دایکم، بە شێوەیەک گوتی:

سەر چاوم.

ئەگەر شەرمم نەکردبا چاویم ماچ دەکرد. پێنووس و کاخەزی هێنا، نامەکەم نووسی، پیاوەکان تێگەیشتن کە بۆ ساتێک پێویستە بە تەنێ جێمبهێڵن، چوونە دەرێ. تەنها نارنج مایەوە، بە وردی ناونیشانی ماڵی خۆمانم دایێ، لە بیرمە ئەوەشم گوت:

هەر بە داربیەکە کۆڵانەکە ببینەوە، هەر بە دارشەق یان گۆچانی بن داربیش بابم بناسەوە.

گەیشتمەوە ئاقاری دوندە ئەسپیەکە، خاڵە مۆسکۆیی بە گەڕانێک رۆیشتبوو. ئەو پیاوە نە نەزۆکی نە شەلین ورەی دانەبەزاندبوو، هەمیشە لە گەڕان و شەڕدا بوو، ئەگەر لە شەڕێک بەشداری نەکردایە، پێیوابوو بە ئەرکی سەر شانی هەڵنەستایە. دوای چەند حەفتەیەک قۆڵم ئێشی نەما، بەڵام هێزی کەم تێدابوو. هیچی پێ هەڵنەدەگیرا، تفەنگی جوان بۆ رانەدەگیرا. مانگ هات و چوو دەست لە کزی دەدا. ئێستا کلاشینکۆف هەڵناگرم، تەنها دەمانچەکەی گوڵێم لە بەر پشتێنە. نامنێرنە شەڕەکان، بەڵام نەچیتە شەڕیش، شەڕ خۆی دێ، شەڕی ئاسمانیش هەر بەسەرتەوەیە. خاڵە مۆسکۆیی کاتێ بەو شێوەیە منی دیتەوە، زۆر خەفەتی خوارد، بیستمەوە لە هەوڵی ئەوەیە بمنێرێتە مۆسکۆ.

عەسرانێکی درەنگە لە بن کەپرێکم پاش کەمێکی دی سێبەری سەری ئەسپە دوندییەکە دەیگاتێ. جا جێگەیەک هەیە لە رۆژهەڵات و رۆژاوا، ئەگەر بۆ چەند ساتێکیش

بـێ، نەکەوێـتە بـن سـێبەری دونـدی ئەسـپیەوە. لە بـن کەپرەوە بە دەم چایە و جگەرەوە پێدەچوو چووبێتمەوە خەیاڵەوە.

گوێم لە حیلەی ئەسپ بوو، حیلەیەک نەیدەبڕییەوە. حیلەیەک چیا و چیا، دۆڵا و دۆڵ دەڕۆیشت. خودایە ئەو حیلەیە هی چ ئەسپێکە لە کوێوە دێ؟ سەرهەڵدەبڕم ئەسپی دوندی پتر هاتۆتە سەر پاشوو، تەواو قیتبۆتەوە، ئێستا نا ئێستا بە پشتدا دەکەوێت. خودایە، دوندی ئەسپی نەکەوێت، دەنا دنیا بن خۆی دەخات، وەک ئەوەیە ئاسمان بکەوێت. ئەسپ لە حیلە ناکەوێت، حیلەی ئەسپ خۆشە، هەمیشە حەزم لە حیلە کردووە. بە منداڵیش لەگەڵ گوڵنار گوێمان لە حیلەی ئەسپ دەگرت و لاساییمان دەکردەوە. هەڵێک خانزاد گوێی لە حیلەی من و گوڵنار بوو، رووی لە من کرد:

هەردووکتان جوان دەحیلێنن، بەڵام حیلەی تۆ هەر دەڵێی ئەسپەکەیە.

نەترسابام، بە یادی منداڵی دەمحیلاندەوە، ترس، ترس دایگرتم. چی روودەدات، شاخ چۆن دەبێ بحیلێنێ، چۆن دەجووڵێ! دەمەوێ لە ناو حیلەی ئەسپیەوە بانگی هاوڕێکانم بکەم، زمانم بەسترا.

نازانم چەندی برد حیلە وەستا. تەماشادەکەم ئەسپە دوند، چۆتەوە باری پێشووی خۆی. لە سیمای

هاوڕێکانمەوە ترسم خوێندەوە، کەس قسە ناکات، کەس ناڵێ ئەرێ ئەو حیلەیە چ بوو، منیش هیچم نەگوت.

زۆری نەبرد دۆڵەکان پڕبوون لە بارستایی گەورە گەورە، لە هیچ شتێ نەدەچوون. دوای کەمێک شێوەی گورگی ئاسنینیان وەرگرت. لە زمانیانەوە ئاگر دەردەچوو، درەختەکان ئاگریان گرت. هەلاتین، هەڵکشاین سەرەو ئەسپی دوندی. دەبینم هاوڕێکانم تەقە دەکەن، منیش هەر چۆنێک بوو هێزم دایە دەستە هێز تێدا نەماوەکەم، دەمانچەم سوارکرد و فیشەکێکم بە گورگەکانەوە نا. تەواو هەڵکشاین، گورگە ئاسنینەکان، کشانەوە، نا لە جێی خۆیان مانەوە، بەڵام دیاربوو ماندوونە و توانای سەرکەوتنیان نیە. پشووێکمان دا، سەرهەڵدەبڕین، لە ئاسمانی چیاکان ماری ئاسنین جلیتبازیان دەکرد، لە زمانیانەوە ژەهریان دەرشت. لە دووربینەوە دەبینین، ژەهرەکە بە سەر درەختدا بکەوێت یەکسەر دەیکاتە خۆڵەمێش. دەبینین بە سەر بەردا دەڕژێ، بەرد دەتوێتەوە. دەبینین دەرژێتە ناو کانیەوە دوای کەمێک ئاو نەدەما. پتر هەڵکشاین، مارەکان نزیکبوونەوە و ژەهر دەڕژێنن، تەقەمان کرد، هەڵوەستەیەکیان کرد، بە دەم تەقەکردنەوە گەیشتینە بن گەردنی ئەسپەکە، مارەکان پەرتەیان کرد.

خاڵە مۆسکۆییش بە هەندێک ئازووقە و دنیایەک هەواڵی ناخۆشەوە پەیدابۆوە:

ئاوایی چیه له دەشت و چیا نەما، ئەوەی زوو هەڵات، دەرچوو، ئەوی دی له زیل بارکرا بەرەوە بیابان. ژەهری باری، باڵندەیەکی بە دنیاوە نەهێشت، درەختێک نەما پەلک دەرکات، بەر بدات. سەرانسەری وڵات بگەڕێیت نە ئاژەلە کێویەک نەماڵیەک نابینیەوە.

له بن گەردنی ئەسپی دوندی گیرساوینەوە، وەرزەکان دەژمێرین. ناوە ناوە هەندێک بزر دەبن، بە ئازووقەوە دێنەوە. من واقوڕماوم، حیلەی ئەسپەکە هی ئەوە نیە باس نەکرێ، کەچی جگە لە حیلەکە قسە لە هەموو شتێک دەکرێت. سەیرە کەس حیلەی بیرنایەتەوە وەک ئەوەی هەر نەیانبیستبێت، هەموو دەڵێن:

ئەسپی دوندی پەناگەی یاخیانە و کەس دەستی ناگاتێ.

بەلام من لێی دەترسم، به خۆم نەوەستام، گۆتمە خاڵە مۆسکۆیی:

تۆ قەت گوێت لەو دوندە ئەسپە بووە بحیلێنێ؟

گوێی بە پرسیارەکەم نەدا، گوتی:

خەمی دەستت نەبێت، هەر لێرە دەرچین، چارەی دەکەین.

چیدی حیلەم نەکردەوە پرسیار و هەوڵمدا لەبیر خۆمی ببەمەوە، بەلام لە بیرناچێتەوە. لەو ڕۆژانە زۆر بیرم لە

تۆڵەستێنی بابم دەکردەوە، حەزمدەکرد بیبینم و لێی بپرسم:

تۆ کە گوێت لە حیلەی ئەسپەکە بوو، کارەساتی بە دوادا هات؟

لە بڵندایی دنیاوە وەرزەکان دەژمێرین، زستانان هێندە بەفری لێدەکەوێت، تا هاوینێش دەمێنێتەوە، بۆیە کانیەکانی پایزانیش باوەشێک ئاویان لە بەر دەڕوات. بەوەی باشە داروباری زۆرە، دەنا زستانان گورگیش ناتوانی لێی بژێت.

من چاوێکم هەر لە سەر دەستمە، زۆر خەفەتی لێ دەخۆم، وا بە بەر چاومەوە حەفتە دوای حەفتە بێ هێزتر، لاوازتر دەبێت و هیچ چارەیەکیشم نیە. دوورنیە بە دەردی پێی بابم بچێت، بە دەردی چاوی باپیرم بچێت، بە دەردی هێنەکەی خاڵم بچێت. لە نزیک پاشووی ئەسپەکە داربەڕوویێکی بە ساڵدا چوو هەیە، تا تۆ دەڵێی ئەستوور ئەستوورە، ناوی کلۆرە، جێی دانیشتنی دوو سێ کەسی لێدەبێتەوە. دار بەڕوو تا سەرێ کلۆرە، ئاسمانی لێوە دیارە، بەڵام هێشتا لە چەند جێیەکەوە لق و پەلکی ژیانی پێوەیە. بەهاران چرۆ دەکات، هاوینان ناو داربەڕوو کەپری منە، هەر هاوین نا، بەهار و پایزانیش دنیا باران نەبێت، زۆر سەرما نەبێت، دەچمە ناو داربەڕووەوە. هەر بە هۆی منیشەوە تەوری دەستی هاوڕێکانم لێی نزیکنەکەوتنەوە. داربەڕوو ماڵی منە، زۆر جار لە ناوی لە سەر پشت

رادەکشـێم، لە چـۆکم بـۆ خـوارێ لە دەرێـیە. بە کـونی داربەڕوو کە تـا سـەرتر بکەویـت بـاریکترە، تەماشـای ئاسـمان دەکەم، ئاسـمان لەو کـونەوە هەر هێنـدەی بنپیاڵەیەک دیارە. فریا ئەو کورەی منی لە ماڵی نارنجەوە گەیاندەوە بن گەردنی ئەسپە دوندییەکە بووە نزیکترین هاوڕێشم، دەیگوت:

مـن کە لەو کـونەوە تەماشـای ئاسـمان دەکەم، هەستدەکەم ژیان زۆر بەر تەسکە، تۆ چۆن دەتوانی هێندە لەو بەرتەسکیەی ژیان بڕوانی؟

من دەمتوانی.

بـایی ئەو بنپیـاڵە ئاسـمانە ئومێـدم بە گەڕانەوە بـۆ ئاوەدانی و رووناکی نەمابوو، ئومێدم بە ژیـان نەمـابوو، لە بن بنپیاڵە ئاسمانەکە بیست و یەک کۆپلە شیعرم نووسـی. نـاوم نـا بنپیـاڵەیەک ئاسـمان، هەنـدێکیانم لە سـەر زگـی داربەڕوو لە دیـوی نـاوەوە هەڵکـۆڵی بـوو، هەنـدێک لە هاوڕێکانم کە بە سەردان دەهاتنە لام، دەیانخوێندەوە بەڵام بە دڵیان نەبوو. زۆر جار شـەوانی مانگەشـەو کە مانگ بە پـڕی بە تـاقی ئاسـمانەوە تـریفەی بە سـەر ئەسـپەکە دا دەڕژانـد، دەچـوومە بـن بنپیـاڵەی ئاسـمانەوە، بە نیـازی ئەوەی مانـگ لەو ئاسمانە گچکەوە ببینم، مانگ نەدەهـاتە نـاو دار بەڕووەوە، مانـگ لە داربەڕووەوە هەڵنەهـات و هەڵنەهات.

لەو رۆژەوەی گوڵنـارم بەجێهێشــت تـا ئەو رۆژەی بـۆ دووەم جـار گـوێم لە حـیلەی ئەسـپەکە بـوو، ئەگەر هەڵەم نەکردبێت، نزیکەی پێنج ساڵێک لە تەمەن رۆیشت، دوور لە گوڵنار، دوور لە کەسوکار دوور لە رووناکی دوور لە دنیا، تەمەن رۆیشت، ئەو ساڵانە ساڵانێک بوون، بێ یادەوەری!

لەو جێیانەی بەفر رەشبۆتەوە، گیـا سـەری دەرهێنـاوە، هەتاو لە دەرێیە، خـاک هەڵمـی لێهەڵدەسـتێ، هەڵمێک بـۆنی دانــوولەی لێـدێ. لە زاری ئەشــکەفتێک کە لە دوورەوە لە پنتێکی رەش دەچێت بە بن گەردنی ئەسپەوە، دانیشتووم و بە دەنگێــک هەر خـــۆم گـــوێم لێـــیە گـــۆرانیی نائومێــدان دەڵێمەوە:

لە پاش مەرگم لە پاش مەرگم

چ فایدەیە شین و گریان...

ئەو گـۆرانیە سـەرەتای هەیە بەڵام کە دەسـتتپێکرد بـێ کۆتـایە. حـیلەی ئەسـپەکە نەبـا، دوایـی نەدەهـات. حیلانـدی، دیسان دوای دوو ساڵ و ئەوەندە ئەسپ حیلاندیەوە، بەڵام حیلەی ئەوجـارەی نەرمترە، ناسکترە، حیلەی ئەو جارەی زۆر لە حیلەی گوڵنار دەچێت. لە ئەشکەفت دێمە دەرێ، لە بـن گەردنـی ئەسـپەکە دوور دەکەومەوە. دەبیـنم دیسـان ئەسپ هەستاوەتە سەر پاشوو، یالی دەڵێی پرچـی گوڵنـارە بە بـــا دەشـــنێتەوە، لمـــووزی خەریـــکە دەگـــاتە ئەو پەلە هەورەی تـــاق و تەنیـــا بە تـــاقی ئاســـمانەوەیە. لە حـــیلە

ناکەوێت، حیلەیەک هێند بە گیانم خۆشە حەزدەکەم تا ڕۆژی دوایی هەر حیلەی بێ. دەبینم هەموو خۆیان بەست و لە چیا دابەزین، بە بزنەڕێ و ڕێچکەکاندا شۆڕبووینەوە بۆ دۆڵەکان. چاو دەگێڕم، ترسام گورگە ئاسنینەکان پەیدابنەوە، دیار نین. سەرهەڵدەبڕم، ئاسمانیش ماری ئاسنینی پێوە نیە، مۆسکۆیی بە منی گوت:

تۆ جارێ لێرە بمێنەوە.

خۆی باڵی گرت، لە بن بەردێک پشووێکمدا، بە قسەم نەکرد منیش بەگەڵ کەوتم، گەیشتینە دەو ڕێگا و جادەکان. لە بەر نمەی باراندا گوێم لە حیلەی ناسکی ئەسپە، لە ئاوەدانی نزیکبووینەوە، گلۆپەکان بانگمان دەکەن. من ئێستا لە نزیک ئەو چایخانەیەم کە لەگەڵ بابم و گوڵنار چایەمان لێی خواردەوە کە لە زاری بابم بە تامترین چایە بوو، حەیف داخراوە.

تەقوتۆقە، زۆر هەوڵیاندا نەچمە ناو تەقوتۆقەوە، بە قسەم نەکردن، بە تەنیشت چیا و فریاوە تەقەدەکەم، کلاشینکۆفم باش بۆ ڕاناگیرێت، بەڵام کۆلم نەدا و سواری دەکەم و دەیهاوێژم. لەپڕ چیا دەکەوێ، ڕێک سەر دڵی گرتبوو، لە پشتیەوە خوێن جۆگەی بەست، وەکات گیانی هەڵفڕی. لەو ساتە یووسف نازانم لە کوێوە پەیدابوو، لە ئامێزی کرد و بردی، گەرم داهاتووین و خوێنی چیا ساردمان ناکاتەوە.

دەمانچەکەی گوڵێشم هەر لە بەر پشتێیە، فریا زوو زوو فریام دەکەوێ. خەڵک بە ژن و پیاو و منداڵەوە بە دار و بەرد و دەستی رووتەوە رژاونەتە جادەوە، چەند دارلاستیق بە دەستێکم دیت، ئای دارلاستیکەکەم! رەنگە ئێستا دەستم توانای راکێشانی دارلاستیقی تێدا نەمابێت!

سەری دارێک دەبینم چەقۆیەکی گەورەی دەم پانی لێ بەستراوە، دەڵێی شمشێرە دەبریسکێتەوە، کێیە ئەو چەقۆیەی بەرزکردۆتەوە! گوڵێم بیرکەوتەوە، دڵم دەڵێ گوڵێیە. درم بە خەڵکەکە دا، لە چەقۆکە نزیکبوومەوە، نەمگوت! گوڵێ جەمەدانیەکی لە مل ئاڵاندووە، هێشتا منی نەدیتووە:

بە دەنگێکی بڵند گوتم:

من وازم لە دارلاستیق هێنا، تۆ چەقۆت هەرماوە؟

ناسیمیەوە، باوەشی پێمدا کرد، دەمانچەکەم دەرهێنا و گوتم:

هانێ، ئێستا نۆرەی دەمانچەیە.

گوڵێ گوتی:

سوپاس، لە کاتێکی باش تووشت بووم.

گوڵێ هەواڵی ماڵمانی پێبوو کە باشن و بەڵام لە جێی خۆیان نەماون، ناونیشانە تازەکەی دامێ. دوای

هێوربــوونەوەی شــار بە مــاڵی کەوتــمەوە، لە ســاتی دیتنەوەی ماڵی حەپەساوی گرتمی، تا دوای گەڕانەوە لە هەڵاتنە گەورەکەش حەپەساوی بەرینەدام. لە باوەشی ماڵی دانیشتبووم کەچی نەمدەزانی لە کوێم و بۆ لەوێم، نە هێزی پرسیارکردنم هەبوو، نە وەڵامی پرسیارانم دەدایەوە، کەم کەسم دەناسیەوە.

دایکم دەستە هێز تێدانەماوەکەمی بە سینگی خۆیەوە دەنا، بابم دەستی لە ملم دەکرد، گیڤارا و خوشک وبرا لە دەورم بوون، بەڵام وەک بلێی لە ناو دراوسێکان دانیشتبم ئەوها بووم، نازانم چ دەردێک لێیدابووم.

دایکم ئەو نامەیەی کە بە نارنجدا ناردبووم پاراستوویەتی، بوخچەکەی کردەوە و دەریهێنا و گوتی:

لەو رۆژەوەی ژنێک لە سەر دەرگا دایە دەستم و جندۆکەئاسا برزبوو، رۆژ نەبووە جارێک نەیخوێنینەوە.

من تەنها بزەیەکم بۆی کرد و بە هەندم هەڵنەگرت.

لە هەڵاتنەکە ئەوەی کە شار سەراپای شار تاق و لۆق نەبێ خۆی بە کۆڵی خۆیدا دا و باریکرد، گرتەیەکی روونم نایەتەوە پێش چاو، لە هەموو ئەو وەرزەی کە لە بن گەردنی ئەسپە دوندییەکەوە دابەزیم و گەیشتمەوە ماڵی و بە شارەوە بارمان کرد وهاتینەوە، دەنگ و رەنگێکی وام لا نیە تا نیشانی بدەمەوە، بیلێمەوە. لەو وەرزەدا نە هاتە

سەرم سەردانی داربی بکەم، نە گۆڕی پیری گەرپدە و خانزاد، نەسۆراخێکی دیدارە شێتم کرد، نەچوومە ماڵی گوڵێش، دێتە بیرم پەرژین بە کراسێکی گوڵگوڵیەوە کە لە کراسەکەی دایکم دەچوو، هات باوەشی پێمدا کرد. دێتە بیرم خاڵە مۆسکۆیی باوەشی بە بابمدا کردبوو، هەردووک دەگریان. دێتە بیرم گوڵێ هاتە ماڵمان، بابم بە پێیەکەوە لە بەری هەستا، لە کاتێک لە بەر کەس هەڵنەدەستاوە. دێتە بیرم هەڵاتین، دێتە بیرم هاتینەوە، دێتە بیرم لە کۆڵانی مۆسکۆ کوڕێکی سیما خۆڵاوی دەتگوت ئێستا لە خۆڵەوە هاتووە، بانگمیکرد، نەمناسیەوە، دەستی تەوقەی هێنا و گوتی:

دەڵێی نامناسیەوە؟

لێیوردبوومەوە و نەمناسیەوە، بە دەنگ نەمناسیەوە. باوەشی پێمداکرد و گریا، بە فرمێسک ناسیمەوە، برادەری منداڵی بە فرمێسک دەناسرێتەوە، هەر ئەو فرمێسکانە بوون کە بەردی کوڕە گوڵێنگدارەکە پێی رشت، هەر ئەو فرمێسکانە بوو کە جارێک لە سەر درەنگ هاتنە پۆل زللەیەکی لە روومەتە سێویەکانی دا، فرمێسک سوورتری کردن، هەوە، گوتم:

یووسف، ئەو هەموو سوورایيەی روومەتت کێ بردی؟

یووسف فرمێسکی سڕی:

کونە فیرار، هاوار، چوار ساڵی ناو کونە فیرار.

ئەو کوڕەی لە کونە فیراران رەنگی خۆڵی گرتبوو، گوتی:

من لە ترسی جاشان چوار ساڵ لە کون، لە تاریکی خۆڵ ژیام، کەچی ئێستاش رۆژ هەر رۆژی جاشانە.

هێندەو تەواو، ئەو وەرزە بۆ یادەوەری هەر هێندەی بەر دا.

لێرەوەش من لە (من) بێزار بووم، مامۆستای گێڕانەوە دەیگوت لێی بێزار دەبیت! ویستم بۆ (ئەو) بگەڕێمەوە، بەڵام پەنام بۆ(تۆ) هێنا، ئیدی لێرەوە من دەبمە تۆ، هاوار تۆیت.

# ٣

دوای گەڕانەوە، دوای ئەوەی شار هاتەوە شار، وازت لە چەکداری هێنا و لە چەکداران دوورکەوتیەوە. ماڵتان چۆوە لای داربییەکە. ئۆخەیش داربی، ئەوجارەش تۆی هێنایەوە سەر دنیا. مینا جاری گۆڕین بە دیتنەوەی داربی لە دایکبوویتەوە. بە دوای دیدارە شێتدا گەڕایت، لە جادە و کۆلانان لە دوای گەڕایت. پێش نیوەڕۆیەک لە مزگەفتی حاجی لەقلەق دیتتەوە. لە جێی دەزنوێژهەڵگرتن پیاوێکی ریش هاتووی سەر قژنی شەڕواڵ لە چەند جێ دڕاو، زاری بە بەلووعەو نابوو، زوو ناسیتەوە. دەستت گرت، لە پێش دەرگاکە لە تەنیشتی دانیشتی. زۆر قسەت لەگەڵی کرد، گوێی لێنەگرتی. قسەی لەگەڵ خۆی دەکرد، پاڵێکی پێوەنایت و گوتی:

غاردە، تۆپ هات.

ڕۆیشت...

سەردانی دارخورماکەت کرد، هێی! دارخورمات نەدیتەوە، زۆر گەڕایت نەتدیتەوە. لە دایکت پرسی:

دایە، بە دارخورماکە نەکەوتمەوە.

دایک گوتی:

دارخورما! لەگەڵ هاتنەوەی ئێوە نەما.

نەمانی دارخورما ئازاری دایت، تۆ دەتویست تەماشای ئەو کونانە بکەیت کە لەگەڵ گوڵنار ژماردتان و نەگەیشتنە کۆتایی.

لە بن داربی نابیەوە، تا دێ هەست بە تەنیایی دەکەیت، نامۆیی لە گیانت چەکەرە دەکات. هەر کۆترێ، باڵدارێ لە داربییەوە هەڵدەفرێت، پتر هەست بە دەستەپاچەیی خۆت دەکەیت. خولیای فڕین لە سەرتە، خەیاڵ هەڵتدەگرێت، دەتباتەوە چیاکان، دەگەیتەوە ئەسپە دوندییەکە. لە فڕین ناکەویت، چڵێکت نیە بۆ نیشتنەوە، هێلانەیەک نیە بۆ حەوانەوە، رەنگبێ هێلانەی تۆ هەر گوڵنار بێ، تۆ لە بن داربی و نانیشیەوە. ئەگەر تۆڵەستێن یان گیڤارا رستەیەک نەهاویژن، تۆ بە زەوی ناکەویتەوە. تۆڵەستێن جارجارە دەتهێنێتەوە لای حیلەی شاخەکە، بەڵام هیچی تێناگەن. گیڤارا لەبیریەتی تۆ لە پووشکاخەز بڵندترین بوویت و کەس نەتدەگەیشتێ. بە بیری دەهێنیتەوە کە تۆڵەستێن لە تۆش بڵندتر بووە. بەڵام گیڤارا وەک بڵێی باوەڕناکات. خولیای پووشکاخەز لە سەرت دەگەڕێ و دەتەوێ لەو رێیەوە بفڕیت. بە بەر چاوی گیڤاراوە پووشکاخەز هەڵدەدەیت، بە سەر ماڵی جارانی گوڵناردا فڕی، گەیشتە تاقی ئاسمان. پارچە کاخەزێکت لە دەستە، گیڤارا دەڵێ:

ئەوە چی دەکەیت؟

تۆ بە پێکەنینەوە دەڵێیت:

گۆرانیەک دەنێرمە ئاسمان.

نووسیت:

**تاکەی دانیشم لە سای داری بی**

**تاکەی بیچێژم دەردی غەریبی**

ناردت.

گیڤارا دەڵێ:

چیت نووسی و بۆ کێت نارد؟

وەڵامت نەدایەوە، قسەت بە لایەکی دیدا برد.

هەر ئەو ساڵە چوویتەوە کۆلێژ، وەریانگرتیەوە، لە پۆلی سێیەم دانیشتیەوە، حەیف لە جێی خۆی نەمابوو. بارکردنی کۆلێژ بۆ تۆ دەتگوت کۆستە. هێی، هاوپۆڵەکانت لە چاو تۆ چەند منداڵن، هەندێک لە مامۆستاکان لە تەمەنی تۆن، گوڵنار! هەواڵی گوڵنار لە کێ بپرسی، گۆگجەلی لە کوێ ببینیەوە، بزانی کاتێ شیعرەکەی داێ، چی گوت! ئای گۆگجەلی! حەفتەی یەکەمە، لە ڕاڕەوەکە کچێکی ڕەشتارە بەرەو رووت هات، ناسیتەوە، پەرێز بوو، چاکوچۆنیەکی گەرمی لەگەڵ کردیت. هەنگینێ لەو قوتابیانە بوو کە وەک

دەیانگوت بە پرسیارەکانی، مامۆستای شەرمەزاردەکرد، تۆ خۆزگەت دەخواست گوڵناریش وەک وی با. گوتی:

زۆر دڵخۆشم دەتبینمەوە، تۆ کە لە چیا هاتیەوە ڕێزی زۆرت لام هەیە، من ئێستا لێرە مامۆستام، هەر ئیشێکت هەبوو، لە وانەکان هەر ئاستەنگێکت هاتە پێشی، بە من بڵێ، بە چاوان بۆت دەکەم.

سوپاست کرد، دەست لە سەر سینگ کەمێک بۆی چەمیەوە، ویستت هەواڵی گوڵناری لێ بپرسی، وەبیرت هاتەوە کاتی خۆی چیت پێگوتبوو. باسی گوڵنارت نەکردەوە.

نازانی حەفتە یان مانگی چەندەم بوو، دەزانی تاقیکردنەوەتان هەبوو، وانەی مامۆستایەکە کاتی خۆشی وانەی پێتگوتووە، جارێک لە سەر فۆلکلۆر لەگەڵی تێکگیرایت. ئێ، لەگژ وەڵامدانەوەیت، پرسیارەکان هەر ئەو پرسیارانەن کە پێش بە چیا کەوتن دەیهێنانەوە. نە ئەو دەم نە ئێستاش نازانی وەڵامیان بدەیتەوە، بە هەر شێوەیەک وەڵامیان بدەیتەوە هەڵەیە، وەڵامی ئەو پرسیارانە لە کتێبێکی گچکەن، کتێبەکەت هەیە، پێشتریش هەتبوو، بەڵام بە تۆ ناخوێندرێتەوە، نیو لاپەرەیەکی لێ دەخوێنیەوە ژانەسەر دەگریت و فرێی دەدەیت. ئێ، ئاگات لێیە مامۆستایەکی دی دێ، مامۆستای پرسیار گران

دەچێتە دەرێ. دوای کەمێ سەرت هەڵبڕی و لە روخساری مامۆستای تازەت ڕوانی، ئای!

چاوت رەشکەوپێشکە دەکات، یان بە دیار پرسیارەوە خەوتوویت و خەون دەبینیت، گوڵنار! هەوە؟

کەس نەناسیەوە گوڵنار دەناسیەوە، ئاگات لە پێنووس و کاخەز بڕا، لە گوڵنار دەڕوانیت، هەستیکرد لێی دەڕوانیت، چەند جارێک تیچاوی دایتێ، هەستتکرد دەتناسێتەوە، بەڵام نەهات بە لاتەوە. هەر وەک خۆیەتی، هیچ نەگۆڕاوە، هەر گوڵناری بن داربیەکەیە، هەر گوڵناری کۆلیژە، کات تەواو و هیچی دیت بۆ نەنووسرا، لەو کاتەی کاخەزی مەیلەو سپیت دایە دەستی، گوتی:

بەخێر بێیەوە.

نەتزانی چۆن گوتت:

سوپاس.

چ قسەی دی نەکرد، لە پۆل هاتیە دەرێ، ئیدی گوڵنار مامۆستاتە. دیارە هاواری سەردەمی کۆلیژ دەناسێتەوە، بەڵام چ پێناچێت لە بارەی هاواری بن داربی لە یادەوەریدا دەنگێک رەنگێک مابێتەوە. هەر دەبێت پێبکەویت داخوا شیعر و نامەکەی خوێندۆتەوە یان، نا. رۆژێک لە پێش ژوورەکەی خۆی پرسیاری چەند برادەرێکت لێی کرد، لەوانە گۆگجەلی، پرسیت:

نازانی چی بەسەرهات؟

کەمێک داما:

کوڕە شەبەکەکە دەڵێی! ئەدی لەگەڵ تۆ بزر نەبوو؟

لەگەڵ تۆ بزربوو! ئای گۆگجەلی بە شیعرەکەی تۆوە داخـــوا کەوتە کـــونجی چ بەنـــدیخانەیەکەوە! شـــیعری خشخشـۆکەت فەوتـا، نەتپاراسـتبوو، لێـرە و لەوێ چەنـد رستەیەکت لە بیرماوە، بەڵام بایی ئەوە نیە ببێتەوە شیعر.

هەستدەکەیت گوڵنار بەرانبەرت زۆر سارد و سڕە، بە تەنیشتتدا وەک مامۆستایەکی لووتبەرز تێدەپەڕێ، دەورو بەری خۆی نابینێت، دەبێت تۆ سلاوی لێبکەیت. ئێستا ئەو مامۆســتا و تــۆ قوتــابی، قوتــابییەکی دەســت گــۆجە، چ ســـەودایەکی خـــاوە! مامۆســـتا گوڵنـــار لە پۆلـــدا رەقە، حەزناکات قوتابی زۆر پرسیار بکات، پێناچێت زانیاریی زۆر بێت. لە ساتی راڤەکردنی بابەت زۆر جار لەگەڵ خۆی دژ دەکەوێـــتەوە، کەســـیش نـــاوێرێ دەســـت هەڵبـــڕێ و قسەیەک بکات. لە سەر سادەترین جوولە قوتابی دەکاتە دەرێ، جـوێنیش دەدات، هەرگیـزیش پێنـاکەنێ، جـار جـارە بزەیەکـی شـیرین دەکـات، هەر قوتـابییە و بە جۆرێـک لە تووڕەیی مامۆستا دەدوا، هەیە دەڵێ:

جـگە لە تـووڕەیی هیچـی پێنـیە، پێنـاچێ چـوار کتێبـی خوێندبێتەوە.

هەیە دەڵێ:

قەیرەیە، تووڕەیی نەدیتنی دنیا بە سەر ئێمەدا هەڵدەڕێژێت.

دەتویست بڵێی، هێندەی من بزانم دوو مێردی کردووە، نا، چۆن قسەی وا دەکەیت!

گوڵنار لای تۆ هەر جوانە، بە دزیەوە ئاگای لێنەبێت لێی دەڕوانیت، کاتێ لە لای تەختەرەشەکە رادەوەستێ، دەڵێی شۆڕەبییە، لە دەم و لێوی دەڕوانیت، هێند جوان رەنگی کردووە، دەڵێی کریمستی خواردووە. چاوەکانی، ئای لە چاوەکانی! ئەو چاوانەت لە ناو داربەڕووەکە خستە کۆپلە شیعرێکەوە، هەر دەبێت بۆی بخوێنیەوە، دڵنیایت گوێی لەو شیعرە بێ، چاوی خۆی دەناسێتەوە.

بەهارە، وەرزی شیعر و چیرۆکە، تۆش دەخوێنیەوە. گوڵنار کەم دێتە دیداری شیعرەوە، بۆیە داوات لێکرد لە کۆڕەکەی تۆ ئامادەبێ. هەرێیدا ئەگەر کاتی هەبێ، دێ. هۆڵێکی گچکەیە، کاتی خوێندنەوەیە، چاو دەگێڕیت گوڵنار دیار نیە. لە ریزی پێشەوە شەش حەفت مامۆستا دانیشتوون، گوڵنار لە ناویان نیە، چاو دەگێڕیت، چاوت لە سەر کورسی کورسی رادەگریت، گوڵنار نیە، نەهاتووە. داتنابوو، لە سەرەتا (چاو)ەکە بخوێنیەوە، شیعرێکی دیت پێش خست، چاوەڕێیت گوڵنار بێ، ئەوجا چاو بخوێنیەوە. بە نابەدڵی دەستت بە خوێندنەوە کرد، چاوێکت لە سەر

شیعر، چاوێکت لە دەرگایە، شیعری (لە پووشکاخەزدا دەرکەوت)یشت خوێندەوە، گوڵنار هەر دەرنەکەوت. شیعر شیعر پێش (چاو) دەکەوێت، چاوی گوڵنار هەڵنەهات. ئیدی نۆرەی چاوە، لە رستەی یەکەمی چاودا، چاوت بە هۆڵەکەدا گێڕا، چاوێک رایکێشایت، تەماشای کچەکە دەکەیت گوڵنار نیە، بەڵام چاوەکانی چاوی ئەون. دیارە گوڵنار خۆی نەیتوانیوە بێ، چاوەکانی ناردووە. سەد سوێنددەخۆیت ئەو چاوانە چاوی گوڵنارن، چاوەکان بە بێ ترووکان بە پڕی لێت دەڕوانن، تۆش چاوت ناترووکێنیت. بەوەی باشە شیعرەکەت لەبەرە و پێویست بە تەماشاکردنی پەڕە کاخەزەکە ناکات، بۆیە نە لە خوێندنەوەی (چاو) دەکەویت، نە لە تەماشای چاو. چاوەکان وەک بڵێی دەیانزانی شیعری (چاو) بۆ وین، پتر دەگەشانەوە، هەستتدەکرد، برژانگەکان درێژدەبن، لێت نزیکدەبنەوە، دەبنە تیر و دەورت دەدەن، تۆ هەوکە کەوتوویتە ناو ئەستێرەی بە تیر دەور دراو، خۆت رادەستکرد، تۆ کەوتیت. بە چەپڵەرێزان هەستایتەوە، ئەوە چ بوو خودایە! چاوی گوڵنار چ دەکات لە کن ئەو کچە؟ کچە بە بەردەمتدا لە هۆڵەکە چووە دەرێ، چ جێیەکی لە گوڵنار نەدەکرد، بەڵام چاوەکانی چاوی وی بوون. کەوتیە گومانەوە، چۆن دەبێت چاوی دوو کەس کتومت چاوێک بن، ئەدی ئەگەر بەژن و دەم و لێو و پەنجە و قژی دوو کچ هەموو جێیەکیان لە یەک چوو، رۆیشتن، قسە، ئەودەم چی! نا شتی وا نیە، نەبووە دوو کەس لە هەموو شتێک لە

یەک بچن، مەگەر چاوێ هەبێ، شتە لێکنزیکەکان وەک یەک ببینێت.

دوای کۆڕەکە گوڵنار هەر باسیشی نەکرد، نەیگوت، نەمتوانی بێم، نەیگوت، چیت خوێندەوە، هیچ، وەک بڵێی هەر نەیزانیبێ شیعرت خوێندۆتەوە، تۆش هیچت نەگوت، تەماشایەکی چاوت کرد، ڕێک ئەو چاوە بوو کە بە کچێکدا ناردبوویە هۆڵی شیعر خوێندنەوە.

هاوینە، گرانییەک داهاتووە، پیری گەڕیدەش بە گرانیی وا تێنەپەڕیو.، راو و رووتێکە نان لە دەستان دەرفێنن. خاڵە مۆسکۆیی زۆر هەوڵیدا بچیەوە بارەگا نەچوویت. لە نزیک سینەما لە سەر شۆستە لە سەر تەنەکەیەک دانیشتوویت و جگەرە دەفرۆشیت. لە تەنیشتیشت فریا بە دیار تایت و سابوونەوەیە. باب و برا هەوڵیان لەگەڵت دا دانیشیت و کار نەکەیت، برا دەمێکە وازی لە خوێندن هێناوە، خوشک خوێندنی تەواو کردووە، گیڤارا وەک تۆ قوتابییە.

دووسێ جار گوڵنارت دیت، پۆشتە و پەرداخ بە بەردەمتدا تێپەڕی، تۆی نەدەدیت، تۆش خۆت پیشانی نەدەدا. جارێکیان پاکەت و جگەرەت بە جێهێشت و بە دوایدا چوویت، کڵاوێکی گەورە کە لە هی سەپانی دەچوو لە سەرتە، ئاوڕیش بداتەوە ناتناسێتەوە، دەڕوات و لە دووی نابیەوە. لە نزیک ئەو شوێنەی ئەگەر گوڵێ نەبا

شوفێرەکان دەیانکوتایت لایدا کۆلانێک، لە سەری کۆلانەوە دیتت لە دەرگایەک چووە ژوورەوە، بەویدا رەت بوویت، دەرگاکەت دەست نیشانکرد، سێ دەریە، رەنگەکەی شینێکی کاڵە، خانوویێکی خۆشە، پڕ لە داروبارە، چەند جارێکی دی دیتت هاتەوە ئێرە، ئێرە ماڵی گوڵنارە، بەڵام لەو ماڵە نە هاواری مێرد دەبینیت، نە دایکی، نە براکەی، ئەوانەی دەیانبینیت کەسیان ناناسیت.

وەرزی خوێندن هاتەوە، حەیف ئەو ساڵ گوڵنار مامۆستای تۆ نیە، هەر لە کۆلیژە و جاروبار دەیبینیت، بەڵام هێندە ساردە هی ئەوە نیە کەمێک لای راوەستیت و دوو قسە بکەن، سووکە سلاوێکتان هەیە و بەس. دڵت هەر ترپەترپیەتی بۆی، حەزدەکەیت هەمیشە بە دواوەی بیت، هەمیشە لێتەوە دیار بێت. زۆر جار لە سەرە کۆلانی ماڵیان بۆ دیتنی، خۆت دەگریت. جارێک لەو جارانە ئەویش تۆی دیت بە بزەیەکی واتادارەوە سلاوێکی کرد، وەک بڵێی تێگەیشتبێت کە تۆ بە دواوەی، تەریقبوویتەوە، ئارەقەت کرد، لە شوێنی خۆت رەق بوویت، ئەگەر سلاوێک نەبا هەر لەوێ دەمایتەوە. سلاوەکە سلاوی فریا بوو، فریات کەوت و دەستی گرتی و گوتی:

خەونم بە یووسفەوە دیوە، با سەرێکی لێدەین.

قسـەت نەشکاند، گەیشـتنە سـەرە کۆلانی وان، لەپڕ لە حەوشــەی مــاڵی یووســف کڵـپەیەک وهاوارێـک پـێکەوە بەرزبوونەوە، کۆلان رژایە حەوشەوە:

هاوارتە لە من، یووسف خۆی سووتاند.

مەسینەیەک بەنـزین و دنـکە شـخاتەیەک، یوسـفی بـۆ خۆی بردەوە. دەڵێن: یوسف رچەشکێنە، پێشە وی لە شـار خۆسـووتاندن چەکـی ژنــان بـوو، بەڵام یووسـف کـردیە چەکی پیاوانەش، کێ زانی یوسف بۆچی خۆی سـووتاند؟! نــامەیەکی تــایبەت بە خۆســووتاندنەکەی لە دوای خـۆی جێهێشـتبوو، بەڵام کەس هیچـی تێنەگەیشـت، کەس نەبـوو ئەو نــــامەیە نەبینــــێ، دەروونئــــاس، کۆمەڵنــــاس، جادووباز...بەڵام کەس هیچی لێهەڵنەکڕاند.

جار جارە بە یـادی جـارانەوە لە بن داربی دادەنیشـیت، بابــت هەر خەریکــی تەزبـیحە، نــاوە نــاوەش ســەردانی بارەگـای کۆنە برادەرەکـانی دەکـات. هەمەدانـی بە کۆلانـدا دێ، سـووکە سـلاو دەکـات، بەڵام دیـارە نێوانیـان هێنـدە خـۆش نـیە، دایـک هەر نایەوێـت بیبینێـت، بەڵام لەگەڵ بـرا بەینــی خۆشــە، بــاب تەزبێحێکــی زەردی کارەبــایی بە دەستەوەیە، ئەویـش تەزبێحێکـی دنـک گەورەی کەسـکی دەستکردی بابت، باب دەڵێ:

هەڵەی خۆم بوو، بۆم درووستکرد.

ئێستا خەریکە لە گەڕەکێ ناوی ئەو دوو پیاوە دەگۆڕێ، خەڵکانێک بە تەزبێح کەسک و تەزبێح زەرد ناویان دێنن، بەڵام گوڵێ ماوەیەکە ناوی ناون یەکپێ و یەکچاو لە زاری گوڵێوە کەوتنە سەر زاری منداڵانیش، بەڵام نەزانرا لە زاری کێوە نەزۆکیی پیاوە مۆسکۆییەکە کەوتە زاری کۆڵانەوە!

گوڵێ ناوە ناوە دێتەماڵتان، لەگەڵ بابت زۆر تەبا نیە، قسەکانیان ناچێتە دڵی یەکترەوە. گوڵێ بۆ تۆ ئارامییە، رۆژێ ئەگەر دوور بە دووریش بێت نەیبینێت دەڵێی شتێکت بزرکردووە، رۆژێک گوڵێ گوتی:

نۆرەی منە بچمە چیا، دەڕۆم.

بە سەرسووڕمانەوە گوتت:

چیای چی! ئێستا کەی کاتی بە چیا کەوتنە!

گوتی:

بۆ من ئێستا تافیەتی، چیا گاسمدەکات، لەوانەیە لە ناو ئەوانەی ئەوێ جێم ببێتەوە.

گوتت:

ئەگەر وەک پێشوو بن، زەحمەتە.

گوتی:

تاقیدەکەمەوە.

تفەنگەکەی خۆت کە خستبووتە قەدی نوێنەوە و نووستبوو، داتێ و گوڵێ بزر بوو. بە ڕۆیشتنی گوڵێ پتر تەنیایی دەوری دایت. سەردانی گۆڕستانت کردەوە، بە گۆڕی پیری گەڕیدە و خانزاد کەوتیەوە، حەمەدی قورئانخوێنت دیتەوە، پرساری جەبارت لێکرد، گوتی:

لە جاران گەورەترە، ئێستاش دەتوانێت من و تۆ بە گرتن بدا، نابینی لە تەلەفزیۆن لە دوای کێ دەڕوات!

نەتدیتبوو، دوایی زانیت چەند گەورەیە. شەلەی شامینۆکفرۆشیشت دیت دوو سەد چەکدار بە دوایەوە و وەزیر بۆی دەچەمایەوە. براکەی خانزادیشت ناسیەوە، ڕۆژێک بەرپرسێکی گەورە بە ڕەوەیەک چەکدارەوە هاتنە ناو کۆلیژ، براکەی خانزاد بە دەمانچەی ڕووتەوە بە دواوەی بوو، لە بەرخۆتەوە گوتت:

ڕەنگە هەر بەو دەمانچەیە خانزادت کوشتبێت.

لەو دەمە گوڵنار لێتەوە نزیک بوو، هاتە سەرت بڵێیت، تۆ براکەی خانزاد ناناسیەوە؟ تاهوواهـ وا تۆ ناناسێتەوە، ئەو دەناسێتەوە!

خوێندنت تەواوکرد، دەستبەتاڵ دەسووڕێیتەوە، لە ژاوە ژاوی شار تەنیایی دەتپێچێتەوە، چ تەنیاییەکی ترسناکە، بۆ هەر لا دەچیت تەنیاییە و تەنیایی. جاروبار بۆ هەڵاتن لە

تەنیایی ئێواران پەنا بۆ ئەو یانەیە دەبەیت کە ئاوی کەسک وسۆر، ئاوی یادگاریی لێوە دیارە، گوڵناری لێوە دیارە. لە باخچەکە لە پەنایەک دادەنیشیت، نە تیشکی گڵۆپ دەیگرێتەوە نە تریفەی مانگ. بە چارەگێ عەرەق کە دەڵێی گیراوەی نەفتە گڕێک لە تەنیایی بەردەدەیت، تا پێکی یەکەم ئاوا دەکەیت زەحمەتە، یانە بۆ تۆ پێش پێکی یەکەم بارەگایە، مەیدانی کەرانە، گوێت لێیە جاش و ئەمن و پێشمەرگە پێشمەرگایەتی خۆیان دەگێڕنەوە، گوێت لە زەرە زەرە، دوای پێکی یەکەم چیدی گوێت لە زەرەزەڕ نابێ. پێک بۆ تۆ ئاوەدانییە، یادگارییەکان بە سەر شانی یەکتردا دێنە سەر مێزەکەت، گوڵنار لە درەختەکەی سەرتەوە پرچی شۆڕدەکاتەوە، حەزناکەیت کەس لە ئاوەدانیت بکات.

دەستت رۆژ دوای رۆژ لە کورتی دەدا، چەند دکتۆرت پێکرد، بەلاش بوو. بە دەستێکی گۆجەوە لە جادەی پشتی ماڵی گوڵنار، لە بن درەختێک، کتێب وکۆنە گۆڤاران دەکڕی و دەفرۆشیەوە، دووکانی ناسیاریکت لەوێیە، شەوان دەتخستنە دووکانەکەیەوە. جێگاکە هێندە سەرە رێ نیە، مەیلەو چۆلە، ئەگەر بازاڕیشت کز بێت، بۆ تۆ ئێرە باشە، تۆ توانای (هات پۆلیس هات) و راکە راکت نیە، ئەو ساتانەی پۆلیس دەکەوتنە وێزەی دەستگێڕ و عارەبانەکان، هەموویان بەرەو جادە و درەختی دڵنەوایی دەهاتنەوە، تۆ ناوت لەو درەختە نابوو درەختی دڵنەوایی. لەوێوە

جاروبار گوڵنارت دەدی لە جادەکە دەپەڕییەوە، لەو هەموو جارە تەنها جارێک لایدا، سلاوێکی ساردی کرد، چاوێکی بە کتێبەکاندا گێڕا، بێ ماڵاویی ڕۆیشت. زۆر تووڕە بوویت، چوویتە بارەکەی بەرانبەر، خواردتەوە، هەرگیز هێندەت نەخواردۆتەوە، مەست، دێتە بیرت هاتیە دەرێ، دێتە بیرت ناسیارێک دەستی خستە سەر شانت و گوتی:

پێویستە بچیەوە، شتێک لە ماڵتان ڕوویداوە.

ڕاچڵەکیت، نازانی چۆن گەیشتیەوە کۆڵان، گەڕەک هەمووی ڕژاوەتە کۆڵان، چیە؟ چ بووە؟ کەس وەڵام ناداتەوە، خوشک باوەشی پێتدا کرد و گوتی:

براکەم، گیڤارا کوژرا، برا کوشتی.

یەکەم فیشەکی براکوژیی تازە لە ماڵی ئێوە تەقی و گیڤارا لە خوێن گەوزی.

بە دوای ئەو فیشەکەوە و لە سێیەم ڕۆژی پرسە، جەباری قورئانخوێن بە گەڕەکێک قورئانخوێنی چەکدارەوە، لەگەڵ هێزەکەی شەلەی شامینۆکفرۆش تێکگیران و لەگەڵ هەر ئەڵڵاهو ئەکبەرێک پەنجەرە دێتە خوارێ، خشت بەردەبێتەوە، دووکەڵ و قیژە پێکەوە بەرزدەبنەوە. داربی باڵندەیەکی پێوە نەما، قیامەت هەستا. زۆری نەبرد تەزبێح کەسک و تەزبێح زەردەکان لە کۆڵانێ بەربوونە گیانی یەکتر.

برا خۆی بزر کرد، دیسانەوە دایک رەشی پۆشیەوە، خوشک رەشی پۆشی، پەرژین شێوەی شیرینی گرتەوە، گۆڕی گیڤارا لە نزیک گۆڕی پیری گەڕیدە و خانزادە. زۆر هەولّتدا، بزانیت برا بۆچی گیڤارای کوشت، چۆن دەستی تێچوو، ئێستاش نەگەیشتیە بنجوبنەوانی کوشتنەکە.

گیڤارا کۆستێکە پرزەی لێبڕیوی، دەستت هیچ ناگرێت، لە مالّی دیار نەبی، لە ناو گۆڕستانی، لە گۆڕستانیشەوە بۆ ژوورەکەت. لە سەر پشت رادەکشێی، چاوت لە پنتێک دەبڕی، بێ جوولە، هێزی هەلّگرتنی جگەرەکەشت نیە، بێدەنگ بێدەنگ، دیمەنێکی ترسناکە. خوشک هەمیشە بە دەورتەوەیە، دایک دێ باوەشت پێدا دەکات، باب دێ، بەلاشە، نەچوویتە بێدەنگیەکی واوە بە قسەی ئەوانە بێیتە قسە. چەند مانگێک وا مایتەوە، ئەگەر تۆپەکە نەبا، بە سالّ لەو دەقە دەمایتەوە.

زرمەیەک چیاش زرمەی وای بە خۆیەوە نەدیتووە، لەگەلّ قیژەی دایکت، لە گوللە سووکتر گەیشتیە حەوشە، لایەکی حەوشە رووخاوە، دایکت لە سەر دەرگا لە جێی خۆی بە پێوە وشک بووە، ناجوولێ، غارت دایێ، لە باوەشت کرد، هێناتە ژووری، بێ هەست و خوستە، باب گەیشتێ، دەست لە لەشی دەگێڕێ، نیە خوێن نیە، خوشک جامە ئاوێک دێنێ، تۆ لەبەر خۆتەوە دەلّێیت، بەس دایکم هیچی لێ نەیەت، بێدەنگی دەشکێنم و تێکەلّ ژیان دەمەوە. باب ئاوەکەی پێدا دەکات، دایک چاو هەلّدێنێ، دەلّێ:

کوا ئێوە لە کوێن؟ ماون !

دایک هەستاوە، لەو تۆپەوە براکوژی چووە قۆناخێکی ترسناکەوە، چەتە و ڕێگر بە مۆڵەتی فەرمیەوە بە شار وەربوون، چەکیان بە سەر مندالاندا دابەشکرد، لە کۆلانێ مەشقی چەکیان دەکرد، پەنجەرەی مالانیان دەکردە نیشانە. قاتوقڕی شاری گرتەوە، وا نەبا، تۆ هەلنەدەستایتەوە، بە کەلێنی تفەنگەکانەوە، خۆت دەگەیاندە جادەی مزگەفتی حاجی لەقلەق، لە قوژبنێک بە دیار زەمبیلەیەک هێلکەوە دادەنیشتی، کە دەبووە تەقو تۆق خۆت دەدایە پەنا، خۆت دەگرت و هێلکەبەتالت لێنەدەکرد. پێدەچوو لە حاجی لەقلەقەکەوە ئازایەتی وەربگریت، ئەو بەرگەی شەڕ و تەقوتۆقی گرتووە، هێلانە و شاری بەجێنەهێشتووە، تۆش هێلکە بەجێناهێلی، ئەو هێلکە دەکات تا دنیا دنیایە لە شاردا لە سەری منارەی مزگەفتەوە بە وەجاغروونی بمێنێتەوە، تۆ هێلکە دەفرۆشی تا لە برسان نەمریت و بمێنیتەوە. لەو گرانیەش دلت نەهات خەناوکەی گولنار لە بن خۆلێ دەربێنی و بیفرۆشی. لەو ناو تەقوتۆق و فڕکان فڕکانی بازاڕدا، پتر بیرکردنەوەت لای هێلکەکانتە، لای کڕیاری هێلکەیە، زوو بیانفرۆشیت و بە چەند عانەیەکەوە بگەڕێیتە مالێ. لە خەیالی هێلکە بوویت، کەوتیە بەر سێبەری ژنێک، لە سێبەرەکەی دیارە، عەبا بەسەرە، چاوت کەوتە سەر پێی، نەعلێکی دڕابوو، دەستەکانی کە هێلکەیان هەلدەبژارد، ماندوویێتیان پێوە دیار بوو. سەرت هەلبڕی ناسیتەوە، ئەو

چاوی لِە سەر هێلکەکانە و تۆ نابینی، هەوە، دەمێکە نەتدیتووە، بەڵام جوان دەیناسیەوە. دەستی بە بەرکی کەوا کۆنەکەیدا کرد و پارەی بۆ راگرتی، تۆ کەمێک دامای، گوتت: -

+ لێگەڕێ، با لە سەر من بێت.

- لەبەرچی! دەمناسیت؟

+ ئا، سەردەمێک، ماڵمان لە کۆلانێک بوو...

ژنە هەندێک لێت وردبۆوە، هێلکەکانی داناوە، وەک بڵێی بە سەر خۆدا شکابێتەوە، بێدەنگ خزی، رەنگە تفەکەی بیرکەوتبێتەوە، بەیان رۆیشت و تۆش بە دیار هێلکەوە جگەرەیەکت داگیرساند.

هەر لەو سەروبەندە و بە دیار هێلکەوە، ژنێکی کەڵەگەتی رەشپۆش، چەند هێلکەیەکی هەڵگرت، لەو کاتەی پارەکەی دا، تەواوێ لێت راما، پرسی:

دەڵێی دەتناسم، تۆ هاوار نی؟

تۆش کەمێ لێی وردبوویەوە:

ناوم هاوارە، منیش وێنات دەکەم، بەڵام...

ژنە فرمێسک زایە چاوی:

تۆ ئەوێ ساڵێ بە برینداری نەهاتیە خەستەخانە؟

تۆ لەو ساتە ویست بە دڵ لە ئامێزی بگری، گریانت هات و گوتت:

تۆ دادە نارنجی.

نارنج گوتی:

ئەرێ بە منت نەگوت گوڵنار کێ بوو؟

تۆ خۆت لە پرسیارەکەی لادا و پرسیت:

ئەدی کاک.....

نارنج ئاهێکی هەڵکێشا:

رۆستەم لە رۆژی ئازادکردنی شار گوللەیەک ساردیکردەوە. ئێ، دە بڵێ بە گوڵنارەکەت شاد بوویت؟

گوتت:

گوڵنار چیرۆکێ بوو، هەر دەبێ خۆم بیخوێنمەوە، لێی گەڕێ.

ئەورۆش دەچیتەوە بۆ هێلکە فرۆشتن، بەڵام ئەورۆ رۆژێکە لە تەمەنی تۆ نە بووە نە دەبێتەوە، رۆژێکە هەلاوێردەیی، ئەوەی تۆ دیتت و بیستت، بۆ هەر کەسێکی بگێڕیتەوە باوەڕ ناکات. دنیا روو لە گەرمییە، لە سەر هێلکەکانتەوە چاوت لێیە لە سەر قەڵاتەوە چەند چەتەیەک لەوانەی لە دوورەوە هاتبوون، خەریکی نیشانە دانانەوەن،

ئەوانە پەنجەرەی بالەخانەیەک، تایەی ترۆمبێلێک، عەلاگەی دەستی ژنێک ئەو شتانەیان دەکردە نیشانە. بەڵام ئەو جارە تۆ بە چاوی خۆت دیتت، حاجی لەقلەقی سەر منارەیَ مزگەفت پەلەواژبۆوە. لەو ساتە هووشەیەک یەک بە جادە هات و خەڵکوخوا خۆیان لادا. هووشەیەک هات و کەس نەیزانی چیە، هووشەیەک لە چ هووشان نەدەچوو. بە مردنی حاجی لەقلەق نەتتوانی چیدی بە دیار هێلکەکانتەوە دانیشیت، لە دووکانی ناسیارەکەت دانا و هاتی. مەرگی حاجی لەقلەق تۆی بردەوە منداڵی، تۆی گەیاندەوە گوڵنار، ئەو رۆژەی حاجی لەقلەق لە گەشتی دوورودرێژ دەگەڕایەوە، دایکی گوڵێ زۆر جار دەیگوت:

هەر جلکێکی جوان بە سەر رستەوە بێ، حاجی لەقلەق بۆ منداڵەکانی خۆی دەبات.

گوڵنار بە دەم غارەوە:

حاجی لەقلەق مار هات

ماری زەنگولدار هات...

تۆ نەتدەهێشت تەواوی بکات، دەتگوت:

گوڵنار وا بەغار هات.

گوڵنار دەگەیشتەوە حەوشەی خۆیان، ئەگەر جلکی بە سەر رستەوە با، لێیدەکردەوە. مەرگی حاجی لەقلەق

منداڵیتی گەڕاندەوە، گوڵناری هێنایەوە تەنیشتت. ئەو دەمانەی حاجی لەقلەق لە گەشتی دوور بوو، تۆ و گوڵنار بە پرسیاری (حاجی لەقلەق کەی دێتەوە؟) سەری پیری گەڕیدەتان خواردبوو، ئەویش دەیگوت:

ڕێی حەجێ دوورە، منیش کاتی خۆی کە چوومە حەج هێندەم پێچوو، حەجی ئەو لە هی منیش دوورترە.

لە بیرتە تۆ و گوڵنار دەتانپرسی:

حاجی لەقلەق کە دەچێتە بنی دنیایێ، چۆن ماڵی خۆی دەناسێتەوە؟

پیری گەڕیدە دەیگوت:

هەموو کەس ماڵی خۆی پێدەزانێتەوە، پێویستە ئێوەش ڕێتان بکەوێتە هەر کوێیەک ماڵی خۆتان پێبزاننەوە.

لە بەر خۆتەوە دەڵێیت: ئیدی حاجی لەقلەق ناچێتە حەجێ.

لە بن پەرژینی باخی شار، سەرت هەڵبڕی، گوڵنار بە کراسێکی سوور و تەنوورەیەکی رەشەوە لە پێشتە، پرچی کردۆتەوە، دەڵێی بە مانگەوە دابەزیوە، لێوەکانی هێند سوورهەڵگەڕابوون کرێمستیان لێدەچۆڕا، چاکوچۆنیتان کرد، وەک جاران نیە، گەڕموگوڕیەکی پێوە دیارە، بەڵام لە سیمایەوە دیارە وەک پێشوو بێ یادەوەرییە، گوڵنار گوتی:

ئێستا خەریکی چی؟

ویستت بڵێی هێلکە دەفرۆشم، گێڕاتەوە، گوتت:

هیچ، تێدەسووڕێم.

ویستت بڵێی، نەتزانیوە گیڤارا بە دەستی برا کوژرا، نەتگوت.

ئەوەت گوت:

حاجی لەقلەقەکە کوژرا، ئیدی جلکی کەس لە سەر رست نارفێنێ.

گوڵنار چ گوێی بەو قسەیە نەدا، رۆیشت. چەند حەزتدەکرد پێبکەنێ، پێنەکەنی و رۆیشت. تۆ لە جێی خۆت پشتت بە پەرژینەکە دا. ماوەیێ بوو، ئەگەر جاروبار دەنا هێندە بیرت لێی نەدەکردەوە، بەڵام ئەو دیتن و چاکوچۆنیە، تازەی کردەوە. کریمستییەکە دەڵێی ئێستایە، ماچی شیرینی شیعرەکەت بیرکەوتەوە، خۆزگەت خواست بە منداڵی لە بن داربی ماچێکی لێوی گوڵنارت بکردایە، بۆوەی هەر بە زار نا، لە دڵەوە و لەگەڵ هێمن دێرە شیعرەکەت بگوتایەتەوە:

**بە منداڵی لە لێوی ئاڵی تۆم ئەستاندووە ماچێ**

**بە پیریش لە زەتی ئەو ماچە شیرینەم لە بیرناچێ**

پشتت بە پەرژینەکە داوە و ناجوولێیت، ئەگەر دیدار نەبا هەر لە جێی خۆت دەمایتەوە، بە دەنگی گەورە:

خەڵکینە، حیزب حاجی لەقلەقی کوشت.

یەکەم جارە دیدار رستەی خۆی بگۆڕێ، لەوەتەی شێت بووە، تەنها رستەی:

غاردە، تۆپ هات.

ی دەگوتەوە، بەڵام حاجی لەقلەق پێی گۆڕی، لە پێش چاوت چەکدارێک پیلی دیداری گرت و زللەیەکی توندی خێواندێ و گوتی:

ئەمە چی ئەڵێی تۆ؟

دیدار بە دەنگی بڵندتر گوتیەوە، چەکدارەکە تفەنگی لێڕاکێشا، تۆ غارت دایێ و گوتت:

لۆ وا لەو شێتە دەکەیت؟!

چەکدارەکە بەتووڕەیی:

وای لێ ئەکەم و زیاتریش، چی تۆیە؟

تۆ گوتت:

هاوڕێمە.

چەکدارەکە بە پێکەنینێکی تاڵەوە:

وا دیارە تۆش شێتی...

دەستت جوولاند تا پشتە دەستێکی لە دوڕ دەوی گیربکەیت، بیرتکردەوە کە دەستێک شەڕی دوو دەست و تفەنگی بۆ ناکرێت، بۆیە نەرمیت کێشا. دیدار هەلات، تۆش بە لۆژلۆژ ڕێی ماڵێت گرتەبەر.

ئەو ڕۆژە ڕۆژێکە هەلاوێردە، هەر لەو ڕۆژە هەرێت بە خۆت دا ئەگەر وەک دیدار بە جادە نەکەویت، سەرهاتی خۆت وردوباریک بنووسیتەوە و ناویشی لینێی کریمستی. لە سەری کۆلانی پێشانی ماڵی گوڵنار، دایکی گوڵێ ڕایگرتی، گوتی:

نامەیەکی گوڵێت بۆ هاتووە.

نامەکە لە شێوەی چوکلێتێکی گەورەیە، هێند توند پێچرابوو، بە ددانیش بۆت نەکرایەوە. پەلەت کرد زوو بگەیتە ماڵێ و بیخوێنیتەوە، لە سەر دەرگای حەوشە دایکت دەڵێ:

مێوانمان هەیە، دەزانی کێ؟ گوڵنار.

سەرسامانە دەڵێی:

گوڵنار!

دایکت دەڵێ:

ئا، گوڵناری خۆمان، ئەوەی هاوڕێی منداڵیت.

لە شوێنی خۆت چەقیت، وشکبوویتەوە، لە بەر خۆتەوە دەڵێیت:

باشە من تازە گوڵنارم لە بازاڕ دیت، چی نەگوت، چۆنە هاتۆتە ئێرە! تێناگەم، چی روودەدات!

دایکت هەستیکرد پەشۆکاویت، گوتی:

دەی جارێ برۆ هۆدەکەی خۆت، خۆت بگۆڕە.

بەڵام تۆ چوویتە لای مێوان، هۆدەکە کەمێک تاریکە، ئای، کوا گوڵنار!

ژنێکی رەشپۆشی لاواز، سێ منداڵی بە دەورەوەیە، هەستایەوە، چاکوچۆنیتان کرد، بەپەشۆکاوی لە بەرانبەری دانیشتی، لەبەر خۆتەوە دەڵێیت:

بە راست ئەوە گوڵنارە! ئەدی ئەویدی کێ بوو؟

دایک دەڵێ:

کورم دەڵێی نایناسیتەوە!

ورتەت لێوە نایە، تەماشای دەکەیت، ژنە چاوی کەمێک بە قووڵدا چووە، بەڵام زۆر لە چاوی گوڵنار دەچن، هەون چاوی ئەون، لە بن چاویلکەشەوە بێ، چاوی وی دەناسیەوە، ئەدی بەژنی!

کچە پارچەڵەکەی کە پشتی بە پەنجەرەکە دابوو، هەر زۆر لە گوڵناری بن دارخورماکە دەچوو، ژنە دەڵێ:

هەقی خۆیەتی نەمناسیێتەوە، ئاخر...

قسەکەی تەواونەکرد. تۆ حەپەساوی، قسەت بۆ نایە، بیردەکەیتەوە، هێندەی نەماوە بقیژێنی، چۆن دەبێ ئەو هەموو ساڵە کچێکی دی خۆی کردبێتە گوڵنار! چ پەرجوویێکە!

ژنە پێدەکەنێ، رێک پێکەنینی گوڵنارە، ئای دەمێکە گوێت لێی نەبووە.

لەو ساتە بە دیار چاو و لە ناو پێکەنینی لە گوڵنارەوە هاتوو، رەنگبێ بۆرژا بیت، یان کەوتبیە زیندە خەوەوە، خەناوکەی بن خۆڵت هێنا، وا بە دەستتەوەیە و لێی دەڕوانی، ژنە لە پێکەنین وەستا و بە شەرمەوە دەڵێ:

دارخورما نەما، داربی هەر وەک خۆی ماوەتەوە، ئەرێ کرێمستیت بیردێتەوە؟



## کتێبە چاپکراوەکانی ناوەندی ڕۆشنبیریی مەم و زین

١- لەدایکبوونی دووەم/ پێشرەو عەبدوڵلا/ ڕۆمان.

٢- چەشە و چەشنە ئەدەبییەکان/ د.حەمە مەنتک/ لێکۆڵینەوەی ئەدەبی.

٣- دژە مەسیح/ فریدریک نیتچە/ و.موئەییەد مستەفا/ فەلسەفە.

٤- لەبیرکردن .com/ ئەحلام موستەغانمی/ و.کۆسرەت ئەحمەد بێکەس.

٥- بیری ئاشووزەردەشت و ئایینی یارانی/ میهرداد قەدردان/ و.غەریب پشدەری.

٦- کورتەیەک لە ژیانی من/ ستیڤن هۆوکینگ/ و.سەنار سەمەد/ یاداشت.

٧- کتێبی مەستوورەی ئەردەلان/ بوخاری وشیار/ لێکۆڵینەوەی ئەدەبی.

٨- گێرانەوە لە داستان و شانۆدا/ هاوکار جەمیل/ لێکۆڵینەوەی ئەدەبی.

٩- ئیشراقی دار هەڵووژە/ شکوفە ئازەر/ و.شۆرش غەفووری/ ڕۆمان.

١٠- شار/ سمکۆ محەمەد/ فکر و فەلسەفە.

١١- ئیستاتیکا/ سمکۆ محەمەد/ فکر و فەلسەفە.

١٢- تراویلکە/ بوخاری وشیار/ شیعر.

١٣- زەیتوونستان بە پێڵاوی پیرۆزەوە/ کەریم کاکە/ ڕۆمان.

١٤- سژین/ ئەنوەر عەباسی (هەرەس)/ ڕۆمان.

١٥- ڤانکۆخ/ حەمە هاشم/ هونەری.

١٦- سەلارخان/ مەحموود ئەجمەدین/ ڕۆمان.

١٧- - قصائد نسیتها الحرب في جیب الشاعر/ جان دوست/ شعر.

١٨- دوو هەنگاو تا زەردەخەنە/ و. غەریب پشدەری/ کۆمەڵە چیرۆک.

١٩- سەربوردەی خەبات/ جان دوست/ و.زانیار عەلی/ ڕۆمان.

٢٠- ئەستێرەی قەڵاتی/ کەریم کاکە/ ڕۆمان.

٢١- یادنامە/ سەرکەوت ڕەسوڵ/ شیعر.

٢٢- مم و زین، الدر الثمین فی شرح مم و زین/ جان دوست/ شرح.

٢٣- حەسەن و مریەم – داستانی بەستی هەنگوین/ کەریم کاکە/ ڕۆمان.

# Kirêmsitî

## Kerîm Kake

کرێمستی لە نێوان پەنجەکان، پەنجەی وردیلەی خرپن دەتوێتەوە. مژێك لەو مژێك لەم، کرێمستی دەتوێتەوە و لالێویان دەنەخشێنێ. بە یەکتر دەڵێن: ئەها وێنەیەکی جوان بە لێوتەوە!

لە بن داربییەکە، داری کرێمستی لە کەلێنی پەنجەکانەوە چۆڕاوگەیەکی سووری بە سەر گەردندا بەستووە. بە یەکتر دەڵێن: نابینی، گەردنیشت بووەتە وێنە!

چۆڕاوگەیەك دنیا هەزار سەرمەقوڵاتی دا، ئەو هەر بە لالێو و سەر گەردنەوەیە. گەڕەك گۆڕانی دنیای بە سەردا هات، بەڵام چۆلەکەکانی داربی هەر ئەو چۆلەکانەن کە بە سەر دوو منداڵی کرێمستی لە دەست دەیانجریواند. کێ هەیە دەنگی چۆلەکەی منداڵی نەناسێتەوە!






ناوەندی رۆشنبیری مەم و زین

Mem u zin cultural center

memuzin20@gmail

Mem u zin